نووسینی: س. م. ماتیسن

# پــەڕ

وەرگێڕانی: غەریب پشدەری

هەولێر - ٢٠٠٩

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **پــەڕ (ڕۆمان)**
- نووسینی: س. م. ماتیسن
- نووسینی: غەریب پشدەری
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسین
- پیتچنین: شاناز پیرۆتی نیا
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (٥١٤)
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٣٦١)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

**بۆ:**

ماویسی بەوەفا و بە ئەمەکی خۆم خاتوو "شەرا" دیارییە

**ـ غەریب ـ**

**"... ژیان قوماره، رووداو و بەسەرهاتە،**
**مرۆڤ یا دەیباتەوە یا دەیدۆڕێنێ، ژیان**
**جەنگێکە و کۆتایی نایە. هەر کاتێ دەنگی**
**یەکێك وردە وردە کز و بێدەنگ و خامۆش بوو،**
**دەنگێکی تازە و نورتو نوێتر و بەگوڕو تینتر هەودا و سەرەداوەکانی**
**داستانەکە هەڵدەکاتەوە و درێژەی پێدەدا.."**

کاتێ کە دادگا "رۆجەر دالتۆنی" بە تاوانی دزی، بە سێ ساڵ زیندانکردن تاوانبار کرد، سەیرترین شتێك کە سەرنجی تەماشاچیانی ناو دادگای بە لای خۆیدا راکێشا ئەوە بوو کە تاوانبارکراو کەم و زۆر گوێی نەدایە فەرمانی تاوانبار کردنەکە و مێشیشی لێ میوان نەبوو و بە هەنگاوی توند و پتەو و سەرێکی بڵند و جووتە لێوی بە زەردەخەنە و دەمی بە پێکەنینەوە، کە هەمووی نیشانەی رازیبوون و سەرکەوتن بوو، هۆڵی دادگای بە جێهێشت. ژنان دەیانگوت "ئای چەند لەبارە" و تەنانەت دەستەی دادوەرانیش هەستی ئەوەیان دەکرد، کە ئەوە دەگەڵ هەموو تاوانبارکراوێکی دیکەدا جیاوازە.

هەموو هەوڵ و کۆشش و تەقەللای دادوەرەکانیش بۆ وەی بوو بزانن ئەو گوژمە پارەیەی کە هەزار و دووسەد لیرە بوو، بۆ دزیویەتی و چ ئیشێکی پێ بووە، بەڵام هەر نەگەیشتنە ئەنجام و پرسیارەکانیان هەر وا بێ وەڵام مانەوە. هەر لە بەر ئەو بێدەنگییە پڕ نهێنی و ئەو دەمو لێوە پڕ زەردەخەنە و پێکەنیناویەشی بوو کە بە گێلیان دەزانی و هەر بۆیەش بوو پێداچوونەوە و داوای چاوپێداخشاندنەوەی دادگاییەکەیان رەت کردەوە.



چوار ساڵ دوای ئەم بەسەرهاتە ئەو جا پەیم بە ڕاستی ئەو کێشە و ئاریشە و ئەو مەسەلانە برد. ئاشنایەتییە من و رۆجەر دالتۆنی لە سەردەمی منداڵییە و چوونە قوتابخانەمانەوە بوو، بەڵام دوایە بە هۆی جیاوازی بیرو باوەڕ و بۆچوونی هەر یەکێکمان لێك ترازا، من بەرەو لای رابواردن و خۆشگوزەرانی و گەڕان و سەما و سوڕدان و تۆپێنێ زستانان، و تێنسی هاوینان کە زۆری دەگەڵ تێنسی ئێستادا فەرق بوو، یان تێنسێکی ئاوێتەی چا، و سەندویچ و تێکەڵ بە کیژ و کاڵانم بە سەر دەبرد و رامدەبوارد. بەڵام رۆجەر لە هەموو ئەو شتانە بێزار و دوورەپەرێز بوو. ئیدی لەو دەمیەوە من ئەوم نەدیتەوە.

رۆجەر بە منداڵی دەنگی زۆر خۆش بوو و دەگەڵ تیپی کلیسایدا ئاهەنگی گوتنێی دەگێڕا، بەڵام دوای هەرزەکاریەی ئەو دەنگە خۆش و ناسکەی گۆڕا، دەنا ناوبانگێکی پەیدا دەکرد هەر مەپرسە. تابڵێی حەزی لە مۆسیقا بوو و هەر چیت ویستبایە ئەو هەمووی بە پیانۆ و ڤیۆلۆن (کەمانچە) و ئۆرگ لێدەدا. بەڵێ ئەو هەر لەو دەمیەوە شێت و شەیدا و شبری مۆسیقا بوو.

باری ئابووری و دەرامەتی بنەماڵەکەیان مامناوەندی بوو. دوو برای لە خۆی گەورەتری هەبوو کە کاروباری بازرگانی باوکەکەیان رادەپەڕاند.

بەڵام رۆجەر چواردەساڵ پێش جەنگ لە کۆمپانیایەکی بیمە(دابینکردن) لە شاری "بریستۆڵ" دەست بەکار بوو و دوایەش هاتە لەندن. سی و دوو ساڵ بوو کە چووە فەرەنسا و هاوبەشی جەنگی کرد و لە چل و یەك ساڵیشدا بوو کە گیرا و زیندانی کرا. دەیانگوت دەسەردەمی شەڕێدا هەمیشە کارەکانی بەو پەڕی لە خۆبوردەیی و شانازی و دڵسۆزی و سەربەرزیەوە راپەڕاندووە و بە ئەنجامی گەیاندوون و پلە بە پلە سەرکەوتووە و تا گەیوەتە پلەی سەرهەنگی دەجەنگدا. ئەو دەمەی زیندانێ من هەرگیز نەچوومە سەردانێی و هیچیشم بۆ نەنووسی و هەر سەرسامی ئەوەش بووم کە ئەو کارەی چۆن کردووە. بیسستبووشم کە بنەماڵەکەیان ئەویان بە مردوو داناوە. برایەکانیشی هەرگیز ناویشیان نەدەهێنا و ئاواڵ و برادەرەکانیشیان نەدەدواندن.

من دەگەڵ ئەوەشدا کە دڵنیا بووم بەڵگەیەکی پتەو بۆ ئەنجامدانی ئاوا تاوانێك هەر هەیە کەچی هەواڵێکیم هەر نەپرسی و پێشم وانەبوو کە دەو ڕۆژە ساردو سۆڵ و بەستەڵەك و بارانیەیدا لە دا گایدا منی دیبێ، ئە ڕۆژەی کە دادوەر بەو تەواوی هەموو دڵڕەقی و بێ بە زەییەکیەوە، بێ هیچ سڵەمینێکەوە هەرچی سووکایەتییەکی کە لای خوا ناخۆشە پێیکرد و هیچی نەگێڕایەوە. بە کورتییەکەی سێ ساڵی زیندانییەکەی تێپەڕی و تەواو بوو و دوای هاتنە دەرێشی دەکەوێتە سۆراغی من و منی پێ هەوت و سەرسام کرد.

تا ڕۆژێکیان لە دەرگا درا و بانگیان کردم کە:

"کابرایەك کە ناوەکەی خۆی ناڵێ و هاتووە دەیهەوێ بتانبینێ. ئەوەندەی دەڵێ کە ئێوە بۆ خۆتان دەیناسن. بەڵام من هەرگیز ئەوم لێرە نەدیوە."

هەروا خەریکی تێك وەردانێ ئاورێ ناو سۆبەکەی بوون، دوای ماوەیەك تێڕامان و بیرکردنەوە گوتم "دەی چاکە، بیهێنن با بێ."

دوای دەقیقێکی ڕۆجەر دالْتۆن لە نێو دەرکێ و بەزەرەدەخەنەیەکەوە سەیری دەکردم.

هەر بە هەمان بەژن و باڵا بەرز و لە بارەکەی جارانیەوە، تەنانەت کەمێ باریکتر.

مووی لاجانگانی ماش و برنج ببوون، و ڕەنگ و ڕووی ڕەش داگەڕابوو و تاو بردبووی. بە چاوە زیتەڵەکانیڕا دیار بوو شتێکی بوێ. دوایەش بە ڕوویەکی گەشەوە گوتی:

"سڵاو ویویان. ڕێ هەیە بێمە ژوورێ؟"

من کە لە حەپەساویان دەمم بەش ببۆوە و هەوت و سەرسامانە زەق زەقم دەڕوای هەر هێندەم پێکرا بڵێم:

"ئەوە تۆی؟ سەیرە..."

گوتی:

"ئەگەر حەزناکەی، نایەمە ژوورێ."

بەرەو لایەوە چووم و گوتم:



"خۆت گران مەکە، وەرە دانیشەو هەمووشتێکم بۆ بگێڕەوە."

لە کاتی تەوقە کردنێ وای دەست گوشیم هاوارم لێهەستا. بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

"داوای لێبوردن دەکەم هاوڕێ، دوای سێ ساڵان مرۆڤ هەموو شتێکی لە بیردەچێتەوە."

هەر دەو دەمەشدا کە ڕۆجەر دەقوڵاییە خەونێکیدا ڕۆچوو بوو. چاوەکانی تێبڕیم و گوتی:

"من گومانم لە پێشوازییە تۆ نەبوو و هەر بۆ شتێکیش هاتوومە لای تۆ. چونکە تۆ تەنیا کەسێکی کە من بتوانم ڕووی لێنێم، هەر لە بەر ئەوەش کە پێموایە تۆ دەتوانی مەسەلەکان لە کلاوڕۆژنەی ڕاستییەکانەوە وەك خۆیان ببینی."

" هیوادارم وابێ."

"دیارە تۆ هەقتە و دەشتوانی بڵێی نەنگ و شوورەییە سێ ساڵەی زیندانێ بەسە بۆ ئەوەی کە هەر دۆست و ئاشناو ڕۆشنایەك ڕووت لێ وەرگێڕێ.

چوونە زیندانی من سەرەنجامی کارێکی سروشتی بوو کە لێی ڕوودام، بەڵام ویویان ئەوەی چاك بزانە کەمن ویژدانم تێوە نەگلاوە و پیس نەبووە و هەر وەك خۆی پاکە.

لێرەدا ڕۆجەر ڕاستبۆوە و دەستەکانی دەحەوا بڕین و بەرەو ئاسمان گوتی:

"بەو خودایەی کە لە بەرامبەریدا وەستاوم سوێند دەخۆم کە ویژدانی من لە هەرچ تاوان و ناحەزی و ناشیرینیەکە بە دوورە."

من قسەکەیم بڕی و گوتم:

" ڕۆجەر بەسە."

بەڵام ئەو هەروا بەردەوام بوو:

"بەلای یاسا و چاوی ئەوانەوەی وادەزانن کە من هەزار و دووسەد لیرەم دزیوە و بۆیە چوومەتە زیندانێ من کەسێکی تاوانبار و دزێکی بەرهەڵدا و خوێڕیم بەڵام..."

لێرەدا زەردەیەکی هاتێ و ئاوای درێژە دایە:

"بەڵام تۆ هەمموو مەسەلەکان تێدەگەی. یەکەم من هاتووم تکایەکت لێبکەم" تا دوو تکا کە هەردووکیان بۆمن تا بڵێی زۆر گرنگن دەنا نەدەهاتم و تۆشم نارەحەت نەدەکرد."

"بڵێ."

"من ئەم داستانەم نووسیوە و ئەگەر تۆ تەنیا ناوەکانی ناو داستانەکە بگۆڕی دەتوانی قازانجێکی باشی لێبکەی. تۆ نووسەری. گەرچی بەینی خۆشمان بێ منێك کە بۆ داستانێکی راستەقینە هێندەم گیان دەرچووبێ و ئەوەندەم زەحمەت پێوە دیبێ، ئەدی باشە ئەوە تۆ چۆن دەتوانی ئەو هەمموو ئەفسانانە وەسەریەك کەیەوەو نانێکیان لێوە وەدەست بێنی. بەڕاستی کارێکی سەخت و دژوارە."

هەستم دەکرد زۆر نارەحەت و تووڕەیە و بۆیەشە هێندە ئەولاو لایەتی. گوتم:

"یەکجار زۆرم پێخۆشە کە ئەو داستانەی وەخوێنم."

"راستیەکەشی من دەمەوێ ئەم داستانەت پێ بفرۆشم، من سەدلیرەم پێویستە."

من بەو قسەیە تا بڵێی یەکجار زۆر دڵگران بووم و زۆرم پێ ناخۆش بوو و پرسیم:

"هەمموو تکایەکەشت ئەوە بوو؟"

"ئەوە یەکێکیان بوو. ئەوەی دیش یەکجار زۆر دژوارە و تا داستانەکە نەخوێنیتەوە ناتوانم پێت بڵێم."

" داستانەکە کوا؟

"لە دەرەوە لە سەرمێزی ناو دالانەکەیە."

دوایەش دەستەکانی پێکدا هێنان و هەناسێکی هەڵکێشا، وەك ئەوەی بارێکی گرانی سەرشانی سووك بووبێت، گوتی:

"برالە، دەزانی کە من هەفتەی بە پێنج شلینگان ژیاوم تا توانیومە ئەوە بنووسم. من بڕیارمدا بوو کە دەبێ ئەو کارەی هەر بکەم. بۆیە هەر بە هاتنە ڕێی زیندانێم چوومە گوندێکی راوەماسییەی نزیك"دۆن". شوێنێکی دوور و لاچەپەکە. کەس نەیدەناسیم. زستانێکی تووش بوو. با و باران و شەپۆلەکانی دەریا تاکە هاودەم



و هاوڕازی من بوون و منیش نووسین و نووسین و نووسین. باوەڕت بێ بەخوێنی دڵ نووسراوەو دڵنیاش بە ئەو سەد لیرەیەی بۆتۆ هەر تێدەبێتەوە."

"دیارە هەرواشە... ماڵەکەت لە کوێیە...؟"

"ژوورێکم لە ماری لبون گرتووە. جێیەکی یەکجار ناخۆشە. دەستە دەستەی ژژە سۆزانییە بەرهەڵدایەکان لەو ناوە هاتوچۆیانە. کاتێ کە دەیانبینم بەو هەمموو بۆن و بەرامە کەسکون و ئەو چاو و برۆ و دەمولیوانەیانەوە چ بڵێم؟ دووبارە دێمەوە سەر ئەوەی کە کارێکی چاکم کردووە."

"کەی پارەکەت دەوێ؟"

"ئێستا نا. هێندێکم کار هەن دەبێ بیانکەم و سەرو بەریان کەم و رێکیان خەم.

ئاخر دەمزانی کە دەبێ بگێریم" و هێندێکی دیشم پارە پێ بوو ـــ جگە لەهەزار و دووسەدلیرەکەـ کە بۆ رۆژی بەر هەڵدا بوونێم پاشەکەوت کردبوو و وەلام نابوو تا ئێستای پێ ژیاوم و بە پشتیوانیە تۆش ئەوە دەچم ئیش وکارەکانم رێك دەخەم."

"ئاواڵە ئازیزەکەی خۆم هەر چییەکت بوێ وایدانێ بووە."

"دەمزانی، بە هەڵە نە چووم. باشە ئێستا لەوە زیاتر کاتت ناگرم. کاغەزەکانم لە سەر مێزەی دەرێ داناون."

ئەو جا چووە دەرێ و بەستەیەکی پێچراوەی کە دە کاغەزێکی قاوەییەوە پێچرابوو، هێنای و دای بە من و گوتی."

"تا من نەڕۆم مەیکەوە. من بۆ گوێ لە فەرمانی دادگایی گرتنەکەت، ئێوارەی یەکشەممە سەرێکت لێ دەدەمەوە. ئەورۆ پێنجشەممەیە. پێموایە کاتەکە بەسە."

"من ئەمشەو دەیخوێنمەوە. تۆش بەیانی وەرەوە."

"نا هەمان یەکشەممە. یەك دنیات لێ مەمنوونم."

"رۆجەر جارێ مەڕۆ. تاوێك دانیشە پەرداغێکی دیش هەڵدە."

پێم خۆش نەبوو هەر وا زوو و وا بە پەلە بڕوا بەڵام پێدەچوو هەمموو ئەو بە خۆراپەرموون و لە خۆ رادیتنەی کە بە خۆی هەبوو لەیەکەمجاری هاتنە ژوورەوێیدا

ئێستا هیچی پێ نەمابێ. سەر و چاوی شەکەت و ماندوو و گرژ دیار بوو و بە پەلە بۆی دەرچوو.

دوای رۆیشتنی وی بێجووڵە دانیشتم و ئەوجا بە کونجەکاویەکەوە بەستە کاغەزەکەم کردەوە. گومان لەوە دانەبوو کە ئەو تاوانێکی کردبوو. بەڵام بابزانم چی نووسیوە.

بە پەلە پەڕەکانم ئەودیوەو دیوکردن و هەڵمدانەوە و هێندێکم لێرە و لەوێ خوێندنەوە و هەر چەندەش دە دەریای سەرسامیەدا نقوم ببووم دە دڵی خۆمدا گوتم.

"ئەمە ئەفسانەیە، چۆن دەبێ ئەوە ڕاست بێ." ئەویش لە ژیانی داڵتۆندا کە بۆ خۆم دەمزانی دەگەڵ ژن و فەرزەندە تاقانەکەیدا کە گەورە کیژێك بوو و من نەمدیتبوو و لەیەکێك لەگەڕەکە بێ دەنگ و ڕەنگ و بێ گیانەکاندا دەژیا.

دەمزانی کە هەموو رۆژێ بۆ چوونە دایەرەکەی خۆی دەچووە شاری و دوای ئەنجامدانی کارەکانی کە ساڵانێکی دوور و درێژ بوو خووی پێوە گرتبوو و لە رێستۆرانێکی هەرزانیش نیمڕۆژەکەی دەخوارد و شەوێش دەهاتەوە ماڵێ تا زستانان لە لایەکی بەرسۆبەیەوە دانیشێ و سیغاران بکێشێ و هاوینانیش گوڵەکانی ئاو بدات. و ئێستاش ئەگەر ئەوشتانە راست بن و زێدەڕۆیی تێدا نەکردبن ئەوە دیارە هەست و نەست و عیشق و ئەوینێکی تا بڵێی مەزنی دە ژیانیدا بووە، و لە هەموو کەسێکیش، تەنیا لە منێکی دەست رۆیشتووش بەختیار و خۆشگوزەرانتر بووە. هەرچەندە زیاترم دەخوێندەوە زیاترم خۆزگە بەوە دەخواست کە من لە جیاتی ئەو بامایە. من شانس و ئازایەتی و بوێری ویم نەبوو. لەبەر ئەوە دەمزانی ئەگەر ئەوین و دڵداری و خۆشەویستییەکیش دەژیانی منیدا سەر هەڵدابایە هەرگیز ئامادە نە بووم لە پێناویدا ئەو خۆبەخت کردن و قوربانییەی رۆجەری بۆ بدەم کە بە بێ هیچ سڵ کردنەوە و دوودڵیەك دابووی.

بە سەعات دەمخوێندەوە و تا زیاتریش پێوە دەچووم وای بۆ دەچووم کە نیوەی تەواوی ئەم نووسینە بریتیە لە بۆ چوون و ئەندێشەکانی و لە ڕاستی و ڕاستیەوە دوورن. شەو بە کۆتاهات. هەوا رووناك بوو. ماوەیەك بوو ئاوری سۆبەکە دامردبۆوە



ژوورەکە سارد بۆوە کە من لە داستانەکە بوومەوە. ماندوویەتی و لەش گرانی هەموو گیان و لەشیان داگرتبووم وایان لێکردم بچمە ناو جێی و تانیوەڕۆیە بنووم و هەڵنەستم و دوایەش کە هەستام ئاوێکی بە خۆم داکەم و بچم نانی نیوەڕۆیە بخۆم.

بیری داستانەکەم بە درێژایی ئەو رۆژە هەر دەمێشکدا بوو و لێم جودا نەدەبۆوە. دوایەش چوومەوە ماڵێ. دەمێشکی خۆمدا گوتم خۆزگە رۆجەر بەر لە رۆژی یەك شەممە سەری لێ دەدامەوە بەڵام وەبیرم هاتەوە کە ئەو حەزی دەکرد نەك هەر تەنها داستانەکە بخوێنمەوە و بەس بەڵکە دەیهەویست تێیدا رۆچم و قووڵ ببمەوە و بەوردی تێبڕاچم و بەراشکاویەوە بیر و رای خۆمی دەربارە دەربڕم.

## ٢

رۆجەر ئاوای نووسیبوو:

"شەوێکی سارد و تووش بوو. بای دەهات و باران بە لووزەو دەباری و من زۆر بە دژواریەوە بەو کۆڵانە تەنگەبەرانەی نێوان خانووە بەرزەکاندا پەلەکوتەم بوو و دەڕۆیشتم. گلۆپە کزە بێ شەوقەکان دەو کۆڵانە غەم ئاوێزانەدا هەروا تروسکە تروسکیان بوو و زەوییە پڕ قوڕ و لیتە و چڵپاوەکەیان تاریك وروون دەکردەوە. بۆ باسێکی سادەو و ساکار دەشەوێکی ئاوامدا ملی رێیە بۆ کارێکی ئیداری گرتبوو. یەکێك کە بە گوژمە پارەیەکی زۆر ژیانی خۆی بیمە" تەئمین" کردبوو و مردبوو و رووداوەکەی ئەو جێیەش جێی گومان لێکردنێ بوو، بۆیە منیان بۆ لێکوڵینەوە و بەدواداچوونی راستیەکاندا ناردبوو. لە لایەن پۆلیسیشەوە لێکۆڵینەوە هەر کرابوو بەڵام دکتۆر واش رێی ناشتنیێی هەر نەدەدا. هەر دەیگوت گومان دەو مردنەیدایە و ئێستاش من لە لایەنی کۆمپانیای بیمەوە، فەرمانبەر بووم بچم ئەو کێشەیە تا وتوێ کەم. لە جوانیە هەندێك لەو خانووانە بەتایبەتی دروستکردنەکانیانەوە دیار بوو کە سەردەمانێك ئەو گەڕەکە، گەڕەکی پیاو ماقوڵان و ئاوەدانیە شاری بووە.

خانووی ژمارە نۆزدە کە دەکەوتە نێوان قاوەخانەیەکی یەکجار پیس و پەلتۆخ و دوکانێکی ماسی سوور کردنەوێوە ئەوە شوێن مەبەستی چوونەکەی من بوو. دە و نێوەیدا ئەو خانووە تابلێی زۆرجوان بوو، پەنجەرە و دارو دیوارە بەرزەکانی بەشکۆ و وقارێکی تەواوەوە راوەستابوو.

کە گەیمە وێ سەعات لەشەشی هەڵبوارد بوو. لە پلیکانەکان وەسەرکەوتم و خانووی ژمارە نۆزدەم دیتەوە. پلیکانەسازییەکانی بێ ئەندازە ناسك و جوان بوون ومن وام هاتەوە بیر کە داخوا چەندین خانم و شۆخ و شەنگ و جوان و لەبارەکانی سەدەی هەژدەهەم بەسەر ئەو پلیکانانەدا هاتن و چوون و سەرە و خواریان کردووە.

لەسەر خۆ پەنجەم لە دەرکەی دا. نازانم بۆ وام دە هاتە بەچاو کە وەك تارماییەکی خەیاڵاوی دە داڵانەکە دا بێت و بچێ وابوو. هەر دەوکات و شوێنەیدام دەنگی"وی" گوێ لێبوو. ئەگەر من دەنگی ئاوازی ویم دەو رۆژە سارد و باراناویەی ئەوسەعات شەش و دە دەقیقەی ئەو دوای نیوەڕۆیەیدا نەبیستبایە هەرگیز تووشی ئەو تاوانەی نەدەبووم و نەدەکەوتمە زیندانێوە وسەرەنجام نەدەبوومە کەسێکی دەرکراو و نەفرەت لێکراوی ناو کۆمەڵگا و یان ئەگەریش خانووەکان هێندە شاعیرانە و خەیاڵ ورووژێن نەبانایە و ئەو هەموو هەست و نەست و بۆچوونانەیا لێوە نەزابانایەوە دەنگی ویش هێندە ئاوا گەرموگوڕانە نەدەگەیشتە پەردەی دڵ و گوێی منیش.

هەر بە لەدەرکە دانێ یەکسەر دەنگەکە بڕا و پاش تۆزێك دەرگای خانووەکە کرایەوە و کچێکی جحێڵۆکەم بەرامبەر بۆوە. بە بێ چەند و چوون پرسیم:

"ئەوە ئێوە بوون گۆرانیتان دەگوت؟"

"بەڵێ کاکە."

"ناوتان چیە؟"

"ماویس کۆترل."

"کچێ بەرنارد کۆترل."

سەرنجێکی تابلێی منداڵانەی تێوە بڕیم و گوتی:



"نا.. کچی نا!"

"خوشکی؟"

قژ زەردێکی زێڕینی بوو. بەڵام من نەمتوانی ئەو شەوە رەنگی چاوەکانی ببینم و یا بزانم دەمولێوەکانی چەند شیرین و بە تامن. تەنیا دنیایەك ناسکی و جوانی تێکەڵاو بە غەم و پەژارەم دیتن تێك ئاڵاو و ئاوێتە ببوون. رەنگی بەڕووانەوە نەمابوو. وای سەیر دەکردم کە گوایە نامبینێ و چاوی تێمەوە نییە. هێندە ناسك بوو، وەك منداڵێکی، منداڵێکی تابلێی جوان و تەنیا.

"نەخێر... من ژنی بووم!"

## ٣

رستەکەی دوایەی بە جۆرێکی والەسەرخۆ و بە کاوە خۆوە گوت کە دیار بوو لە نزیکبوونی بە مردووەکە هیچی وا رازی نەبێ و لێی خۆش نەیەت. هێندەش ناسك و بچکۆلانە بوو کە پێموابوو لە هەژدەساڵان گەورەتر نیە. ئەو دەمی کە پێمگوت بۆچی و بەچی مەبەستێکەوە هاتووم. رێی چوونە ناو ماڵێی پێشاندام. لێم پرسی:

"کەسی دیکەتان دەگەڵ دەماڵێدایە؟"

"نەخێر. تەنیام."

نەمزانی ئیشەکە چۆن دەست پێبکەم.هیچ حەزم نەدەکرد ئەو منداڵۆکەیە دەپرسیارانەوە پێچم. لە پڕ وام بە خەیاڵدا هات کە دەبێ تەرمەکە هێشتا هەر چاوەڕێی ناشتنێ بێ و ئەو بیرۆکەیەشم سەرنجی کونجەکاویانەی منی زیاتر بەلای ویدا راکێشا. ئەو هەروا راوەستا بوو و چاوەکانی بەر دابوونەوە و دەزەوییەی چەقاندبوون و چاوەڕێی پرسیارەکانی من بوو. لەبەر خۆشیەوە نارەناری ئاهەنگێکی بوو کە دەو دەم و ساتەیدا سەیر دەهاتە بەرچاو. سەیرێکی ئەولا و لام کرد، ژوورێکی بن میچ و پەرنجەرە بلند، کە تەنیا دوو تاکە پەنجەرەیان پەردەیەکی تەنکیان پێوە بوو. رایەخی ناو ژوورەکە قالیچەیەکی تەنك بوو کە لە بەر سۆبەکەوە راخرا بوو. مۆبێل و

کەلوپەلەکانیش هەرچەندە کۆن و پەڕپووت و شەق و شڕیش بوون بەڵام لە دارگوێزێکی یەکجار چاك دروستکرا بوون و دیار بوو ڕۆژانێکی لە ئێستا چاکتریان بە خۆوە دیوە. هەموو شتێکی ناو ژوورەکە کەمتەرخەمی وگوێ نەدانی پێوە دیار بوو. هێندێك پارچە و پووچەی ڕەش و مەکینەیەکی دروومانێ لە سەر مێزەکە بوون، پێدەچوو کێژۆڵەکە خەریکی دروینێ جلی پرسەی بووبێ.

وام هاتە بەرچاوان کە بەرناردکۆترل سەردەمانێك دەست ڕۆیشتوو و هەبوو بووبێ. دەکۆمپانیای بیمە (تەئمین) دا ناوی بە زۆر شێوە و نازناوی جیا جیاوە هاتبوو و نووسیبوویان کە ئەو لە تەمەنی شەستساڵیدا پارەکانی خۆی هەموو لە کۆمپانیای بیمە دەکێشێتەوە و وەری دەگرێتەوە و کەچی ئەوە تائێستا لە تەمەنی پەنجاوشەش ساڵیدا مردووە. پەنجاو شەش ساڵی و ئەو ئافەریدە ناسکۆڵەیە! و ئا ئەم منداڵە کە هەر چۆنێکی لێکدەیەوە لە بیست ساڵان تێپەڕ ناکا و ژنی ویش بوو.

من لە پڕ بەلای ویمدا ئاوڕ دایەوە. دەمویست زۆر شتان بپرسم.

"خانمی کۆترل، بە داخەوە کە دەبمە مایەی نارەحەتیەتان. ڕاستە کە دکتۆر ناهێڵێ بنێژرێ؟"

"بەڵێ."

"مێردەکەتان چەند وەخت بوو نەخۆش بوو.؟"

"نزیکەی دە ڕۆژ."

دەربارەی نەخۆشیەکەشیم چەند پرسیارێك کردن کە بەڕێکی وەڵامی دانەوە. دوایەش پرسیم.

"ئایا تۆ هەر بە تەنیایی خۆت چاوەدێریت دەکرد و پێی ڕادەگەیشتی؟"

"ئاه، نەخێر."

"کێ یارمەتی دەدای؟"

"خوشکی گیانی ماری جۆزێف."

"دەکرێ ناو و نیشانەکەیم دەیەی؟" دەستبەجێ ناو و نیشانەکەی دامێ. پرسیم:



"لە کاتی گیانەڵادا کێی بەلاوە بوو؟"

"بە تەنیایی مرد."

"بۆ بە تەنیایی؟"

"ماری جۆزێف لەو ژوورەی بوو و منیش بۆ شت کڕینێ لەماڵ چووبوومە دەرێ."

"ماوەی چەند پەرستارەکە ئەوی جێهێشتبوو؟"

"تەنیا هەروا چەند دەقیقەیەك. چووبوو چێشتێ لێنێ."

"خانمی کۆترل دەتوانن بەڵگەیەکی ئەو مردنە کتوپڕ و لە ناکاوەمان پێ بڵێن؟"

"نەخێر."

"بڵێی خۆی، خۆی کوشتبێ؟"

"نەخێر. ئەو هەرگیز کاری وا ناکا."

"بۆ نایکا؟"

"ئەو لە مردن دەترسا". تەنانەت لە بیرلێکردنەوەشی دەترسا. ڕاستە لە بارودۆخی گوزەرانی خۆی ناڕازی بوو بەڵام هەر دەیگوت لە تەمەنی شەست ساڵیەیدا پارەی بیمەی ژیانەکەی وەردەگرێتەوە و لێرە دەڕوا و ڕادەبوێرێ.

لە چەند ساڵێکی بەولاوە تریشی نەمابوو تا ئەو کارەی بکات."

"لە ڕاستیدا هەر چوار ساڵی دیکەی مابوو."

"هەر وایە. ئەو چەند ساڵێکی بەر لەمەی بیناسم ژیانی خۆی بیمە"دابین" کردبوو. ڕەنگە پێش لە دایك بوونی منیش بووبێ. من نازانم بەڵام هەندێ کات لافی ئەوەی لێدەدا و خۆی هەڵدەشەنگاند و دەیگوت کە پارەی بیمەکەی خۆی بە ڕێکوپێکی داوە و هەروا بەو زووانەش پارەکەی هەموو وەردەگرێتەوە و ژیانێکی سەرلەنوێ دەست پێدەکاتەوە. دەیگوت ئەو گوژمە پارەیەش هێندە نییە هیچی وای پێبکرێ، بەڵام دەتوانێ چەند ڕۆژێکانی بە خۆشیی پێ بژی. ئاوا، ئەوە ڕاست قسەی خۆیەتی."

"لەوەتەی مێردەکەشتان مردووە ماری جۆزێف هەر لێرەیە؟"

"ئۆی بەڵێ، هەر پێکەوەین. ئەوە چۆتە شت کڕینێ."

"کەی دێتەوە؟"

"هەر ئێستا، کە ئێوە لە دەرگاتان دا وامزانی ئەوە."

"من پێم خۆشە ببینم."

"زۆر چاکە، جارێ دانیشن. زۆر نابا دێتەوە."

من لە سەر کورسییەکی نزیك سۆبەکەوە دانیشتم. کچەش چۆوە سەر مەکینەکەی و دەستی بە دروومانێ کردەوە. یەك و شەشی لە دەمی نەهاتە دەرێ، تەنانەت ئاوڕێکی سەرپێیانەشی بە لای مندا نەدایەوە. و من هەر وریای ئەو بووم و دەگەڵ بەسەرهاتەکانی دوو ڕۆژ لەمەوپێشەکانی خۆمەوە تێوەگلا بووم و بیرم لەوەی دەکردەوە کە مردنی ئەو پیاوەی مردنێکی ناسرووشتیانە بێت.

زۆری نەخایاند کە دەنگی خشپەی پێیەك هات و یەکێك بە سەری پەنجە لە دەرکەیدا.

ماویس کۆترل دەرکەکەی کردەوە و ماری جۆزێف هاتە ژوورێ و هەر کە غەریبەیەکی دە ژوورێدا دیت زۆر بەرێزەوە سەری خوارکردەوە و کیسە پڕ لە شتەکانی کڕیبوونی لە سەر مێزەکەی دانان. "خانم من لەلایەن کۆمپانیای بیمەوە، راسپێردراوم و بۆ لێکۆڵینەوە و پشکنین دەربارەی ئاغای بەرنارد کۆترڵ کە یەکێك بوو لە مشتەرییەکانی ئێمە، هاتوومە ئێرە."

هەر بە دەم قسانیشەوە کارتێکم لە بەرکم دەرێنا و دامە دەستی و لە پڕ وەئاگا هاتمەوە، کە لە بن ئارم و نیشانەی کۆمپانیاکە برادەرێك ناوێکی سەیری نووسیبوو. بەلام من نەهاتبووم بچم ئەو ناوە بگۆڕم و گوێم نەدابوویە. ئەوجا دەربارەی نەساغی و مردنی بەرنارد کۆترڵێ هەندێك پرسیارم لێکرد و دەوەلامەکاندا شتێکی وایان تێدا نەبوو مردنێ ئەو پیاوەی ناسروشتی بووبێ و ڕێنەدانی دکتۆریش بۆ ناشتنی تەرمەکەی هەر ئەوە بوو کە بە دوای بەڵگەیەکی راست و پەسەندەوە بوو.

دەو دەمەیدا ماری جۆزێف گوتی:

"پێموایە لاشەکەی هەڵدرن."



گوتم:

"بەڵێ، ئەو کارە هەر دەبێ بکرێ."

"لاشەکە، لە ژووری نوستنی سەرێیە! حەز دەکەن ببینن؟"

"ئەگەر رێ هەبێ پێم خۆشە."

من هەرگیز حەزم نەدەکرد لاشەکە ببینم. بەلام هەستی کونجەکاویەم وای لێکردم کە بە دوای ماری جۆزێفدا بە پلیکانانـدا وەسەرکەوم و بچمە ژووری بەرامبەرێ. چوار مۆم دەنێو مۆمدانی بەرز لە هەر چوار گۆشەی تەختەکەوە داییسا. ماری پەرستار چووە پێشێ و چەرچەفەکەی لەسەر لادا، پەیکەرە بێ گیانەکەی بەرنارد کۆترل وەدەرکەوت.

روخسارێکی رەش داگەڕاو، مووی سەر و ریشی رەش. روخساری هەر چەندە گەردی مردنێشی لێ نیشتبوو بە پەنجا و شەش ساڵی نەدەچوو. بەڵکە بە پیاوێکی بەهێز و پتەو و بەخۆوە دەچوو. تاڵە موویەکی لە سەر و ریشی سپی نەببوو و دەوروبەری چاوەکانیشی هیچ چرچێکیان نەکەوتبوویە.

من زۆرم سوپاسی ماری جۆزێف کرد و لە دیوەخانی پێم گوت کە ناچارم دکتۆری هەر دەبێ ببینم و ئومێدەوارم کە خوشکی گیانی لەم کونجەکاوی و پشکنینە ببوورێ.

ئەو گوتی:

"کاکە تۆ بە ئەرکی خۆت هەڵدەستیت."

کاتی گەڕانەوێ نەیبردمەوە ئەو ژوورەی بێوەژنە جحێڵۆکەکەی لێبوو.

و من لە پلیکانەکان هاتمەوە خوارێ و دەکۆڵانێدا کەوتمە چەنگەچڕە و پەلەقاژە دەگەڵ با و بارانێدا.

عەیادەی دکتۆری لەو نزیکانە بوو. هەر زوو دیتمەوە.

دکتۆ پیاوێکی پیرەکە و بە تەمەن و مرچ و مۆن بوو، و ئەو مردنە کتوپڕەی نەخۆشەکەی خۆی بە لەکە و سووکایەتییە کارەکەی خۆی دەزانی و دەیگوت:

"هیچ بەڵگەیەك بۆ ئەو مردنە کتوپڕ و لە ناکاوە بە دەستەوە نییە."

من لەبەر خۆمەوە گوتم ئەو وا بیر دەکاتەوە، کە کۆترل تەنیا هەر بۆ سووکایەتییە وی مردووە و بە دەنگێکی بەرزەوە گوتم: "باشە، هەڵدڕینی لاشەکەی هەموو شتێکی دەردەخا."

"بەڵێ سبەی بەیانی. سەعات یازدە." "تۆ پێتوایە ئەو پیاوەیان کوشتبێ؟"

"من دڵنیام کە ئەو بە مردنی سروشتی خۆی نەمردووە."

"پێتوایە کێ ئەو هەنگاوەی بۆ مردنی وی نابێ؟" "ئەمەیان ئیدی ئەرك و کاری پۆلیسە بکوژەکە بدۆزێتەوە."

"هەر نوختە گومانێکی لەم بارەوە سەرهەڵدا پۆلیس بە دوایدا دەچێت و لێی دەکۆڵێتەوە."

"... و هیچی لێوە تێناگەن. پۆلیس هۆشیان نییە و بێ ئاگان."

## ٤

کاتێ کە بە مێترۆ بەرەو ماڵ دەچوومەوە دەبیری ئەو راپۆرتەی دابووم کە دەبوو ئامادەی کەم.

دکتۆر بەراستی پیاوێکی نالەبار و گێل و گەمژە بوو کە بۆ بەڵگەیەك هێندە دوودڵ بوو. ئەوەی من دەربارەی نەخۆشی مردووەکەی لە پەرستارەکەم بیستبوو دەگەڵ ئەوەی کە دکتۆر دەیگوت مووی لانەدەدا. ئەو نەیدەزانی من پەرستارەکەم دواندووە. دەیانگوت مردووەکە هێندێکی ناراحەتی تایبەتی دە دەزگای هەرسیدا بووە کە زۆر گرینگ و هیچی وانەبووە و هەر بە هێندێك ئاگاداری و حەسانەوە دەکرا چاك ببێتەوە، بەڵام لە ناکاو مردووە. گومانی زۆر بەرەو لای ئەوەوەیە کە دڵی وەستابێ، بەڵام دکتۆر دەیگوت چ بەڵگەیەکی وا بە دەستەوە نییە دڵی راوەستابێ.

بیر و هۆشم هەمووی بە دەوروبەری ئەو کێشەیەوە و وردە وردەش بەرەو لای ئەو بێوەژنەوە یا باشتر بڵێم بە لای ئەو کیژۆڵە بێوەژنەوە و کەمێکیش بە لای خودی بەرنارد(کۆترل)ەوە بوو. کە پیاوێکی کەتەی توند و تۆڵ و توکمە و دامەزراو و بە



هەیکەل بوو و ئەوجا دەچوومەوە لای خوشکی گیانی و جل و بەرگە تایبەتیەکەی بەری و هەمیشە ئامادەی کار و خزمەت و دوایەش دەکەوتمە سۆراغی ئەو دکتۆرە مێشك داخراوەی کە لە کارەکەی بەولاوە هیچی دیکەی نەدەدیت و نەدەزانی، ئیدی هەر ئاوا ئەوانەم لە بەردەمیدا بەرجەستە و قوت دەبوونەوە. بەڵام دەنێو هەموو ئەوانەشدا بە سەرسامیەوە دەمدیت کە ماویس لە هەمووانی زیاتر لە مێشکی من و بیرو لێکدانەوەکانی مندا جێی خۆی کردۆتەوە و سەرنجی منی بەلای خۆیدا راکێشاوە.

بەرێکەوت ئەو شەوە "ئەیوا"ی خێزانم و "گریس"ی کچە تەمەن پازدە ساڵەکەم چووبوونە کۆنسێرتێکی و من بە تەنیا سەرقاڵی بیر و لێکدانەوەکانی خۆم بووم.

ئاورێکی خۆش دەسۆبەکەیدا داییسا و منیش نانێکی گەرموگوڕی بە تاموچێژی ئەو ئێوارەیەم خوارد کە بۆیان بەلاوە نابووم و سیغارێکم پێکرد و لە بەر سۆبەکەی دانیشتم.

نازانم هۆی چبوو هاتمەسەر بیری شێوەی ژیان و گوزەرانی خۆمان و وەبەرچاوگرتنی ئەو ژیانەی.

ئێمە دە ماڵێکیدا کە هەر جێی خۆمان و قەرەواشێکی دەبۆوە دەژیاین و ئەیوا ئەو ماڵەی وەك قوتوی لێکردبوو. هەمیشە پاك و خاوێن و رێك و پێك. دەستە خوشکەکانی ئەیوای ئیرەیی ئەو ژیانەیان بەو و بەمە دەبرد. ماڵداری و کابانی و دایکایەتی هەر لە خۆی دەهات. ئەو خودای رێکوپێکی و ئەقڵ و لێوەشاوەیی بوو.

بەڵام هونەر و عیشق و ئەوین و خۆشەویستی و دڵداری بە لای وییەوە شتێکی تا بڵێی بێ بایەخ و بێ مانا و هیچ بوو و جوانی شتێك نەبوو قابیلی باس بێ بە لایەوە.

گریسی کچم نموونەیەکی کتومتی داکی بوو و ئەویش بڕیاردەری کاروبار و ئەرکەکان بوو.

جل و بەرگی هەر بۆ هێندێ دەبەر دەکرد کە لەش دادەپۆشێ و قژە سەری زۆر بە توند و دژوارییە دادەهێنا و لە پشتەوە دەیبەست. وای سابوون لە دەموچاوی دەخشاند کە سەر لووت و کولمەکانی دەبریسکانەوە.

لە سەردەمی ژن و مێردایەتیەدا هەموو شتێکی خۆشگوزەرانیەم هەبوو و ژیانم دەتگوت سەعاتی ڕێکوپێکە. دەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بڵێم شتێکی کەم بوو کە هەرگیز باس ناکرێت، شتێکی تا بڵێی پێویست، ئەویش تۆزە ژیانێك، زەڕڕە گیانێك. ڕاستیەکەش ئەوەیە من نەمتوانیبوو بزانم کە چ شتێك دەژیانی مندا کەمە. من هەرگیز هیوا و ئاوات و ئومێد و حەز و ئارەزووەکانی خۆمم تاوتوێ نەکردبوون. تەنیا ئەوە نەبێ هەر کاتێ تیشکێکی ڕووناك، نۆتێکی مۆسیقا، سەرنجێك، شتێکی شیرین و دڵگر و هەستێکی پێویستی ژیان و بەردەوامی بۆ یەك چرکە خۆی پێشاندابایە و دەرکەوتبایە منی بە لای خۆیدا کێش دەکرد و وەك هەناسێکی دەهات و تێدەپەڕی و ون دەبۆوە.

ئەو شەوەش هەروا بیر و مێشکم هەر لە دەوروبەری کێشەی مردنی بەرنارد کۆترل و ئەوانەی کە دەو مەسەلەیدا هاوبەش بوون دەخولایەوە. بەڵام لەپڕ هەستم کرد کە ناوێرم دەربارەی ماویس، ئەو شتە جوانە، ئەو کیژۆڵە بێوەژنە هیچ بیرێك بکەمەوە. بەڵێ نەمدەوێرا، هەر بۆیەشم وام هەست دەکرد چونکە هەموو ئەو شتانەی منیان بە حەسرەتەوە بووم و دەژیانی خۆمدا خۆزگە پێدەخواستن، تێکڕای هەموو ئەو شتانە دەو بوونەوەرەیدا کۆببوونەوە و هەبوون.

## ٥

هەڵدڕینی لاشەکە هەروەك تێبینیمان دەکرد هیچی پێشان نەدا. لاشەکەی بەرنارد کۆترل بە خاك سپێردرا و ڕاپۆرتەکەی منیش ئامادە کرا و درایە بیمە. کۆمپانیای بیمەش پارەکەی دایەوە بێوەژنێ کۆترلی و تا ئەو جێیەش کە کارەکە پەیوەندی بە منەوە بوو هێشتا مەسەلەکە نەبڕاوەتەوە. هەستێکی ناخۆش و گزیکارانە کە من نەمدەتوانی و نەشمدەویست تاقیکەمەوە و لێکی هەڵوەشێنمەوە و شیتەڵی کەم سەرتاپای هەموو بوونی منی داگرتبوو.



ڕۆژگار هەروا دەڕۆیشت و تێدەپەڕی. ڕۆژە وەك یەك و ماندووکەرەکان نەدەوەستان و منیش هەموو ڕۆژێ هەروا لەماڵەوە بۆ دایەرە و لە دایەرەوە بۆ ماڵێ دەهاتم و دەچوومەوە. من ناتوانم هەروا بە ئاسانی باسی ئەو ڕۆژانە بکەم و تاوتوێیان کەم. وەك ئەوەش بیرەوەرییەکی سڕاوەی ڕۆژگارێکی ڕابوردوو یا هەستێکی لە بیرچووووەوە دەمێشکی وشك و بێ گیانی مندا زیندوو بووبێتەوە و لە نوێ سەری هەڵدابێتەوە. ببوومە بوونەوەرێکی تووڕە و تۆسنی بێ ئارام و حەوسەڵە و تا دەشهات لە شێوەی ژیانی خۆم ناڕەحەت و بێزارتر دەبووم و هەروا بە سووکە بیانووێکی بەربینگم بە ژن و کچەکەم دەگرت. شەوێکیان پێم گوت:

"ئەوە بۆ گریس ئاوا کچێکی دەست و پێ سپی لێدەرچووە؟"

ئەیوا بە خوێن ساردییەکەوە وەڵامی دایەوە:

"گریس دە تەمەنێکیدایە کە هەموو کچێك دەو تەمەنەیدا هەروان. دوایە بۆ خۆی چاك دەبێ. ئەو زۆر وریا و زرینگ و زیتەڵەیە و بە دڵنیاییەوە (دانیشگای زانستەکانی ماڵداری) دەیگۆڕێ.

"دانیشگای زانستەکانی ماڵداری" دەیگۆڕێ!!"

ئەو ئاگای لە ئاوازە گاڵتەجاڕیەکەی من نەبوو و ئاوای درێژەدایە:

"پێموایە گریس دەو ڕشتەیدا کە هەڵیبژاردووە زۆر پێش دەکەوێ."

"هەڵیبژاردووە یا ناچار کراوە“ کامە کچە ئەگەر مێشکی دەسەریدا بێ و ئەقڵی لە جێی خۆی بێ ڕشتەی وا هەڵدەبژێرێ؟"

مەبەستم ئەوە بوو تووڕەی کەم. بەڵام ئەیوا گوتی:

"هەموو کچێکی ئاقڵ ئاوا دەکا."

"بەڵێ ئەگەر توانای هەڵبژاردنی هەبێ."

من لەوەم زیاتر درێژە نەدایە. چ پێویستی بە دەستێوەردانی من نەبوو. ئەوان بە هەموو شێوەیەکی ژیانی خۆیان ڕازی بوون، هەمیشە سەربەخۆ بوون. هیچ پێویستیەکیان بە من نەبوو.

بابی ئەیوا دە ساڵ دوای شوکردنێی مرد و میراتێکی کە بۆی بەجێ هێشتبوو بە هیچ جۆرێك دەستی بۆ نەدەبرد. ئەیوا هەرگیز بۆ هیچ کاروبارێکی پرس و رای بە من نەدەکرد و هیچ بەرنامەیەك بە بۆچوونی من بەڕێوە نەدەچوو. ئەیوا و گریس هەردووکیان متووی یەکدی بوون، سێوێك بوون لەت کرابوون.. هەردووکیان شێوەی یەکتری بوون، وەك یەکیان بیر دەکردەوە، جل و بەرگی وەك یەکیان دەبەردەکرد و هەستیان وەك یەك بوو. بچووکترین خاڵی هاوبەش دەنێوەمەدا نەبوو. رەنگە زۆرانێك کە رووالەتی ژیانی مەیان دەدیت، حەسرەتیان ژیانێکی ئاسوودە و ئابڕوومەندی ئاوا بووبێ و ئیرەییان پێ بردبێ.

ئەیوا کچێکی بە هۆش و گۆش و چاپوك بوو و ئێستاش ژنێکی سەربەخۆ و کەللەشەقە و هەر بەوەشەوە تەواوی هەست و نەست و پشت بە خۆبەستنێکی دە گریسیدا لەناو بردووە و نەیهێشتووە و تەواوی هیمایەکانی ژیانی بە ئامادەیی وەك پاروێ بە گەروودا دەکرد و نەیدەهێشت بۆ خۆی هیچ فێر بێ.

بە لای منەوە ئەوەندە روونکردنەوەیەی ژیانی من تا ئەندازیەك پێویست بوو دەنا هەرچی لەولاڕا هاتبایە و ڕووالەتی ژیانەکەی دیبایە داوەرییەکی دەکرد، و منی بە گێل و بێ ئابڕوو و بێ شەرەف و بێ ناموس دەزانی، هەرچەندە لە تەواوی ئەو ماوە دوور و درێژ و ئەو کارەساتانەی قەومان و روویان دا، دەمزانی بای سەرەموویەکی زیان بۆ ژن و کچەکەم نەبووە. تەنیا شتێکی کە لە دەستیان دابوو لە ماڵ نەبوونی من بوو کە ئەوەش هەر کاتی بوو و لە بەر خۆیان بوو دەنا دەمێك بوو ئەوان منیان لە ژیانی خۆیان وەدەر نابوو و وایان لەبیر خۆیان بردبوومەوە هەروەك رۆژێك لە رۆژان هەر نەشبووبم.

## ٦

راست بیست رۆژ دوای ئەم مەسەلانە، دوای تەواو بوونی کاری ئیداری. من بۆ دووەمین جار چوومەوە ماڵێ ماویسی. هەوای مانگی (...) دەو رۆژانەدا دەتگوت رۆژی بەهارێیە. سەرما دەشقی شکابوو و خۆرەتاو گەرم ببوو و هەر ئەو هەوا گەرمەش وای نارەحەت دەکردم خەریك بوو شێتم کا.



ئەوێ رۆژێ دەحاڵێکی سەیردا بووم. وەك شاییم دەدڵیدا بگەڕێ، شایی و زەماوەندی عیشق، ئی لاوەتی و سەربەستیە. ئەم بەزمە بزێوە سەرشێتە ئارامی پێنەهێشتبووم و گەیبووە ئەوپەڕی ئاسوودەیی و ئۆقرەی لێ هەڵگرتبووم.

دیارە بۆ منێك کاری یەکسەرە و بەرێوەبردنی ماڵێکی سارد و سڕ چ مانایەکی نەبوو.

من مافی ئەوەشم نەبوو بیر لە عیشق و جوانی و گوڵی سوور و تاجی شانازی و ژنانی جوان و شۆخ و شەنگ و لەبار بکەمەوە. بەڵام من دەمنداڵیەشمدا هەر بەو خیاڵانەوە چاوم دەچووە خەو و دەنووستم. ئێستاش هەر تەنیا عیشق و هەڕام دە دڵیدا شاردرابوونەوە و بە ناو خوێنمدا دەهاتن و دەچوون و بۆ بەردەوامیە ژیانم تا بڵێی پێویست بوون. دەو شەویدا دوای تەواو بوونی کارەکان وەك مرۆڤێکی بێ سرەوت بەرەو لای ماڵێ ماویسمەوە داقەڵاشت.

بیرم دەکردەوە: "ئایا هێشتا هەر لەوێیە؟ چ بیانووێکی بۆ ئەم سەردانەیە بێنمەوە“ دەبێ لەو کارەی تووڕە نەبێ؟"

بۆ دووەمین جار وەسەر پلیکانەکان کەوتمەوە و لە دەرکێم دا. ئەمجارەیان بێدەنگی هەموو جێیەکی داپۆشیبوو و ئاواز و نارەنارێك نەبوو تا بمشێوێنێ و تێکم بدا.

دەرکەکە کرایەوە. ماویس بە روخسارێکی سادە و پاك و بێگەردەوە دەرکەوت. سڵاوی کرد و چاوەڕوان ما. من یەکجار زۆر ناراحەت بووم و نەمدەزانی چ بڵێم. دوایەش تینم وەبەر خۆم دا و گوتم:

"سڵاو خانم. رێ هەیە دەقیقەیەك بێمە ژوورێ؟" دەرگاکەی واڵاکرد و وەلاکەوت.

پرسیم:

"بە تەنیای؟"

"بەڵێ."

"خوشکی گیانی ماری جۆزێف لێرەیە؟"

"نەخێر. چۆتەوە دێرێ."

"باشە تۆ چۆن وا بە تاقی تەنیا لێرەی؟"

"سەرێکی بادا:
" بۆ؟"
"ماری جۆزێف و باوکی گیانی "ئێبرن" زۆریان پەلە کرد کە بچمە دێرێ. بەلاّم من حەزی لێناکەم. هەندێ جاران دەڵێم هەر لێرە دەمێنمەوە و جاری واشە بڕیار دەدەم خێرا و بە پەلە لێرە بڕۆم. ئیدی بە هەر جۆرێك بووە هەر بەڕاستی لێرە دەمێنمەوە و هەر بەو زووانەش کچێك دێتە ئێرە و دەیهەوێ دەگەڵە مندا بژیەت.
"کەی؟"
"پێموابێ هەفتەی ئایندە."
"ئێوە دەیناسن؟"
"ئۆی، بەڵێ..."
و هەمدیس درێژەی دایە:
"بە پارەی بیمەی من ناتوانم بژیم. بەش ناکا. بۆیە ناچارم جێیەکی هەرزانتر پەیداکەم و خۆ ئەگەر بمزانیبایە بچمە کوێ تا ئێستا گواستبوومەوە و ڕۆیشتبووم. بەلاّم وەك بڵێی جێیەکی وا وەدەست نەکەوێ وایە."
"مەگەر دێرێ."
"وەك دەفەرموون مەگەر دێرێ. کە ئەویش هەر باس ناکرێ." هەر بەو حاڵەوە ماویس بە تەکمەوە ڕاوەستابوو و چاوی دەزەوییەوە بڕیبوو و پەنجەی بە سەر خوار و خێچیە داری مێزەکەیدا دێنا. گوتی:
"ئەوپەڕی دلسۆزییە."
من دە دڵی خۆمدا دەمگوت: "ئایا ئەو پێیوایە ئەوەش هەر بەشێکی دیکەی کاروبارەکانی کۆمپانیایە و من بە ئەرکێك هاتوومەوە؟" کەچی لە نوێ گوتیەوە:
" زۆر مەمنون دەبووم ئەگەر جێیەکتان بۆ پەیدا کردبام."
هەمدیس گوتیەوە: "من هەرگیز حەز ناکەم سەربەخۆییە خۆم لە دەستدەم و یا لە جێیەکی دامەزرێم، نا. من دەمهەوێ ژوورێکی هەرچەندە بچووك و بێ کەڵك و



نالەباریش بێ بیگرم و تێیدا سەربەخۆ بم. موبێل و کەلوپەلەکان ئی خۆمن. و هێندێکیشم لیرە دەگەڵ پارەی بیمەکەدا هەیە. سەیرکە کاکە، من ناتوانم هەفتەی بە یەك لیرە بژیم، هەندێك هەن دەتوانن، بەلاّم زۆر سەخت و دژوارە. کرێی ئەم ئاپارتمانە تا کۆتایی مانگی مارت دراوە و منیش تا ئەو دەمی ئەوە لێرەم. بەلاّم دوای ئەو ماوەیە یان دەبێ دەگەڵ یەکێکی دیدابم و یا دەبێ لێرە بڕۆم. ئێوە چۆنتان پێ چاکە؟"
لە پڕ بێ ئەوەی وەلاّمی پرسیارەکەی بدەمەوە پرسیم:
"چەند ساڵی؟"
بە سەیرێکەوە تێیڕوانیم و گوتی:
"نۆزدە ساڵ."
"کەمتر دێیە بەرچاو. پێتوایە من بۆ هاتوومەتەوە ئێرە؟"
"بۆ ئەوەی کارەکانی بیمەکە ئەنجامدەیت و ڕێکیان خەی. وەنا"
"هەرگیز. بیمە هێندێکی پارە داوەتە تۆ و ئیدی هەقی بە سەر ئێوەوە نییە و گوێ ناداتە ئەوەی داخوا ئێوە لێرە دەمێننەوە یا دەچنە جێیەکی دی. یانەخۆ پارەکەی بە ئاقلاّنە خەرج دەکەن یا بێرە و بەوێی دادەدەن."
"ڕاستیەکەی“ ئەدی بۆچی هاتوویەوە؟"
"من تەنیا بۆ هێندێ هاتوومەوە تا ئەگەر کارێکم بۆ ئێوە لە دەست بێت و پێم بکرێ دەخزمەتتان دابم."
"ئایا هەروا ئەو کارانە بۆ هەموو مشتەرییەکانی بیمە دەکەن؟"
لە بەر خۆمەوە گوتم:" بەڕاستی کچێکی جەربەزەیە."
" یەکەم ئێوە مشتەری بیمە نین و منیش تا ئێستا خۆم لە کاری هیچ غەریبە و غەوارەیەك هەڵنەقورتاندووە."
"ئەی کەواتە بۆچی هاتوویەوە ئێرە؟"
بۆ ئەوەی ئەگەر بتوانم خزمەتێکم لە دەست بێت. دەتەوێ قسەکەی خۆم بخۆمەوە؟"

شوێنەواری زەردەیەکی لەسەر لێوان دیار بوو تێپەڕی و گوتی: "هەر چۆنێکت حەز لێیە."

"وا نیە. ئەوە بە تۆوە بەندە. ئەگەر بتوانم کارێکم لە دەست بێ" پێی دڵشاد دەبم."

لەبەر خۆمەوە گوتم: "من بەو قسە و گەمە و گاڵتەبازییانەوە لە مەیدانێ دەرنابەم و منداڵێکیش نیم گرووی بگرم." لێرەدا هەندێکی بێنەوەبەرە دەویست، ئەوجا ئاوام درێژەدایە:

"سەیرکە. من بە رێکەوت لێرەوە تێدەپەڕیم دە دڵی خۆمدا گوتم با بچم بزانم حاڵ و گوزەرانیان چۆنە، تەنانەت دە ناو کۆمەڵیشدا مرۆڤ جاری وایە دۆست خۆش و حەزی لێیە هەمەجۆرە دۆست بێ.

"گووتت هەموو جۆرە دۆست؟؟"

ئەو کیژۆڵە. ئەو ژنە جوان و ناسکەی وەك" پەڕ"ە گوڵە. منی هێر کردووە و حەوسەڵەی پێ نەهێشتووم. تەنانەت هەر جارێکیشی چاو بڵند نەکردن سەیرێکم بکا. رووناکیە ئاگری سۆبەکەی کەوتبووە سەر مێزەکە و لەوێرا لە قژەکانی وی دەدایەوە. خەرمانەیەکی زەردی زیرێنی بەسەریەوە دروستکردبوو. لایەکی روومەت و دەموچاوی دەتاریکیە بوو و هەر تەنیا خوار گەردەنێی دیار بوو کە رووناکە. ئەو پەنجەیەی بەسەر مێزکەشی دادێنا ناسك و باریکەڵە بوو. چاڵی روومەتێی پێویستی بە پێکەنینێ نەبوو تا چاڵێ بکا. هەر کە قسەی دەکرد، بە تایبەتی لە دەربڕینی هەندێ وشاندا، روومەتەکانی قووڵ دەبوون. تا دوایە بە تووڕەیی و دەنگێکی تۆسنەوە گوتم:

"زۆر باشە، من دەڕۆم و ئەگەر ناڕەحەتیشم کردبن ئەوە داوای لێبوردن دەکەم."

هەستام کە بڕۆم. بەڵام ئەو بەبێ ئەوەی سەرێکی بڵندکا گوتی: تۆ هەرگیز سێبەر قورس و ناڕەحەت هێن نیت." " ئێوەش پێویستیتان بە یارمەتی و رێ پێشاندان و ئامۆژگاریان نیە."

"لە مەیاندا هەڵەی ئاغا."



بێ بیرکردنەوە گوتم:

"من دەتوانم لە جێی باوکت بم"

برۆیەکانی هەڵێنان و گوتی:

" بە راستی؟"

"من کچێکم هەیە بە چوار ساڵ لە تۆ بچووکترە."

"بە شازدە ساڵەییەم مێرد کردووە. ئەوە دەشبینی کە زۆر لەو تەمەنە گەورەتر دیارم."

ئەوجا هەناسێکی هەڵکیشا و گوتی:

" ئاغا. هەرگیز لە من تووڕە مەبە."

"من تووڕە نیم."

"من زۆر شاد و دڵخۆش دەبم یەکێك پەندو ئامۆژگارییەکم دادا."

"کەواتە دەبێ رێی ئەوەم پێ بدەی تا من بتوانم ئەمە بکەم.''

"ئەڵبەتە، جا بۆ نا؟"

"راستە، ئەو پارەیەی ئێمە داومانەتە تۆ بەشی هیچ ناکا، ئێوە چ کارێکی دەزانن و لە چیدا شارەزان؟"

" درووومان."

"چ جۆرە درووومانێك؟"

" نەخش و نیگار و گوڵدۆزی و شتی ناسکی دەستچن، و دەنگیشم خراپ نیە."

"ئا! بەڵێ من ئەو رۆژەی کە بۆ یەکەمجار هاتمە ئێرە گوێم لە دەنگتان بوو.. باشە چ جۆرە مەشقێکی دەنگت کردووە؟"

"بە داخەوە هیچ جۆرە مەشقێکم نەکردووە."

"کەواتە لەم رێیەوە ناتوانی خۆت بژیەنی و هەر کاری دەستیەکەت و لێرە گواستنەوەت باشترە."

"بەڵێ وایە."

"پێت خۆشە ژوورێکت بۆ پەیداکەم؟"

"بەڵێ تکا دەکەم؟"

"زۆر چاکە."

ئەو جا بێدەنگی باڵی کێشا. ئیدی دەمتوانی چ بڵێم.

سەرەنجامی ئەم گفتوگۆیە بووە هۆی ئەوەی کە نێوانێکی گەورەمان کەوتە بەینێوە.

تەواوی هەستە شاعیریانەکان سڕانەوە و نەمان. من نە رۆمیۆ بووم نە پاڵەوانی داستانی هەزار و یەك شەوە، بەڵکە پیاوێکی وەك باوکی بووم، کە هەر دەمتوانی یارمەتی بدەم و بەس و بڕایەوە.

من ناسکی شاعیرانە و خۆڕاگرتن و پتەوییەکی سەرسام هێنم دەو کچۆڵەیدا دەدیت کە ناچار بووم سەری نەوازشی لە بەرامبەردا دانەوێنم.

دەو دەمەیدا لە لایەکی مێزەکەوە بەرەو لای منەوە هات و بەوپەڕی سادە و ساکارییەوە چاوەکانی دەمنەوە بڕین و گوتی:

"ئەوە ئەوپەڕی لوتف و خۆشەویستیە کە ئێوە بەرامبەرەمەتان دەربڕیوە و هاتوون یارمەتی من بدەن. قەشە و خوشکی گیانیش هەر دەیانەویست یارمەتیم بدەن. بە مەرجێك من واز لە دنیا بێنم. بە هەڵە نەچیت. ئەوان تەنیا مەبەستیان یارمەتیدانی من بوو و هیچیدی. ئاغا، وەك دەبینی من هەرزەکارێکم و سێ ساڵانم دەژیانی ژن و مێردایەتییە خۆ ڕاگرتووە. کە دەڵێم"خۆڕاگرتن" پێت سەیر نەبێ. ئێوە مێردەکەی منتان نەدەناسی هیچ کەس و هیچ ژنێك نەیدەتوانی دەگەڵیدا بەختیار بێت. ئێستاش کە چۆن بووینە هاوسەر ئەمەیان داستانێکی دیکەیە کە رابردووە، من دەمهەوێ لە بیری بەرمەوە و ئێستاش ئەوەندە پارەی کە دەمکەوێ، پێم گەیوەتەوە. بەو هەندە ئەزموون و ئامادەگیە کەمەشەوە دەمهەوێ ژیانێکی نوێ لە سەرەتاوە دەست پێبکەمەوە و ئەگەر پێویستیش بوو ئەوە دەساڵان بە راشکاوی هەوڵدەدەم تا بگەمە جێیەکی. سەیر دەکەی من حەزم لە دەرکەوتنێیە. بە لای منیشەوە هەموو مرۆڤێك مافی ئەوەی هەیە و خراپیش نییە حەزی لە سەرکەوتن و پێشکەوتن و دەرکەوتنێ بێ.



راستی و دڵسۆزی منیش تا بڵێی زۆرە هەر بۆیەشە پێشنیاری پەیدا کردنی ژوورێکتان بۆ من بەو پەڕی ئارەزوووە حەزدەکەم."

"زۆر زۆر چاکە."

و هەولم دەدا لەوەی زیاتر و خۆشحاڵتر خۆم نیشاندەم کە هەستم پێدەکرد. لە بەرەوەش کە سەیرم دەکرد و دەمزانی منی وەك ئامرازێکی پێشکەوتنی خۆی هاتۆتە بەرچاوان، بەڵام هیچ چارەیەکیش نەبوو. ئەدی باشە من چاوەڕێی چیم و بە تەمای چیم و لەو دیدارەدا دەمهەویست چ سوودێك ببینم. ڕاستیەکەی من ئەم شەو بۆ هاتبوومە ئێرە؟ هەی گێلە پیاو! گێلە! تۆ بە تەمای چی کچە نیوە فەرەنسیەکی سەرتاپا ئەیما و هێما و خۆگیر و بەناز و کرێشمەی؟

بەڵام بە تەواوی یەك دەندەگیەوە بڕیارم دا کە پاشگەز نەبمەوە و ناکام نەبم و دەست لە بەدواداچوونی ئەو کارەی بەرنەدەم. لە وشەی "بە دواداچوونێ" سڵەمیمەوە و داچڵەکیم. ئایا هەر بەڕاستی مەبەستەکەی من بە دواداچوونی ئەو کچەیە؟ کچێکی کە هەر نەمدەناسی و هەروا لە خۆوە بەرامبەریم هەست بە نادڵنیایی و دڵەڕاوکێ دەکرد؟ تا لە دواییدا گوتم:

"کەی هاتمە سەر ئەوەی کە دەتوانم شتێکتان بۆ بکەم. ئەودەمی یەکسەر ئاگادارتان دەکەمەوە."

هەر ئەودەمی خودا حافیزیم کرد و ڕۆیشتم.

لەو ڕۆژە بە دواوە هەر کە لە کارێ دەبوومەوە بۆ پەیداکردنێ هۆدەی ئەو دەرکە و دەرکەم دەکرد و لە هەموو دەرکێکم دەدا، بەڵام کارێکی هەروا ئاسانیش نەبوو. هەر لە تاو هەڵاتێوە تا تاوکەوتنێ سەر و خوار نەدەما نەیکەم و هەموو جێیەکی دەگەڕام، ئەڵبەتە هۆدە و ئاپارتمانی چۆڵ و زۆر هەرزانیش زۆر بوون و دەست دەکەوتن، بەڵام من دڵم نەیدەهێنا و حەزم نەدەکرد ماویس لەو جۆرە شوێنانە ماڵێ دانێ. مانگی شوبات تیپەڕی و کۆتایی مانگی مارت بوو کە دووبارە چوومەوە سۆراغیێ. لە ماڵێ بوو و هەمدیس ئەمجارەش یا لە بیری چۆوە یا هەر بە ئەنقەست فەرمووی دانیشتنێی

نەکردمەوە. ئەو رەفتارەی زۆری نارەحەت دەکردم و تا دەهاتیش هەستی ئەوەی لـەلای بە هێزتر دەکردم تا بیروباوەڕی ئەو بەلانی خۆمەوە بگۆڕم. پێمگوت:

"هـەوڵ و تەقـەللای گـەڕان و سـووڕانی مـن تـا ئێـستا ئـەنجامێکی نـەبووە و نەگەیوەتە چ جێیان."

وەك بڵێی هەستم کرد شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:

" من هەر بەڕاستی دەگەڵ هاونشینیە ئـەو کـچەی چـاوم پۆشـیوە چـونکە بـیرم کردەوە وا چاکترە جارێ راوەستم بزانم چۆن دەبێ. باشتر نەبوو؟"

"ئەڵبەتە کارێکی دروستە."

ماوەیەکمان قسە کردن. هەموو پرسیارەکانی منی زۆر بە تاسەوە وەڵام دەدانەوە. بۆیە هەستم کرد کە ئەو کیژۆڵە جوانە، هەروا خـاو نەپێـچراوەتەوە و دەسـت و پـێ سپی نیە و چاکی ئاگا لە خۆیە. بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پـێم خـۆش بـوو کـە سەرەداوی گلۆڵـەی کـار و ژانـی وی دە دەسـت بگـرم و ئاگادارییـەی بکـەم و چـاوم تێبیەوەبێ. ئەوجا گوتم:

"ئیدی تا زووتر لێرە بڕۆی چاکترە. ئێرە گەڕەکێکی چاك نیە. هەر چەندە گـەڕەك ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە."

"ئەرکی چی؟"

"ناساندنی ئێمە بە یەکتری."

سیبەری زەردەخەنەیەکی بەسەر لێواندا خشی بەڵام هیچی نەگوت.

" ولە هەمووشی چاکتر ئەوەیانە کە من گوێم لە ئاوازی دەنگی تۆ بوو."

هەمدیس بێدەنگی. "و ددانیشی پێدادەنێم کە هەر بەو هۆیەوە، تەنانـەت پـێش ئەوەی بشتانبینم، بەرەولای ئێوەوە کشابووم."

ئالێرەدا سەرنجەکانی دەمنەوە بڕین و گوتی:

"ئەدی ئێستا..؟"

من بە بێ فەرموو لە سەر لێوی مێزەکە دانیشتم و گوتم:



"و ئێستا گومانم لە هەموو شتێك پەیدا کردووە."

دووبارە سەیرێکی کردەوە و هیچی نەگوت. بەڵام من هەر لە سەری رۆیشتم:

:::بەوهەمو لەمپەر و پەرژینانەی کە لە سەر رێمەوەن تا هاتوومەتـە ئێـرە، هـەر بۆوەی بزانم ئەگەر کارێك یاکۆمەکێکم لە دەست بێ بۆتان ئەنجام بدەم و کەچی دەبینم لە جیاتیان وەك خزمەتکار و نۆکەرێکیم رەفتار دەگەڵدا دەکەی."

لەسەرەخۆ گوتی:

"پێتان خۆشبوو چۆناوچۆن رەفتارکەم و چۆن بم؟"

"وەك دۆستێك."

هەناسێکی هەڵکێشا و شانەکانی هەڵتەکاندن. من بێ ئیختیار بازووەکانیم گرتن و بەرەو لای خۆمەوەم راکێشا. ئەویش وەك منداڵێکی بێ دەسەڵات تەسلیم بوو و بێ بەرگری راوەستا.

وای نازانم ئەو هەموو هێز و توانایەی ئەو ژنـە بەسـەرمنیدا هـەبوو چـۆنی بـاس کەم. ئەو هیـچی نـەدەکرد. هیـچی نـەدەگوت. هـیچ کـارێکی نـەدەکرد نیـشانە و شوێنەواری عیشوەگەریەی پێوە دیار بێت. تەنانەت بە تەماشاکردنێ تەنگەتاو دەبوو. دەگەڵ ئەوەشدا منی تووڕە کردبوو. من گوناهم نەبوو، کە هەر لە خـۆوە بازووەکـانیم گرتن. ئەوە یەکەمین جار بوو دەستم وێی دەکەوت. لـە بروسـکە و کارەبـای بـەهێزتر بوو. هەموو گیانمی هێنایە لە رزە. لەسەرەخۆم راتەکاند و گوتم:

"من بۆیە هاتوومە ئێرە تابمە دۆستی تۆ و کەچـی دەمخەیتـە پـشتگوێ و هـەر فەرمووشم لێناکەیت. تەنانەت ئەوەندە ئەدەبەشت نیە کە کاتێ دێمە ئێرە فەرمووی دانیشتنم لێبکەی."

بەبێ ئەوەی هەوڵی کشانەوە بدا بۆ دواوە. زۆر بە ئەسپاییەوە گوتی:

"ئێـوە چـاوەڕێی زۆر شـتین. هـیچ کەسـێك هـەروا لـە خـۆوە دۆسـت نـاگرێ. بەتایبەتیش کەسێك کە هێشتا لاشەی مێردەکەی دەگۆڕێدا سارد نەبۆتـەوە. هـەرگیز دۆستی تازە ناگرێ."

من لەو قسەیە داچڵەکیم و بەرهەڵدام کرد. هەر لە بیریشم چوو بۆوە کە مێردیشی هەیە. لەبن لێوانەوە گوتم:

"داوای لێبوردن دەکەم، هەقتانە. من زۆر بزۆزم، بەڵام هەر چۆنێك بێ تۆرێم دەدەی کە من بێم و یارمەتیتان بدەم کەچی کە دێم ئێوە بەدەرفتاریمان دەگەڵدا دەکەن. من هەرگیز گیانی ناحەزیە وام دەکەسدا نەدیوە. ئەگەر هەروابێ ئیدی من لەمەودوا نایەمەوە ئێرە. ئێوەش بۆ خۆتان کوێتان حەز لێیە بچن و ئارەزووتان لە چییە بیکەن."

لێرەدا سەرنجەکانی دەمنەوە برین و منیش ئەوە یەکەمجارم بوو کە ببینم چاوەکانی شینن و ئەڵقەیەکی تاریك دەوری بیلبیلەکەی چاوی گرتووە.

لەپڕ لە سەر خۆ و وریایانە گوتی:

" ئاغا، کاتێ ژنێکی جحێڵ و تەنیا، هەژار و بێکەس و بێدەر و بێ ئاشنا و سەرەڕای ئەوەش کە ئەزموونێکی تاڵی لە مردووانەوەش هەبێ، دەچێتە ئەقڵەوە کە دەستی دۆستایەتیە بەرەو یەکەمین پیاوێکەوە درێژکا کە تووشی دەبێ؟"

"ئەڵبەتە نەخێر."

"باشە، ئەو جا دەڵێی چی؟

بە پەلە گوتم:

" ئێوە دەتوانن متمانە بە من بکەن باوەڕتان بێ لە یارمەتیدان و کۆمەك پێکردنتان بەولاوە هیچ مەبەستێکی دیکەم پێتان نیە. وام هاتۆتە بەرچاو کە ئێوە تا ئێستا هیچ خێرو خۆشییەکتان لە ژیان نەدیوە. من حەزدەکەم یارمەتی بەختەوەر بوونتان بدەم. زۆر بەدبین مەبن. دەنێو خەڵکیدا کەسانێك هەرهەن کە تەنیا بەدوای دۆستایەتیەوەن."

"باوای دانێین من حەز نەکەم."

من لە مێزەکە هاتمە خوارێ و گوتم:

"زۆر چاکە من دەڕۆم."

کڵاو و دەستکێشەکەمم تاودانێ و بەرەو دەرگاکەوە چووم.



"ئاغا. پەلەمەکە. من گوتم ئەگەر."

بەڵام من بە بێ ئەوەی سەیری دواوە کەمەوە دەرگاکەم کردەوە. بەڵام گوێم لێبوو کە دەیگوت: "وامان دانا کە من ئێوە بانگهێشتی نانی ئێوارێ کەم کە هەر تەنیا قاپە شۆرباوێك و هەندێك میوەیە...چی."

بەڵام من چوومە دەرێ و دەرگاکەم بە توندی پێك دادایەوە.

## ٧

دوای سەعاتێك من هاتبوومەوە. ئەمجارەیان بێ لە دەرگادان وەژوورکەوتم. ئەو سەعاتەشم لە ڕێی نێوان ئەوێ و ماڵێدا بە سەر بردبوو. هەر بەو جۆرە تا بەردەرکێ چووم و یەکسەرە بە پەلەیەکی سەرسام هێن و وڕەوە هاتمەوە.

هەرکە چوومە ژوورێ، سەیرم کرد ئەوە سفرەی بەسەر مێزەکە داداوە و پێویستیەکانی شامی دووکەسانی لەسەر دانراوە. ئەگەرچی سفرەکە کۆن و لە هێندێك جێیانیشیەوە سەرەداوی دەزووەکانی لێ هاتبوونە دەرێ. بەڵام تابلێی پاك و خاوێن و وەك بەفری سپی بوو و بێجگە لە چەقۆ و چەنگاڵ و کەوچکیش نان و نقیشك و دووپەرداغ و شووشە شەرابێکیشی لە سەر بوو. لە ناوەڕاستی مێزەکەش، لە جیاتی گوڵ پەیکەرێکی چینی زۆر ناسك و ڕەنگاوڕەنگ دانرابوو.

ماویسیش لە بەردەم سۆبەکەوە دانیشتبوو مەنجەڵی سەر ئاگرەکەی تێك دەدا.

هەر کە من چوومە ژوورێ بەبێ ئەوەی ئاوڕێك بداتەوە دوایە گوتی:

"شام هێندەی نەماوە."

من بە سەر سەریەوە ڕاوەستام و گوتم:

"چاوەڕێی من بووی؟"

"ئەڵبەتە."

"بەڵام من پێموابوو جارێکی دی پێ دێرە نەنێمەوە."

"سەلماندت."

"بوونەوەرێکی سەیری."

"ئۆی! نا، تەنیا کەمە ئەزموونێکم لەمبارەیەوە هەیە."

هەر ئەوەدەمی هەستا و شۆرباوەکەی دە قاپی کرد و قاپە میوەیەکی جوانیشی دەگەڵ دانا و بە دەربڕینێکی تایبەتیەوە گوتی:

" شام ئامادەیە."

لەسەر مێزێ دانیشتین. ئەو نانەکەی لەت کرد. لەتێکی دا بە من و لەتەکەی دیشی بۆخۆی دانا. ئەوجا هەردوو پەرداغەکەی پڕ کردن لە شەراب و بەم شێوەیە منی بە دۆستی خۆی قبوڵ کرد. وەك بیەوێ ورد و درشتی یادگاری ئەو شەوە هەمووی وەك خۆی بپارێزێ و بمێنێتەوە. هەر بۆیە هەموو کارەکانی هەر لە لەتکردنی نانەکە و شەراب تێکردنەکەیەوە، بە پێشوازییەکی وای ئەنجامدان کە تا ئێستاش وردو درشتیم دەمێشکیدا نەخشاوە. زۆر نەدواین. شۆربایەکە خەست و شەرابەکەش بە راستی شەرابی چاك بوو.

لە پڕ ماویس گوتی:

" کە شەرابەکە تەواو بێ هیچی دیکەم نییە." ئەوجا هەناسێکی هەڵکێشا و گوتی:

"بۆ جارێکی دی قاوەی لێدەنێم."

من نەمدەزانی چی لەگەڵ بڵێم. لەو دانیشتن و نان و شەراب خواردنەی ویم شەرم گرتبوو و تەریق دەبوومەوە و لەوەش خراپتر ئەوە بوو لەو شتانەی ئەو شەوەشی بە نێوانماندا رابرد نارەحەت بووم.

بیرم کردەوە:" ئای خۆزگە هەر نەگەڕابامەوە و جارێکی دیکەم ئەو نەدیتبایەوە."

بە شێوەیەکی سەیر نارەحەت بووم. دەترسام ئەو شامە "نانی ئێوارە خواردنە" کە هەنگاوێکی لێکتر نزیکتر کردبووینەوە هەنگاوی دیکەشی بە دوادا بێت.

بێدەنگییەکمان کەوتە نێوانێ و کەوتبووە نێو دنیای خەیاڵەکانی خۆیەوە و هەروەکو ئاگای لە من نەبێ کە هەشم. دوایەش هەمیشە هەر دەو بێدەنگی و



خامۆشیەمدا هێز و توانایەك هەستدەکرد، کە لە پەل و پۆی دەخستم و چەکی دەکردم. وەك بڵێی ئەوەندەم بەسەر بیر و خەیاڵاند زاڵ بێ، ئەو چۆنی بوێ من بیر بکەمەوە وا بووم.

لێرەدا چەکێکی جیا لە چەکی عیشوەگەری ژنانە منی دیل و یەخسیر کردبوو.

وام دەهاتە بەرچاو کە بوونەوەرێکم دۆزیوەتەوە کە بە سەد ساڵ جارێك شتێك و بوونەوەرێکی ئاوا پەیدا دەبێت و ئەو کچەی کە منیش بەرامبەری دانیشتووم راست لەوانەیە کە دڵەکان داگیر دەکەن و دەیانخەنە ژێر فەرمان و رکێفی خۆیانەوە.

شام تەواو بوو و من هەروا دەبیرەوە چووم. بێ هەست و جووڵە دانیشتبووم، ئەویش مات و بێدەنگ بوو. سەری وەسەر دەستەچەپێی کردبوو و بە دەستە راستیشی وردە نانی سەر سفرەکەی خڕ دەکردەوە. دەگەڵ ئەوەشدا، دڵنیا بووم کە بچووکترین بزاوت و جووڵە و یا سەرنجێکیم بە سەردا تێنەپەڕیوە، کەچی تەنانەت ئەویش لە وردە بیرۆکەکانی ناو مێشکی من بێ ئاگا نەبوو و بۆچوونەکانمی هەموو دەخوێندنەوە. سروشتیە کە من دەژیاندا دەگەڵ ژمارەیەك کیژۆکاڵ ئاشنا و دوور لە پەیوەندییە تایبەتییەکان دەگەڵیان تێکەڵ بووم. بەڵام هیچ کامێکیان خودا نیعمەتی بێدەنگی و کەم دوویی نەدابوونێ. بەڵکە بە پێچەوانەوە وەك ئەوەی ناچار بن قسان بکەن وا بوون، هەموو ئەو قسە و گەمە و گاڵتە و مەتەڵەك و جەفەنگانەشیان، کاریگەری ئەو بێدەنگیە قوڵە و ئەو ماتیە دەروون هەژێنەیان نەبوو. هەموو لە هەمووی شتی ئەو کیژۆکاڵانەم لە بیر چوونەوە. کەچی بێدەنگی ئەو کیژۆڵەیە تا هەتایە دەبیر و یاد و بیرەوەرییەکانی مندا هەر زیندووە.

## ۸

دووبارە کەوتمەوە سۆراغی پەیداکردنێ هۆدەی بەڵام هیچم وەگیر نەکەوت. وەك بڵێی جێیەکی گونجاو دەئاوەدانیە نێو ئەو شارەیدا قاتی بێ. خۆ ئەگەر هەشبایە، من نەمدەوێرا و رێی ئەوەم بە خۆم نەدەدا بیبەمە جێیەکی وا کە بتەوێ و نەتەوێ دەگەڵ

ژمارەیەك لاو و هەرزەکار ڕووبەڕوو دەبۆوە و منیش حەزم نەدەکرد ئەوان کەسانە ئەو جوانییە شۆخ و شەنگیە دڵبەرەی وی ببینن، سەرەڕای ئەوەش ئەو دەبوو لە جێیەکی وادا ژیابایە کە من بتوانم و کەی ویستم بیبینم و لە هەر گەڕەکێکیش بایە ئەو عەیبەی لەمبارەیەوە هەر هەبوو.

سەر لە نوێ چوومەوە سەردانێی. لە پشت مێزەکەوە خەریکی گوڵ پێوەدانی پارچەیەك بوو. هەر کە منی دیت دروومانەکەی بەلاوەنا و هەستا. پێم ڕاگەیاند کە هیچم بە هیچ نەکردووە. لە دواییدا وامان بە چاکتر زانی کە هەر لەوێ بمێنێتەوە. من جێییەکی گونجاوم هەر نەدۆزییەوە.

سەرێکی بادا و گوتی:

"من چوار هۆدەم دەبەر دەستیدان. باشتر وایە کە ئەم مانگە، یانی دوای هەفتەیەکی دیکە: دوو هۆدان چۆڵ کەم. پێشت وا نەبێ ئەوە چاکترین چارەیە! ئەگەر کارێ بکەم ئەوە پارەی دوو هۆدانم بە ئاسانی پێ دەدرێ."

"دەتوانی کارێکی بۆ خۆت بدۆزیەوە؟"

"بەڵێ ئاغا، بە چاکیش."

"زۆر چاکە. ئیدی پێویست ناکا من بگەڕێم. ئەوە بیرێکی چاکە. هەر چەندە ئەم گەڕەکە زۆر پیس و پەڵۆخە، بەڵام بۆ تۆ زۆر باشە."

لەو قسەیەی برۆ تێکنان. و من بە پەلە پرووزێوە گوتم:

" بەڵام ماڵێکی جوانە، هەر چەندە خانووێکی کۆنیشە و پڕە لە پیاوچاك و لەمەچێتران."

"پیاوچاك؟ وای! قسەی وا نەکەی. من دڵتەنگ دەبم و ناشمەوێ غەمبارم. نا. نا. واز بێنە با ئاگری سۆبەکە خۆش کەم و شۆرباکە گەرم کەمەوە. شامێ بخۆین و دڵشاد و شەنگوڵ بین. وەرە تەك منەوە و با لە سەر زەوی دانیشین و شۆربای پێکەوە هەڵقوڕێنین، ئاوا. مەهێڵە دڵتەنگ و گرژ و مۆن بین."

من بە تەکیەوە لەسەر چۆکان دانیشتم و کەوتمە مەنجەڵ تێکدانێ.



من دەمتوانی قۆڵی دەشان و قۆڵان وەرێنم. زۆر سادە و ساکار و سروشتیش بوو.

هەر چەندە زۆریشم حەز لێبوو بەڵام هەر وام نەکرد. هەموو خانەکانی لەشم خوازیاری وێکەوتنێی بوو. بەڵام هەر خۆم ڕاگرت.

پەیمانم دا بوو هەنگاوێکی لەوەی زیاتر لێ نەچمە پێشێ و ویژدانی خۆم نارەحەت نەکەم.

ئەوجا هەروا کە شۆرباوەکەم تێك وەردەدا. هەر بۆ ئەوەی شتێکی بڵێم پرسیم:

"بڵێ بزانم پێش ئەوەی بێیە ئێرە لە کوێ دەژیای؟"

ئەو هەمیشە بە ئارەزووەوە وەڵامی پرسیارەکانی منی دەدانەوە.

"لە ڕاستیدا من لە ئینگلتەرە لە دایك بووم. لە گوندێکی. بەڵام هەر تەنیا ساڵێکی لەوێ بووم. دایکم خەڵکی ڤییەننا بوو."

(ناوی دایکی نەگوت- منیش حەزم نەکرد بپرسم.) بەڵام بەو قسەیە داچڵەکیم. چونکە من تەواوی ئەو ماوەیە وامدەزانی کە فەرەنسایییە. و ئێستا دەردەکەوێ کە خەڵکی ڤییەننایە و ئەو موو و قژە زەردە زێڕین و ئەو ناسکی و جوانی و ناز و بازانەی لەو دایکەوە بۆ ماوەتەوە.

"... باوکم ئینگلیزی بوو، ئەو کاتەی هێشتا منداڵ بووم، دایکم و باوکم چوونەوە ڤییەننا بۆ سەردانێ نەنکم و باپیرم و لەوێش مانەوە. من هێشتا هەر منداڵ بووم کە جەنگی جیهانی هەڵاییسا و ئێمەی هەموو ماڵوێران کرد و شارە جوانەکەمانی کاول کرد و لە نێوی برد. ئای ئاغا، ئێمە مانای برسییەتی و بەدبەختییە لە ڤییەننایە فێر بووین و تێگەیشتین. باوکم ئێمەی بەجێهێشت و هاتەوە ئینگلتەرە و چووە ریزی سوپاوە. بەڵام دایکم نەیتوانی دەو دەمیدا نیشتمانەکەی خۆی جێ بێڵێ.

دوای سێ ساڵ کە من تەمەنم دوازدە ساڵان بووم باوکم لە شەڕێدا کوژرا. ئێمەش دەگەڵ نەنك و باپیرەمدا کە هەرچی ئاهێکی بڵێی نەمانبوو لە ڤییەننا ماینەوە.

نەنکم و باپیرەم لەوپەڕی هەژاری و نەداری و نەبوونیەدا سەریان نایەوە و مردن.

دەڵێن نەنکم دەجوانیەدا تا بڵێی شۆخ و شەنگ و لەبار بووە، جوانیەکی تێکەڵ بە رەسانەیەتی نەجیبیە.

من و دایکم ئەوپەڕی هەژاری و نەبوونی و دەستکورتی و برسییەتیمان دیت، تا جەنگ کۆتایی هات و ئێمەش هەوڵمان دا بێینەوە ئینگلتەرە. بەڵام دایکم لە پاریس مایەوە. لەوێ یەکێك پەیوەندی دەگەڵ دایکمدا کرد و دایکیشم لەوێ مایەوە. ئەو کەسە زۆری حەز لێبوو دایکم بخوازێ. بەڵام بە داخەوە ژن و منداڵی هەبوو.

دوایەش دایکم تووشی دەردێکی گران بوو و ئەویش مرد. ئەو پیاوەش هەروەك خۆی دەیگوت لەبەر خاتری دایکم منی ناردە قوتابخانە و دوای ساڵ و نیوێك بۆ یەکەمجار رێیان دام کە پشووی هاوینان لە ماڵی یەکێك لە هاوڕێیانی قوتابخانەم بمێنمەوە و هەر دەو پشووانەشدا بوو کە پیاوێکم ناسی و دوایەش هەر مێردم بەوی کرد."

ئا لێرەدا قاپی شۆرباکەی هەڵگرت و دە هەورەکانی دیکەی کرد و لە سەر مێزەکەی دانان و نانەکەی دوو لەت کردەوە و نیوەی دایە من و بە دەم تێکدانی شۆربایەکەی خۆیەوە ئاوای درێژەدایە:

"ئەو پیاوەی مێردم پێکرد لە بنەماڵەیەکی مامناوەندی بوو. هەم لە بابەت بنەو بنەچەکەوە هەم لە بارەی بوون و نەبوونییەوە. سەرەتا خانوێکمان لە بەشی رۆژئاوای شاریەوە بەکرێ گرت بەڵام چونکە گران بوو پێش ساڵێك بەر لە ئێستا هاتینە ئێرە."

"بەڵام ئەدی... باوکتان... ئێوە هیچ خزم و کەس و قەوم و قیلەیەکتان نیە؟"

"نەخێر... نەخێر."

بەلای منەوە ئەو پەرجووە یەکجار زۆر بە پەلە گوترا.

"ئاغا من دایکم لە بنەچەیەکی یەکجار زۆر رەسەن بوو، لەو پیاوە ئینگلیزەی کە باوکی من بوو زۆر دڵنیا بوو و متمانەی پێکرد، بەڵام دەگەڵ ئەوەشدا کە شەیدای دایکم بوو و زۆریشی خۆشدەویست بەڵام ئەرکی خۆی بەجێ نەهێنا.. تێدەگەی دەڵێم چی؟"

"نا، چۆن؟"



"ئەو زۆر سەربەستانەی بیر دەکردەوە و دەیگوت بەند و باوی ژن و مێردایەتی بۆ، هەر تەنیا ئەوین و خۆشەویستی بەسە. ئەڵبەتە رەنگە لە دنیای ئاشتی و ئارامیدا هەر خۆشەویستی بەس بێ، بەڵام دە ئاڵۆز و بڵۆزی و بەدبەختیەکاندا، نا."

"ئایا هیچ پارە و پوولێکی بە میرات بۆ تۆ و دایکت بەجێ نەهێشت؟"

"ئەو زۆر جحێڵ بوو، سەرمایە و سامانێکیشی هەبوو. بەڵام وا زۆریش نا، بەڵام بای خۆی بەس بوو. هەرگیز گوێی نەدەدایە خووخدە و رەسمیات. هەر بۆیە سپاردە نامەشی نەنووسسیبوو کە مرد.

کاتێ کە دایکم دەیهەویست بگەڕێتەوە ئینگلتەرەی، هەر لەبەر وەی بوو بزانێ داخوا شتێکی بۆمە بەجێ هێشتووە یانە نا تا هەر نەبێ دەستی هەژاریەمان لە یەخەی کاتەوە، بەڵام مەرگ رێی نەدا و مرد.

دوایەش بەرنارد، یانی مێردەکەم زۆری هەوڵدا. ئێرە و ئەوێی زۆری کرد و هاتوچوو، و خۆ ئەگەریش بنەماڵەی باوکم بە قسەیان کردبایە کە دڵنیاش بووم بە قسەیان نەدەکرد، هیچ لە گۆڕێ نەبوو. ئەوەی هەبوو و نەبوو هەمووی دەشەڕێدا نەمابوو و لە بەین چووبوو."

ئەوە ئەو داستانە بوو کە ماویس بۆی گێڕامەوە. بە ئەوەی سەرەنجی رادەکێشا ئەوە بوو کە دایکی وی لە بنەماڵەیەکی ئاوا نەجیب و رەسەن بوو چۆنی وا بە بێ قەید و شەرت خۆ تەسلیمی ئەو کابرا جحێڵە ئینگلیزە کردبوو؟

"دایك و باوکم لە ڤیەیەننا یەکتریان دیبوو و پێکەوە هەڵاتبوون و لە ئینگلتەرە لە نزیك لەندەن لە خانووێکی لادێییانەدا ماڵێ دادەنێن. کەس نایانناسێ و کەسیش نەیدەزانی کە ئەوە ژنی راستەقینەی باوکم نییە. دوایەش باپیرەم و نەنکم لێی خۆش دەبن و دەیانبوورن و من لە ڤییەننا بیستم کە دۆست و ناسیاوەکانی دایکم پێیان وابووە کە دایکم هەر بە ڕاستی مێردی بە باوکم کردووە... بۆیە هیچ ریسواییەکی بە دواوە نەبوو. نەنکم و باپیرم من و دایکمیان تا سنووری پەرستن خۆشدەویست، ئێمەش زۆر بەختیار و کامەران بووین، ئۆی، زۆر زۆر بەختیار."

"بەڵام، ئەدی بنەماڵەی مێردەکەتان؟"

" کەسێکی کە بە کەڵك بێ نەبوو."

"سامانێك، پوول و پارەیەك؟"

سەرێکی بە نیشانەی نەئەوە بادا و گوتی:

"هەرچی سەرمایە و میراتی دایی و بابان و مێردی هەبوو هەمووی دەشەڕێدا لە بەین چوو."

ئا لێرەدا جووڵەیەکی بە دەستەکانی کرد. هێندێکی شان و قۆڵ هەڵتەکاندن و چاوەکانی دەمنەوە بڕین و گوتی:

"ئا بەمجۆرە هەرچی شانازی و دار و نەدارمان بوو هەمووی لە بەین چوو."

ئای لەو چاوانە خودایە، چ چاوێکی تیژ و کاریگەر.

"ئێستا دەزانی بۆ هەر دەستێکی کە بەرەو لای منەوە درێژ دەبێ، ناتوانم هەروا بە ئاسانی قبوڵی کەم؟ مرۆڤ دەبێ بە پارێز بێ، و دەگەڵ هەر هەنگاوێك و هەر بڕیارێکدا، قووڵ ببێتەوە و بگونجێ."

نازانم بۆ هێندەم خۆ پێ سووك و سانا و چووکەڵە بوو دەحاند ویدا و هەستم دەکرد ناتوانم تەماشای چاوەکانی کەم. بەڵام وامدەزانی کە منی دەتەرازووی تاقیکردنەوێ ناوە و بە ڕواڵەتیش پێدەچوو منی قبووڵ بێ.

ئا لێرەدا لە پڕ دەستەکانی بە توندی و بە جۆرێك کە لەپی دەستی بەرەو ژووربێ لەسەر مێزەکەی دانان. دەستی ئیش و کار و ماندوو بەڵام ناسك و دڵگیر.

ئەوە دەستی خۆشەویستێك بوو کە بەرەو لای منەوە درێژ کرابوون. دەستبەجێ دەستم نایە دەستیەوە و پەنجە ناسکەکانی دە دەستمەوە ئالان، ئەوانم توند گرتن و بۆ یەکەمین جار بە ڕوومەوە پێکەنی. زەردەخەنە و پێکەنینێك کە تەنیا زەردەخەنەی خۆشەویستی و هاوڕێیەتی و ناخی دڵ و دەروون بوو.



# ٩

هەر هەنگاوێکی نێو ئەم داستانە و هەر ئەڵقەیەکی نێو ئەم زنجیرەیە بۆ من تا هەتایی و هەرگیز لە بیر نەچووەوەیە. بێ ئەوەی بچووکترین پرسیارێکم لێ بکا، منی دەستەمۆ و تاقیکردبۆوە. تەنانەت پێموابوو کە دەستی گەیوەتە نێو ناخی دڵ و دەروون و گیانیشمەوە و ئاگای لەوانیش هەیە و هەر بۆیەشە من بەو مرۆڤە نایابە شایستە نازانێ کە دەیهەوێ، بەڵام ئەوەندە هەیە کە بەجێی دڵنیایی و راست و دروستی خۆی دانابووم. منیش ئەوەندەم بەس بوو.

دوای ئەوەی ئەو باسی تەواوی حاڵ و باڵی خۆی کرد و من تێگەیشتم مرۆڤێکی خانەدان و رەسەنە. ئەوجا بۆم دەرکەوت بۆ حەز ناکا لە چ جێیان دابمەزرێت و یا بۆ دەیهەویست هەمیشە ماڵەکەی سەربەخۆ بێت. دەو دوو هۆدانەدا ئەو شاژنی ماڵە خۆی بوو تا هەرکاتێ ویستی کێ بانگهێشت بکات و یا هەر کاتێ ویستی بە تەنیا دەگەڵ بیر و ئەندێشە و بۆچوونەکانی خۆیدا بژی و دەگەڵیاندا تەك بێتەوە. بە درەنگەوە زانیم کە تەنانەت ماری جۆزێف و یا باوکی گیانی، قەشەی کەنیسەی کاسۆلیکانیش نەیانتوانیوە ئاوا وەك من سەربەخۆ و بەبێ مۆڵەت و فەرمووکردن هەرکاتێ بیانهەوێ بچنە ژوورەکەی و تێیدا بێن و بچن.

شەوێکیان ماویس گوتی لە بەر ئەوەی بە ڕێکوپێکی بۆ پاکانە و ددان پێدانانێ گوناهان ناچێتە کەنیسەی قەشەی زۆر لێ دڕدۆنگ و تووڕەیە.

"دە تۆ وەرە سەیرێ. هێندێك شت دە ژیانی ئادەمیزادیدا هەن کە ناتوانی تەنانەت بە قەشەشی بڵێ و منیش حەز ناکەم بە هەڵخەڵەتاندنێی گوناحێکی دیکەش لە گوناهەکانم زیاد کەم. بۆیە زۆر بە کەمی بۆ ددان پێدانانی گوناهانی دەچمە لا. ئایینزایی کۆت و بەندێکی سەخت و دژوارە. و من ناتوانم هەرچی رێ و شوێنەکانیەتی هەمووان بەجێ بگەیەنم."

ئایا مەبەستی لە هەڵخەڵەتاندنی قەشەی چییە؟ ئایا مەبەستی لەوێ بوونی منە؟ بەڵام ئەمەیان چۆن دەبێ. خۆ من لە ئاشنایەکی سادە بەولاوە زیاترنیم. بۆیە پرسیم:

"چۆنا و چۆن و لە چ ڕێیەکەوە و بۆ قەشەی هەڵخەڵەتێنی؟"

"ئاخر هەمیشە دەژیانی ئادەمیزادیدا شتگەلێك هەیە..."

و ئەوە یەکەمجاری بوو ڕوو لە وەڵامی ڕاستە و ڕاستی من وەرگێڕێ.

لەوانەیە پێتان وابێ کە من بەردەوام دەچوومە سەردانێی و هەموو دەمێی لەلا بووم.

کەچی من تەنیا هەفتەی دوو جارانی دەچوومە لا. زۆر جارانیش هەروا کەمتا کورتە شتێکی وەك شووشە شەڕابێك یا سەبەتە میوەیەکی بچکۆلانە یا زەرفە خواردنێك یا شتێکی ئاوا لەم بابەتانەم دەگەڵە خۆمدا بۆ دەبرد و دەگەڵ نانی ئێواریماندا دادەنا. جاری واشبوو هەروا تەنیا دەستەگوڵێك، و دەو وەختیدا پەیکەرە چینیەکەی بە ناسکیەکی تایبەتیەوە بۆ دواوە پاڵ پێوەدەنا و دەیگوت:" بڕۆ... بڕۆ چووکەڵەکەم. ئیدی لێرە جێت نابێتەوە و ئێرە جێی تۆ نییە." و زۆر بەتایبەتیەوە کاتێکی زۆر بە ڕێکوپێك خستنی گوڵەکانەوە خەریك دەبوو. کە دەوکاتانەدا ئامادە کردنی نانی ئێوارەکە بەمل مندا دەهات و خۆ ئەگەر واش نەبووایە ئەوە شامەکەمان هەر بریتی بوو لە هەمان شۆرباو و لەتەنان و میوەکە و لەبەر منیش فنجانێك قاوەی دەهاتە سەرێ و هەرگیزیش ڕێی نەدەدا من قاوەکە لێنێم. بەڵکە هەر بۆ خۆی بە داو و ناوێکی تایبەتیانەوەی لێدەنا و بەراستیش تامو بۆن و بەرامەکی خۆشی هەبوو. ئەوجا منیش جگەرەیەکم دەدایە و هەردووکمان پێکەوە لە نزیك پەنجەرەکەوە دادەنیشتین و جگەرەمان دەکێشان و سەیری کۆڵانێمان دەکرد. ڕۆژێکیان پێمگوت:

"ماویس کێ ئەو ناوەی لە تۆ ناوە؟"

"دایکم حەزی لێبوو ناوێکی ئینگلیزیم لێنێ. باوکم ئەم ناوەی لێنام."

"هیچی وات لەبیرە لە کوێ لە دایك بووی؟"

"نزیکەی سیی میل دوور لە لەندەنەوە (شوێن و بارودۆخی ئەوێی هەموو تاوتوێ کرد، و من دەستبەجێ جێیەکەم ناسیەوە. بەڵام حەز ناکەم لەوە زیاتر هیچی دی دەربای ئەوێ بنووسم. چونکە نامهەوێ ناسنامەی باوکی دەرکەوێ)



دایکم زۆر جارانی ئەوێ بۆ باسکردووم کە چۆن لە دەروازەیەکی سپی گەورەوە کە هەرچوار دەورەکەی چیمەنکاری و پڕ بوو لە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ دەچوینە ژووریٚ و تا بە خانووێکی ڕەش و سپی پێنج گۆشە دەگەیشتین کە هەیوانێکی هەرواى بەکۆڵەکانی لە پێش بوو و هێشووە گوڵە سپی و وەنەوشەکانی تالێوی هەیوانێ دەهاتن و لەوێڕا دەهاتنەوە و شۆڕ دەبوونەوە.

"دایکم دەیگوت کە لەوێ زۆر بەختیار و کامەران و خۆشبەخت بووە."

"ڕەنگە بتوانین ئەوێ بدۆزینەوە."

هەندێ جار ناچارم دەکرد گۆرانیم بۆ بڵێ. بەڵام زۆر جاران بە سەرزەنشتەوە خۆی دەبوارد و نەیدەگوت، کەچی من دڵنیا بووم لەوەی کە بە تەنیایە دەیانڵێ و کاتێکیش کە هەروا سەربەخۆ ملم لێدەنا و دەهاتم لە پشت دەرکێوە رادەوەستام و گوێم هەڵدەخست. بەڵام ئەو نەیدەویست گۆرانیم بۆ بڵێ و دەیگوت:

"گۆرانی بۆ کاتی تەنیاییەیە. کاتێ کە من و تۆ پێکەوە بین قسان بکەین چاکترە، وەنا؟"

ماوەیەك بوو بێژەی "ئاغا- کاك -"ی وەلا نابوو و هەروا بە سادەیی بە "تۆ"ی بانگ دەکردم و دەیدواندم. چەند جارێکانم بە مێشکیدا هات کە ئەو ناوی ڕاستەقینەی من نازانێ. هەرگیز پرسیارێکی دەربارەی من و ژیانی من نەکرد، دەحاڵێکدا من ورد و درشتی ژیانی ویم پرسیار کرد بوو.

## ١٠

کۆتایی وەرزی بەهارێ بوو و تا دەهات هاوین نزیکتر دەبۆوە و تا گەرماتریش دەبوو من لەو ماڵەی نارەحەتتر و ناڕازیتر و بێزارتر دەبووم. کۆڵانەکان تەنگەبەر بوون و لۆرییە پڕ لە بارەکان بەردەوام لە فابریقەکانەوە دەهاتن و دەچوون و هەدا دانیان نەبوو.

غلۆر کردنەوەی بەرمیلە بیرە بۆ بارەکان لە لایەکەوە و بۆن ماسیی سوورەوەکراویش لە لایەکی دیکەوە لە تواناداا نەمابوو. مرۆڤ سەیر دەکا کە وورووژانی

هەست و نەستەکان و ئەوین و دڵداری دەدەوروبەرێکی وادا یەکجار مەحاڵە. بەڵام کاتێ کە دەگەیمە نهۆمی سێهەمی ماڵێ وی لەم دنیایەوە دەچوومە دنیایەکی دیکەوە و لە هەموو شتێك دادەبڕام.

کاتێ کە دوو هۆدەکەی ماویس چۆڵ بوو، زۆر دڵگران بووم کە داخوا کێ بەکرێیان دەگرێ و کێیان دێتە ناوێ، کەسایەتیە ئەو کەسانە بۆ وی گرینگ بوو کە دەبوونە هاوسێی.، بەڵام بە ڕێکەوت ئەو ژن و مێردەی کە هاتنە ئەوێ پێدەچوو کە کاریان بەسەر کاری هیچ کەسێکەوە نییە و ڕێی هات و چوون و سەردانێ منیشیان نەدەگرت و هیچ جۆرە پەیوەندییەکی هاوسێیەتیەشیان دەگەڵ ماویسیدا چ چاك و چ خراپ نەبوو. تەنیا جارێك نەبێ لە سەر پلیکانان تووشی پیاوێکی جحێڵ بووم کە بەوپەڕی ڕێزەوە شەوباشی کرد و تێپەڕی.

ماویس زۆر بە کەمی لە ماڵێ دەچووە دەرێ. بەبێ سەرپۆش سەبەتەی تاو دەدایە و بۆ کڕینی پێویستیەکانی کە بریتی بوون لە نان و هێلکە و میوە و سەوزەوات دەچووە خوارێ.

دەگەڵ نەبوونی و دەست کورتیەشدا سەلیقەیەکی جوان و تایبەتی دەشت کڕینێدا هەبوو. بۆ نموونە بۆ کڕینی نانێکی برژاوتر ڕێیەکی دوورودرێژتری دەبڕی و هەر لەو نانەواخانەیەشی بیستبوو کە کەسانی دەرەکی و کۆچبەرانی دوای جەنگ دەو گەڕەکەیدا زۆر بوون و هەن. بەڵام ئەو هەرگیز دەگەڵ کەسدا نەبووە ناسیاو و ئاشنا. هۆیەکی دیکەی چوونە دەرێشی، کارە دەستیەکانی و درووماکەی بوو کە بۆ کڕیارەکانی دەبردن. کارەکانی تا بڵێی ناسك و جوان بوون و سەرنج ڕاکێش، کە زۆربەی کاتەکان سەرقاڵی تەماشا کردنێیان دەبووم و ئەو پێدەکەنی. جاروبارە شیعرگەلێکی گاڵتەجاڕی و جەفەنگ ئامێزی دەخوێندنەوە و لە یەکێك دەو دەموساتانەدا بوو کە بۆ یەکەمجار ماچم کرد.

لەوانەیە باوەڕ نەکەن کە من سێ مانگ زیاتریش بوو دەمناسی و دەچوومە ماڵی و هاموشۆم دەکرد کەچی هەرگیز جارێکیشم بیر لەوەی نەکردەوە دەئامێزێی گرم. ماویس



کیژۆڵەیەکی هەروا سووك و جڕپنۆکە نەبوو و مرۆڤ نەیدەتوانی هەروا بە سووك و سانایی دەئامێزێی گرێ و ماچی کا. دەترسام بڕەنجێ و تووڕە ببێ، چونکە دڵنیا بووم خوو و خدەیەکی توند و ئاورینی دەناخیدا شاردرابۆوە کە لەوانە بوو وای لێبکا هەموو کارێکی بکا و منیش ئەو سەردان و یەکتر دیتنانەم هێندە لەلا خۆشەویست بوون کە نەمدەوێرا لە پێستی خۆم بجوولێمەوە و نەوەکا ئەوانە هەموو لە دەستدەم.

هەندێ کات کە لێم نزیك دەبۆوە، یا لە کاتی غەمباری و دڵگیریە و پەستبوونێدا بۆ دڵدانەوێی هانای بۆ دێنام. تەواوی هەموو گیان و لەشم خۆزگە و حەز و ئارەزووی ئەوەیان بوو لە باوەشێی بگرم و دەستی بە سەریدا بێنم و دڵی بدەمە، بەڵام نەمدەوێرا.

تا ئەو شەوە تایبەتییە هاوینەی کە سەبەتە میوەیەك و هێندێك گوڵی سوورم بۆ هێنا بوو دیتم ڕەنگی پەڕیوە و سیس و ژاکاو دیارە. ئەو هەموو دەمێ خۆی دەژوورێدا قەتیس دەکرد و هەر خەریکی تیك و دروومان و ئیشکردنێ بوو. هەروا کە دەتەماشا و سەیر کردنێ ئەو ڕەنگە مانگە شەویەی ویدا خۆم لێ ون ببوو جڵەوی خۆڕاگرتنێم لە دەست دەرچوو، دەئامێزێم وەرێنا و ماچم کرد. هەروەك چۆن هەزاران هەزار جارم هێنابووە بەر چاوی خۆم، هەروا وەك پەرییەکی ناسك و سووکەڵە هاتە باوەشمەوە، وەك غونچێکی قژەکانی بەسەر یەخەی چاکەتەکەمدا دەخزی و ئاڵۆز دەبوو دەو دەمیدا سەری بۆ دواوە بردەوە، ڕاست وەك گوڵێکی کە بە سەر لاسکەکەیدا لار دەبێتەوە... بە سینگی خۆمەوە راموسی. سەرەتا زۆر بێحاڵ بوو دە باوەشێمدا، دوایەش وەك یەکێکی وردە وردە بێتەوە سەرەخۆ دەستی دەگەردنێ وەرێنام و هەر ماچێکی بە ماچێك وەڵام دەدایەوە و لەبەر هەموو مژین و گوشین و دژوارییە ماچەکانی منی خۆڕاگرت. ئەوەتا منیش بێهودە خەریکم و هەوڵدەدەم وردەکاریەکانی ئەو ڕۆژە تاوتوێ دەکەم.

بۆ خۆشم چاکم لە بیر نەماوە. تەنیا ئەوەندەی دەزانم کە تاریکایی داهاتبوو، ئەو گوڵە سوورانەی کە بۆ خۆشم هێنابوومن هەمووی بە سەر مێزەکەوە پەرت و بڵاو ببوونەوە و من... دەحاڵێکدا کە دەبوو لە جێی باوکی بوومایە ئەو بوونەوەرە

ناسکەم بەو قژە خۆڵەمێشییەیەوە دەئامێز گرتبوو. دوایەش دامنایەوە و ئەویش پاڵی وەمێزەکەوەدا. چاوەکانی دەزەوییەوە بڕیبوون و پەنجەی بە لێواری مێزەکەدا دێنا. بانگم کرد:

"ماویس."

وەڵامی نەدایەوە. چەند چڵە گوڵێکی خڕ کردنەوە و لە روخساری نزیك کردنەوە و ئەو دەمی دیتم کە دەگریا.

"ئای ماویسی خۆشەویستم، ئەوە بۆ دەگریەی؟"

"ئا... هیچ نییە..شتێکی وا نییە، بەڵام ئاخیریەکەی وای لێهات."

"بۆ پێت ناخۆشە؟"

"نا نا، بەڵام.. لە ئێستاوە هەموو شتەکان دەگۆڕێن."

"باشتر. باشتر."

"کێ چووزانێ."

زۆر نارەحەت ببووم. نەمدەزانی چ بڵێم. لە ناکاو رووی تێکردم و گوتی:

"با واز لەوە بێنین و لە بیر خۆمانی بەرینەوە. وەرە با وەك جاران "من" و "تۆ" ئاگرەکە خۆشکەینەوە و چێشتێکی بۆ ئێوارێ لێنێین و واز لە کولۆکۆ و هەڵچوون و داچوون و هەست ورووژانە بێنین و لە بیریان کەین."

"زۆر چاکە. چۆنت پێ خۆشە با وابێ."

ئاگرەکەمان پێکردەوە و من دەستم کرد بە شام ئامادە کردنێ. پێموابوو هەروەك جاران ماوەیەك خۆی بە رێکخستنەوەی گوڵەکانەوە مژوول دەکا بەڵام ئەو هەمووی پێکەوە خڕکردنەوە و هەروا هاویشتنیە ناو گوڵدانەکەوە و هاتە تەك سۆبەکە دەحاڵێکدا کە لەرزەیەکی دیاری بە هەموو لەشیەوە دیاربوو دەستەکانی بە ئاگرەکەدا داگرت.

"ئای. ماویس. ئەوە چتە؟"

"هیچ، هیچ، بەڵام ئەو هەڵچونانە ترسناکن. وەك بڵێسەی ئاگر هەموو شتێکی دەسووتێنێ."



"باشتر، من هیچ باکێکم نییە و ناترسم."

"بەڵام من، من زۆر دەترسم."

"بە تەنیشت سۆبەکەوە دانیشت.

## ١١

هەروەك ئەو پێشبینی دەکرد، لە دوای ئەمەوە، هەموو شتەکان گۆڕان. بەڵام گۆڕانەکە بە تێکڕای هەموو شتەکانەوە دیار نەبوو. ئەو دەمانەی کە پێکەوە بووین وەك جاران چۆن بووین هەروا دەژیاین و وەکو خۆی دەچوومە سەردانێی و پێکەوەمان شام دەخوارد.

لێرەدا چەند وشەیەك بۆ روونکردنەوەی زەینی خوێنەر پێوستە تا بزانن ژنەکەی من ئەو دیار نەبوون و ونبوونانەی منی چۆن وەردەگرت. ئەو وای بۆ دەچوو یا بە لایەوە وابوو کە من بۆ پارێزگارییە ئەندامەتییە خۆم دەچمە ئەو یانەیەی کە تێیدا ئەندام بووم و هەفتەی سێ جاران لەوێ نانی ئێوارێ "شام" دەخۆم. راستییەکەشی بۆ هێشتنەوەی ئەندامیەتییە خۆم هەفتەی جارێکیشم سەر لەوێ هەر دەدا و شامێکم هەر لێ دەخوارد. بەڵام هەر چونێکیش بوو ئەو دیار نەبوون و نەچوونەوانەی منیش ژنە و کچەکەمی نارەحەت نەدەکرد و بە خەیاڵیان دانەدەهات و بە تاسەی دیداری منەوە نەبوون. ژیانی وان لەوەی رێکوپێکتر بوو هەست بە دیار نەبوونییە من بکەن.

هەروەك لە پێشەوە گوتم کە ژیانەکەی مە هەروەك جارانی خۆی پێکەوە بەردوام بوو.

بەڵام ئێمە وەك پووش و پەلاشێکی دەم رووبارێکی گەورەبین. لە سەرەتاوە لە سەرخۆ و دوایەش دەگێژاوێکی توند و سەرسام هێن پێکەوەی دەگەڵەچە خۆیدا. کە خوا هەر بۆ خۆی دەیزانێ بۆ کوێ، بۆ ئاسمانێ یا بۆ خەرەندێکی قوڵمان راپێچ دەکات.

دوای شام خواردنێ زیاتر پێکەوە دادەنیشتین و ئەو جارجارێکانی سەری بە قۆڵی من دەکرد.

قسەمان دەکردن و پێدەکەنین. هەرکاتێکش دەهاتە باوەشمەوە زیاتر دەدوا و زۆرتر پێدەکەنی. وەك ئەوەی بیەوێ بەوە بەرگری لە خۆی بکا، و یا لەم رێیەوە هەست و نەست و جۆش و خرۆش و هەڵچوونە پڕ کەفوکوڵەکانی داپۆشێ و لە خۆیان دوورخاتەوە.. بەڵام هەر چۆنێکیش بوو هەر کاتێ دەباوەشێم گرتبایە و دەئامێزێ خۆمم وەرێنابایە بەبێ مەکە و لاچۆ و چەند و چوون تەسلیم دەبوو. من لەو هەموو خۆشەویستیەی نەك هەر تەنیا چێژم وەردەگرت بەڵکە شانازیشم پێ بە خۆمەوە دەکرد. ئەو بۆ من هەموو لە هەمووی تێکڕای ئەو شتانە بوو کە دەژیاندا بە تاسەیانەوە بووم.

ئەو جیاوازی تەمەنەی نەهێشتبوو کە لە نێوانماندا بوو. منی کردبۆوە لاوێکی سەرتاپا پڕی حەز و ئارەزوو و تاجەگوڵی دابوو لە قژی کار و سەرکەوتنەکانم. ئێوە نازانن رۆژانە بە چ دڵ و دەروون و هێز و توانایەکەوە دەچوومە دایەرە. ئێمە بۆ یەکتر دەژیاین. چەند جارانم پێشنیار بۆ کرد تا خانوێکی دیکەی بۆ بگرم و ماڵێکی دیکەی بۆ دانێم و مەسرەفیشی بکێشم بەڵام هەموو جارێك ئەو زۆر بە لووت بەرزیەوە و بە شێوەیەکی زۆر نارەحەت و رەنجێکی بێ پایانەوە بێدەنگ دەبوو.

و کاتێ کە ئەو وابێدەنگ دەبوو و بیر و خەیاڵی لە دنیای من دوور دەخستەوە، لێی دەترسام، و نەمدەتوانی ئەو بێدەنگییەی تێك بشکێنم. بەڵام ئەو بە ورکێکی تایبەتیەوە دەیتوانی تا هەتایە بێدەنگ بێ و ویست و خواستەکانی من وردوخاش کات و بە پێچەوانەی حەز و ئارەزوو و ئومێد و ئاوات و خۆزگەکانی منەوە بە و جۆرە بێتە مەیدانێ زۆرانبازییە. هەر بۆیە من لەم بارەیەوە ئیدی چ قسەیەکم نەکرد بەڵام دەمزانی کە ئەم ژیانە ئاوا بەردەوام نابێ و پێویستە دەستبەجێ بگۆڕدرێ، بەڵام بەداخەوە ئەو نەیتوانی تێبگا.

بەڵام من هێندە دەو بیر و خەیالانەوە راچوو بووم کە هەندێ جاری ئەو ئالۆزی و پەشۆکاویانە خۆم پێ رانەدەگیرا و ئەو پەشۆکاوییە تووشی ئیرەییەی کردبووم. دەترسام ئەوم لە دەست دەربێنن و ئەو دەمی بە لە دەستدانێ وی رووناکی ژیان و



نرخی ژیانێشم لە دەست بچێ و بە دڵنیاییەوە ئەو دەمی بار و دۆخ و گوزەرانی ژیانی من هەزار هێندەی پێش دیتن و ناسینی وی خراپتر و ناهەموارتر دەبوو. ئەو دەمی ئەو ترس و لەرزە دەبووە هۆی ئەوەی کە زۆر بە تاسەو هەڵچوونێکی دڕندانەی زیاترەوە باوەشی لێدەم و دەئامێزێی گرم.

هەموو کارەکانی شاعیرانە و بە سەلیقەیەکی تایبەتییەوە بەند بوون. زیاتر شیعری جوان و ڕێکی بۆ دەنووسیم. رۆژێکی کە چوومە سەردانێی سەیرم کرد هەر لەبەر دەرکێوە ئەوە رێییەکەی بە پەڕەی گوڵی سوور نەخشاندووە و ئەو رێی گوڵبارانەی منی بردۆتەوە ژووری نووستنێ و لەوێشەوە دەیبردمەوە سەر چارپاەی نووستنەکەی و لەوێش بۆ خۆی کە چەند غونچە گوڵێکی لە خەرمانی قژە زێڕینەکەی دابوو چو بووە دەپڕخەی خەوێکی قووڵەوە.

من، هەم لەو و هەم لە ژیانم دەپرسی، و هەم لەو وهەم لە ژیانیش دەترسام. هەروەك چۆن ئەو ئارامییەکی تەواوی پێ بەخشیبووم و هەموو شتێکی لەبیر بردبوومەوە واشدە بوو بە ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆرەوەی دەتلاندمەوە. فریشتەش بوو و شەیتانیش. شیرینیش بوو و بێ بەزەیش. چاکی و خراپیەکەی جمکێکی پێکەوە زابوون. لەو چاکیانەی و لەو خراپیانەی کە لێم دیتبوون و یا مەزەندەم دەکردن دەترسام و تۆقیبووم.

## ١٢

سالێکی رەبەق ژیانمان ئاوا بەسەر چوو. من دەتوانم ئەوەی بڵێم کە پەیوەندییەکانی مەکاملترین جۆری پەیوەندی نێوان ژن و مێردێك بوو. من باوەڕم وایە و هێشتاش هەر لە سەر ئەو بیروباوەڕەم کە من هەرگیز گوناهێك بەرامبەر کەس نەکەم. ژنەکەی من گەرچی پێویستی و کارە مادییەکانی منی ئەنجام دەدا و کەمایەسییەکانی پڕ دەکردنەوە بەڵام هەرگیز دەبیری مندا نەبوو. ئەو وایدەزانی مادامەکی جلەکانم بۆ دەشوا و ئوتوویان دەکات و چێشتێم بۆ لێدەنێ ئیدی هەموو

شتێك تەواوە و هیچ نەماوە ئەنجام نەدرێ. وام بیست کە ئەگەر جارێك لە جاران پێویستی کردبێ باسی دیار نەبوون و نەهاتنەوەی منی کردبێ گوتوویەتی:

"ئەو مێردەی من هێندە سەرقاڵە" (هێندەکەشی وا بە سەر زمانی دادێنا) تا وای پێشاندا کە من کەسێکی زۆر گرینگم و بەلانی کەمەوە سەرۆکی چەندین کۆمپانیام و چەندین کارخانەم بە ملەوەیە و یان دەیگوت: "ئەو مێردەی من هەرگیز حەز لە سەردان و هاموشۆیە ناکات و ناچێتە چ جێیان"

پێتان وانەبێ بەو قسانە دەمەوێ گلەیی و گازاندان لە ژنەکەم بکەم. (ئەگەر گلەیی و گازەندەیەکیش هەبێ) ئەو ژنێکی زرینگ و کابانی چاك و خاتوونی ماڵە و من هەمیشە ستایشی ئەو شتانەییم کردووە و هەر دەشیکەم بەڵام کەسێکە یەك دەندە دیکتاتۆر و نەسەلمێن و ئەوەی ویستی و بڕیاریدا هەر ئەوەیە و بەس هەرگیز لە بۆچوون و رای خۆی نایەتە خوارێ و دەستبەردار نابێ. ئێستاش قژی هەر لەسەر شێوەی بیست ساڵ لەمەوپێش دەبڕێت و دایدێنێ و پێیوایە کە قژ کورتکردنەوە و رێك و پێك کردنی کارێکی بێ مانا و کات بە فیڕۆ دانە.

گریس پرچەکانی تا بلێی توند و بەند بۆ دەهۆنێتەوە و وای بۆ شەتەك دەدا هەرچی جوانیەکە لێی دەبڕێ.

ئەو هەرچی بیویستبایە لە منی دەستاند. هەر لە کرێ خانوو و قەرزی موغازە و پارەی خزمەتکار و بە کورتیەکەی هەرچی ماڵ بیویستبایە، لەوەندە مووچەی بەرکی خۆمی دەستاند کە ئەوەش تێکڕای هەموو مانگانە و مووچە و بەراتەکەم بوو، بۆیە من بۆ خۆم لە بارەی ماددییەوە گوزەرانێکی وام نەبوو دڵی پێ خۆشکەم و توانای هیچ ئەندازە پاشەکەوتێکم نەبوو. ئەیوا دەیگوت:

"پاشەکەوت بۆچی؟ ئەگەر خوانەکردە تۆش شتێکت لێهات ئەو پارەی میراتەکەی باوکم بەشی من و گریس دەکات و ئەگەر خوانە خواستە مردیشی ئەوە پارەی بیمەی ژیانەکەی تۆشمان هەیە و پەکمان ناکەوێ."



ئەو هەرچی کاغەز و پەڕەیەکی پەیوەندی بە بیمەوە بایە دەگەڵ پەڕەوکاغەزە گرینکەکانی دیکەی دەسندووقێ دەنا و سەری دادەخست و دەوێیدا هەڵدەگرت. هەر لە دەفتەری حیساب و ڕەسید، و پسوولەی دیبەوە هەمووی، هەریەکەو جێی خۆی هەبوو. بەوەیڕا دیارە کە چ ژنێکی رێك و پێك بوو. بەڵام بەلانی خۆشەویستی و دۆستایەتیەوە، هەرگیز نەدەکرا دۆستی بی و دڵنیاشم کە گریسیش خۆشی نە دەویست و هەر تەنانەت رێزی لێدەگرت و هیچی دی. ئەویش ئەوەندەی بەس بوو. دە پایز و زستانێدا ئێمە خۆشتر بووین، چونکە دەگەرمایەدا هەر دووکمان هەستماندەکرد حەزمان لە چوونە دەرێیە، پیاسەی بکەین و هەوای پاکی دوور لە کۆڵانەکانی"ئارتیستۆ" کەناوی ئەو گەڕەکە بوو، هەڵمژین. کە چی لەمبارەیەوە هیچمان نەگوت و هەر کاتێ تینی گەرما و بۆنی ماسیی سوورکراوە و بیرە لە توانا دەردەچوو هەر دووکمان دەکەوتینە بیری ئەو ماڵە لادێییەی شوێن لە دایك بوونی ئەو کە جێیەکی واڵا و سەر سەوز و پڕ هەوای پاك بوو. شەوێکیان هەروا بە بێدەنگیەوە دانیشتبووین. لە پڕ ئاوڕێکی بەلای مندا دایەوە و گوتی حەزم لێیە ئەگەر بۆ جارێکیش بووە ئەوێ هەر ببینم.

حەزمدەکرد پارەیەکم هەبایە هەر ئەو دەمی ماویسم هەڵگرتبایە و لە ئینگلتەرەی وەدەرکەوم و بڕۆم. وەك ماویس بیر و خەیاڵەکانی منی خوێندبێتەوە.گوتی:

"چەند خۆش دەبوو بمانتوانیبایە هەر بۆ جاریکیش بایە پێکەوە چووبانیایە ڤییەننای ئازیزم."

پایز هاتبوو و منیش هێندێکم داروباری سووتانێ بۆ پەیا کرد و شەوێکی کە لەبەر سۆبەی دانیشتبووین پێمگوت:

ئەگەر بمتوانیبایە هێندێکم پاشەکەوت کردبایە، وێستا کە تۆ ئاوات حەز لە چوونە ڤییەننایە هەڵمدەگرتی و راست دەمبردی ولەوێم دادەنای بەڵام بەداخەوە کە ئێستا هیچ دەدەست و بەرکی خۆمدا شك نابەم."

دەستبەجێ گوتی:

"کەواتە هەر لێرە دەمێنینەوەو پێکەوەی بە خۆشی و شادییەوە بەسەر دەبەین."

"بەلاّم لەوانەیە تۆ هەمیشە بەو جۆرە ژیانە و ئاوا هەڵنەکەی؟"

وەلاّمی نەدامەوە و هەروا چۆن کەلە سەر پشتیەکە دانیشتبوو و ئەژنۆیەکانی هەڵکێشابوونەوە و دەستەکانی تێوەرێنابوون. چاوی دەبلێسەی ئاگرەکەوە بڕیبوو، بێدەنگ بوو.

دووبارە پرسیمەوە:

"گیانەکەم وانیە؟"

"حەیف، کەس نازانێ."

"تۆ پێتوایە کە لەو ژییانەی پێکەوە تێیداین وەڕەز دەبی؟"

"کەس ناتوانێ پێشبینی بکا. خۆشیەکان خۆشبەزن و زوو رادەبرن. من ئەزموندارم.

بەلاّم بۆ من و تۆ... هێشتا زووە."

"ئایا ئەگەر ئەو رۆژە هات غەمێی لێ دەخۆی و بۆی بە داخەوە دەبی؟"

"ئەوەش بەوەوە بەندە کە چۆناو چۆن پێش دێت."

"جارێکیان گوتت تۆ ویست و خواستێکی تۆکمە و توندوتۆڵ و پتەوت هەیە، ئەوە راستە.

وائێستا من باوەڕ دەکەم."

"ئادەمیزاد هەندێ جاران دەبێ وابێ."

چەندین شەوە تۆفان و زریانان بەسەرتاپای بە بارانێ تەڕەوە دەچوومە ماڵەکەی. ئەو ژوورەی کە رووناکی بلێسەی ئاگرەکەی بێرو بەوێدا بلاّو دەبۆوە.. قابلەمەی شۆرباکە لە سەر ئاوری و مێزەکەش رازابۆوە. ئاه ئەوێ ماڵە من بوو. تەنیا ماڵێکی کە سەرم پێدا دەکرد. عیشق و ئەوینی من و دڵ و دەروون و خەزێنەی من لەوێ بوو، و بە دەنگێکی کە لە خۆشیان دەلەرزی وەك کەسێکی چاوەڕێ و ئارەزوومەند بە خێرهاتن و فەرمووی دەکردم.



شەوێکیان گوتی کە هاوسێیەکانی سەرەوە گواستوویانەتەوە و هەر پیرەمێردێك و کچ و زاوایەکەی بە تەنیا هاتوونەتە جێی وان.

"چووزانی؟"

ئەوەم بەلاوە سەیر بوو کە ماویس کەمتر ئاگای لە دەر و دراوسێیانەوە بوو، و ئەو باسەی چۆن و لە کوێوە دەزانی.

"کچەکەیم لە سەر پلیکانەکان دیت و دەربارەی ئاو و خەڵوز بردنە سەرێی لێی پرسیم. زۆر بە ئەدەب و زۆر لە دراوسێیەکانی پێشووتر چاکتر بوو."

" ئەدی مێردەکەی؟"

دیسانەوە هەستم کردەوە کە هەستی دڕکی ئیرەییەم دە دڵی دەچەقێ.

"نازانم. ئەو تەنیا گوتی کە باوکیشی هەر دەگەڵەواندا دەبێ و لەبەرەوەی پیرە دەبێ هەمیشە ژوورەکەی هەر گەرم بێ و منیش تێمگەیاند کە یا بۆ خۆی دەبێ ئەوکارەی بکا یا هەروا شتێکی بداتە کوڕیژگەکەی تا ئەو ئاو و خەڵووزەکەی بۆ سەرخات و کارەکەی بۆ ئەنجام بدا."

"خۆزگە تۆ دەتهێشت من ئەو کارانەم بۆ تۆ کردبان."

"نا.نا."

"ئاخر بۆ تۆ قورسە."

"ماوەیەکە من بۆ خۆم ئەو کارانە ناکەم وهەروا بە چەند پەناباتێك، ئەو کوڕیژگە ئاو و خەڵووزەکەم بۆ دێنێتە سەرێ."

"کام کوڕیژگە؟"

ئەو دەمی پێیگوتم کە کوڕیژگەیەك لە نهۆمی یەکەمدایە ئەو جۆرە کارانە بۆ ئەو و هەموو ئەوانیدیش دەکا.

من ئیدی هیچی دیم نەگوت و هەر دەبیری ئەو کرێچیانەی سەرەوەدا بووم و حەزم لێبوو بیانبینم و تا ئەوەم نەکردبایە دانەدەکەوتم و نەدەحەسامەوە.

ماویس بێ ئەوەی ئاگای لەو خەیالاّنەی منەوە بێ لە ناکاو گوتی:

"ئیدی تازه گوڵ پەیدا نابێ. بەڵکە ڕۆژێکی خواوڕاستان کردی بتوانین بچینە شوێنی لەدایکبوونم. ئەو جێیەی کە دایکم ئەوەندەی پێ خۆشبوو و داستانی ئەوین و دڵدارییەکەشی هەر لەوێ سەری هەڵدا و دەستی پێکرد. هەوەك داستانی ئەوینەکەی مە کە دەو کۆنە خانووەیدا سەری هەڵدا."

## ١٣

وردە وردە وام لێهاتبوو کە تەنانەت نەمدەتوانی بۆ تاوێك چیە شەوێکی لێ دووربم بەڵام ناچاریش بووم کە دەبوو جارجارە لەو یانەیە خۆم پێشان بدەم کە لێی ئەندام بووم و هەندێ شەویش لە ماڵێ خۆمان بمێنمەوە. چونکە بە هیچ جۆرێك نەمدەویست پەی بەو جۆرە مەسەلانە ببات و ببێتە مایەی بگرە و بەردە و کێشمەکێش وگلەیی و گازاندەی بنەماڵە و خاو و خێزانێ. یا ببێتە مایەی تێکچوونی ئەو بارو دۆخەی ئێستامان. ئەیوا لەوانە بوو و لە دەستیشی دەهات بێ چەند وچوون بچێتە"ئارتستۆ" سەر ماویس و چی خراپە پێی بکات و ئابڕووی بەرێ، جا بۆ خۆ پاراستنێ لەو پێشهاتەی زۆریم لە خۆم دەکرد هەفتەی چەند شەوێکان بچمەوە ماڵێ و رۆڵی پیاوێکی خاوەن ماڵ و حاڵ بگێڕم و وای دەرخەم کە شەوێکی ئارام و ئاسوودەم لە ماڵێ بەسەر بردووە. بەڵام هەموو دەمێ تەواوی بیر و هۆشم هەر بەلای ماویسەوە بوو کە داخوا دەوساتە وەختەیدا چ دەکات و زۆر جارانیشم لێ دەپرسی و ئەو دەیگوت:

"ئەڵبەتە ئیش دەکەم، دروومانێ دەکەم."

جاری وابوو باوەڕم دەکرد، بەڵام بە زۆری گومانـاوی بووم. دەڵێن جاری وایە عیشق ئادەمیزادی ترسنۆك دەکا، ئەو قسە دەربارەی من راستبوو چۆن دەبوو گومان لە ماویس بکات و هەراسان نەبێت؟ بۆیەش هەفتەی جارێکی دەچوومە ئەو یانە لەعنەتیە.دەڵێم لەعنەتی. چونکە لە راستیدا بە چوونەوێم ژنەکەمم هەڵدەخەڵەتاند و فریوم دەدا.



دوو هەفتە پێش ئاشنایەتیە ماویسی بە ئەندامی ئەو یانەیە هەڵژێردرابووم و خۆ ئەگەر یانەکەش نەبوایە ناچار دەبوو بە بیانووی پڕکارییەوە لە دایەرە بمێنمەوە کە بە دڵنیایشەوە ئەیوا هەر لە هەفتەی یەکەمەوە بەو درۆیەی دەزانی و هەموو مەسەلەکان ئاشکرا دەبوون، کەچی تا ئەمرۆ دڵنیام کە بچوکترین شتێك لەبارەی ماویسەوە نازانێ و ئاگای لەو خۆشەویستیەی من نییە بۆ وی و هیچی دەربارەی نازانێ.

هەندێ جار رووداوی بچکۆلە هەن دەمێشکی ئادەمیزادیدا دەمێننەوە. بۆ نموونە شەوێکی یەك شەممەیەك کە چوومە لای ماویس( وابوو یەك شەممان نەمدەتوانی لەماڵ دەرچم، بەڵام دەویەك شەممەیدا بەتایبەتی، ژن و کچەکەم سەرمایان ببوو و من پێشنیارم کرد کە بە تەنیا بچمە کەنیسەی) و لە جیاتی چوونە کەنیسەش زۆر چاوقایمانە هەرچی خێراتر بەرەولای ماویسەوە چوومە سۆراغێی. هەر کە گەیمە بەر دەرکێ سەرقاڵی ئاوازی گۆرانییەکی بوو دەیگوت و وەك سەدجارەم بێ راوەستام و کەوتمە چێژ وەرگرتنی ئەو دەنگە پاك و بێگەردو دڵنەوازەیەوە، بەڵام هەر بە دەرکە کردنەوێ ئاوازەکە بڕا و ئاوڕێکی بەلای دەرکێدا دایەوە و لە و دیدارە چاوەروان نەکراوەی من لە جێی خۆی راپەڕی و هاوارێکی خۆشحاڵیەی هاتێ و گوتی:

"وەرە... وەرە یاخوا بەخێرێی! ئای کە چاکت کرد هاتی!"

چوومە ژوورێ و دەرگاکەم داخستەوە و سەیرم کرد ماویس پاڵتۆ و کڵاوی پۆشیون. پرسیم:

"دەتهەوێ لە ماڵ دەرچی؟"

"بەڵێ، خەیاڵم وابوو بەڵام ئێستا با بە ئارەزووی تۆ بێت."

"دەچوویە کوێ؟"

"کەنیسە."

و سەری بەردایەوە و کەوتە یاری بە دەستکێشەکانی.

"منیش لەگەڵ تۆدا دێم."

"تۆ، تۆ دێیە کەنیسەی من؟"

"بەڵێ، وەرە با بڕۆین."

ناو کەنیسە گەرم و رووناك بوو. ئێمە تا میحرابەکە پێکەوە چووین و من بە تەنیشتیەوە ئەژنۆم دادان و دەگەورەیی و سامی ئەو جێیە پیرۆزەیدا نقووم بووم.

کەنیسە پڕ بوو لە ژمارەیەك خەڵکی هەژار و نەدار و کرێکار و ژمارەیەك خوشکانی گیانی کە هەموو لە هەموو بە ئاراستەیەکی تایبەتیەوە مژوولی نزا و پاڕانەوێ بوون. تەماشاکردنێ ئەو دیمەنە پڕشکۆیانە هەر بە راستی منیان بردبووە دنیایەکی دیکەوە. من نامەوێ وا خۆپیشاندەم گوناهبارم.

چونکە لە بابەت ماویسەوە، من هیچ گوناهێکم نەکردووە و ئەو رۆژانەش بە چاکترین و پاکترین و خۆشترین کاتەکانی ژیانی خۆم دەزانم.

ئەوە کارێکی هەروا ئاسان نییە کە ئادەمیزاد دەو دنیایەیدا بژیت و خەڵکی ئەو دنیایەش نەبێ. "ئەیوا" هەمیشە چاوەڕێی شتێکی وابوو لە من، ئەو منی لە هەموو خۆشەویستیەك و شتێکی زیندوو دابڕیبوو و دیوارێکی ئەستووری بە دەوردا کێشابووم و منیش ناچار بووم رێیەکی لەو هەموو دەوروبەرە تەنراوە بەو دنیایەی کە ئەو ژنە خۆشەویستەی لێیە پەیداکەم و بدۆزمەوە و ئێستاش کە عیشقم دەسینەیدا مردووە، تەنانەت ئێستاش کە ئیدی هەست و نەستەکانم بەرامبەری کەم بۆتەوە هەر سوپاسگوزارم و مەمنون و منەتباری ویم و هەموو ئەو بیرەوەری و بەختیاریەی کە بە هۆی وییەوەم بە نەسیب بوو، وەك خەزێنە و خەزنە و گەنجینەیەکی زۆر بە نرخ و تاهەتایە دە دڵمدا هەر دەمێنێتەوە.

من چەندین جارم گوتووە کە لە سەرەتای ئاشنایەتییەماندا دەگەڵەویم گومان هەبوو و لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ بەڵگەیەکی دیار و روون بە دەستەوە نەبوو، کەچی وام هەستدەکرد کە لەو دیوی ئەو هەموو لوتف و جوانی و ناسکی و میهر و خۆشەویستیەیەوە، شتێکی شاراوەی بێ بەزەییانەی نادیار دەقوولایی ناخی ویدا هەر هەیە.



بەڵام لەو شەوەوە بەتایبەتی بیرەوەرییەکی پاك و بێ غەل و غەشی ویم دەقوولاییە دڵیدا جێگیر بوو کە هەرگیز لە بیر ناچێتەوە.

کاتێکیش کە نزا و پاڕانەوە تەواو بوو و دەگەڵ ئەو خەڵکەی گەیشتینە بەربارانی کۆلانێ، ماویس قۆڵی دەقۆڵی هەڵکێشام و کۆلانە و کۆلانی بردم و رێ شاندەری کردم، تا گەیشتینە "ئارتیستۆ" و من چوومە سەرێ و بە تەك سۆبەکەوە دانیشتم تا کاتێکی سەیرم کرد وەختی رۆیینێیە و ناکرێ پارێزیە لە دەستدەی.

کەمتر دەرفەتێکی قسە کردنێ لەو دیدارە کورت و کەمانەدا هەڵدەکەون و ئێمەش پێکەوە دەست دەنێو دەستی یەکتردا کەوتبووینە ناو قووڵاییە بیر و خەیاڵەکانی خۆمانەوە و هەر کە هەستام بڕۆم دەستێکم بردە ژێر چەناگەیەوە، لێوەکانیم ماچکردن و ئەو بە سپایی گوتی: "شەو شاد خۆشەویستە ئازیزەکەم، خودا و هەرچی پیاو چاکە ئاگادارت بن و بتپارێزن."

## ١٤

هەروا بەم جۆرە رۆژەکان دەهاتن و رادەبردن و دەگەڵ ئەوەشدا کە من دە دنیای عیشق و ئەوین و دڵداری و خۆشەویستیدا دەخولامەوە، دیسانەوە جار و بارێك وام دەهاتە بەرچاو کە دنیایەکی خۆش و شیرینتر و دڵگیر تریش هەیە کە هەروا بە کەمێك هەوڵ و کۆشش و تەقەللا دەتوانرێ وەدەست بێت.

جاری وابوو ماویس دەگەڵ ئەو هەموو میهر و ناسکی و خۆشەویستیەیدا دەگەڵ ئەو دەورو بەرە هەژار و ئەو جێیەیدا تێکەوە دەگلا و دەشێوا و بێزار دەبوو تا لەو کاتانەدا بوو کە ئاگرێکم دە دەروون بەردەبوو زمانەی دەکێشا، کاتێ کە دەمدیت هەر تەنیا پارەیە ئەم مەتەڵە هەڵێنێ و ئەو گرێ کوێرەیە بکاتەوە و موعجیزان دروستکا و کەچی منیش نەمبوو. یا ئەوەی هەشم بوو هەر تەنیا بای شووشە شەڕابێك، قاپە خۆراکێك یا چەند بڕکە دارێکی سووتانێ بوو.

زۆر جاران دەربارەی ئەو نەخشە ئایدیا و خەونە سەوزانەی خۆمی دەگەڵدا دەدوام و ئەویش مات و بێدەنگ، زەردەخەنەیەك بەسەرلێوانەوە بە پەنجە ناسكەكانی، هێڵی خەیاڵەكانی خۆی بەسەر مێزەكەدا دێنا و گوێی شل دەكرد.

من سەرتاپای ویم دەئاوریشمی رەنگاورەنگ و پوولەكەی زێڕ و مرواری هەڵدەكێشا و ژوورەكەیم بە باشترین قاڵی و مافور و رایەخی خۆرهەڵات زەمینیّ بۆ رادەخست و بە قەندیلۆكەی زیوینم بۆ رووناك دەكردەوە، ئەودەمی تەختێكیشم لە عاج و زێڕی و روو پۆشێكی شینی گوڵدار بۆ دەرازاندەوە و بە بۆنخۆشترین عەترم دەرشاند، ئەوجا نایابترین شەراب و خۆشترین و بە تامویچێژترین خۆراك و خوادنەوەم لەسەر كورسی و مێزێكی سەندەڵ دەگوڵ و گوڵزاری سووری باغێكی پڕ لە تاوسدا بۆ دادەنا و بەكورتییەكەی هەروا دەنێو دنیای ئەو خەونانەدا تا ئەو جێیەی هێزو توانای بیر و خەیاڵ بڕی دەكرد لە دووم دەدا و دەگەڵە خۆمدا دەگوت.

ئەوانە بەلای منەوە گاڵتە نەبوو، ئەو شایانی تێكڕای هەموو ئەوانە و لە وانەش زیاتر بوو. خۆمن دەمزانی هەرگیزا و هەرگیز ئەوشتانە ئەویان لەوە جوانتر و رەعناتر و ناسك و شۆخ و شەنگ و دڵبەرتر نەدەكرد... ئەو لە هەموو ئەوانە بەولاوەتر بوو.

خۆ ئەو هەر تەنیا جوان نەبوو و بەس، ئەو شەقڵێكی پتەو و گیانێكی بەرزی ئەو تۆی هەبوو بەگژ دنیایەدا دەهاتەوە، هێندە قورس و سەنگین بوو.

پێموانیە توانیبێتم باسی عیشق و ئەوین و دڵداری خۆمم وەك پێویست بۆ كردبن تا ئێوەش بتوانن بەرجەستەی كەن و بیهێننە بەرچاوی خۆتان.

من تەنیا كەسێك نەبووم كە لە كون و قوژبن و كەلێن و كەلەبەری لەندەندا عیشقە گڕاوییەكەی خۆم دۆزیبێتەوە. بەلاّم من شەریك و برابەشم نەبوو دەو عیشقەیدا و هیچ كەسێك نەیدەتوانی لێم بستێنێتەوە. ئەوە هەر تەنیا خودی ئەو خۆی بوو كە دە سینەیدا ناشتم و هەر ئەویش بوو كوشتی و لە ناوی برد. بەلاّم تازە هیچ كەسێكیش ناتوانیّ و هێزی ئەوەی نییە بتوانیّ كە بیرەوەرییەكانی ئەو عیشقە بسڕێتەوە و لە ناخی ناخمەوەی دەربێنێتە، چوون ئەوە راستیەكی نەمرە كە من



دەگەڵە ویدا لەوپەڕی خۆشی و شادی و بەختەوەریدا بووم. و ئێستاش كەوا دەو خانووە دێهاتییە ناخۆشەیدا تاك و تەنیا، با و بۆران و گەردەلوول پەنجەرەكانی رادەتەكێنیّ و شەپۆلە هەڵچووە سەرشێتەكانی دەریا وەك كەرتكە كێوان هەڵدەچن و بەرز دەبنەوە و بەول او لایاندا پەرت دەبنەوە و بە شێوەیەكی وا كە سوێریەكەی دە زەوی و ئاسمانانـدا بە لێوەكانمەوە هەستدەكەم، دەگەڵ هەموو ئەو شتانەی كە رابردوون، هەر لە ژیانی تاڵ و ژار و دژواری گەڵ ئەیوایەوە تا ساتە خۆشەكانی دەگەڵ ماویسیم بەسەر بردن هەموو راستین و راستیەكی رووتیشن و تا هێشتاش هەر بەو ئاگرەوەی كە دەگیانم بەربووە دەژیم و دەسووتێم. هەر چەندە گڕ و كڵپە و بڵێسەكەشی دامردۆتەوە بەلاّم گەرمییەكەی هەر ماوە و تا هەتایەش هەر دەمێنیّ.

دە تەواوی ئەو ماوە درێژەی كە دەزیندانێدا بووم هەرگیز دڵم سارد نەبۆوە و نارەزا و هەراسان و بێزار نەبووم. چونكە هەر سەعاتێكی لەو سەعاتانەی گەڵ ماویسیدا هەموو ئەو شتانەی قەرەبوو دەكردنەوە و ناخۆشیەكانی دەسڕینەوە.

گەرچی من لە زۆر لایەنیەوە رەنگە پیاوێكی سووك و هەژار و بیّ دەرەتان بم بەلاّم سەركەوتن و بە ئاكام گەیشتنەكانم هەمووی كامڵ و تەواو بوون و پڕ بە حەزی خۆم بوون و ئەو سەركەوتن و ئاكامانەش كە من بەو نرخە گرانەم بە دەست هێنان تەنانەت لای خودی ماویسیش شاراوەیە و نازانیّ.

ئەوەی كردم بە چاوێكی كراوە و ویژدانێكی سەربەخۆ و ئازادەوە ئەنجام دراو دەگەڵ ئەوەشدا كە كۆمەڵگا منی توورِ هەڵداو بە چاوێكی سووكی روانیمیّ و سەیری كردم بەلاّم من دەگەڵ ئەو هیچ و پووچی و ناشایستیەی خۆمدا توانیم ئەو بوونەوەرە بە نرخ و گرانبەهایە بدۆزمەوە. و بیگەیەنمە لوتكەی سەركەوتن و دەركەوتن، بەهرەكانی دڵ و دەروونیم وەئاگا هێنان و پێشكەشی كۆمەڵگام كرد."

# ١٥

تا ئەم بەشەی بیرەوەرییەکانی رۆجەر دالتۆنم خوێندبۆوە. نیوەشەو شەق ببوو و سۆبەکە سارد ببۆوە، بەڵام من ئاگام لە راشکانی شەوێ و ساردبوونەوێ ژوورەکەی نەمابوو. شۆر و خۆشی وتاسە و کەفوکوڵی ئەو داستانەی هەموو گیانی داگرتبووم و چووبووە ناخمەوە. راستە کە وام دەهاتە بەرچاو کە رۆجەر زۆر رۆییوە و یەکجار قووڵ بۆتەوە و زێدە ڕۆیی کردووە، بەڵام نوسینەکان هێندە کاریگەر بوون کەئەوم دەخانووێکی بچکۆلانەی ماسی گریە دا بەرجەستەدەکرد و دەدیت و تەنانەت گوێم لە ترپەی لێدانی دڵیشی بوو، دەتوانم مەزەندەی ئەوە بکەم بە چ نەخشەو بڕیارێك، کەسێك کە تازە لە زیندانێوە هاتۆتەوە، تاك و تەنیا، هێندەشی ئاشنایەتییەکی وا دەگەڵ قەڵەمێدا نیە، ئەوانەی چۆن نووسیوە، بەڵام هێشتا هۆی ئەو دوور خرانەوە و زیندانییەیم نەدەزانی، دیسانەوە دەستم بە خوێندنەوە کردەوە:

"جەژنی لە دایکبوون هات و تێپەڕی، ئای چ وەرزێکی خۆش و دڵفڕێن بوو! چەندم دەتوانی سوود لەوکات و شوێنە وەرگرم و حەیف کە زۆر کەم نەبێ نەمتوانی سوودی لێ ببینم و تێیدا سەرکەوم.

لە شەوی جەژنێمدا بە ژنەکەم گوت، کە لە ماڵێ هاوڕێیەکی میوانم و درەنگ دێمەوە، پێویست ناکا چاوەڕێم بن.

ئەیوا بە سەر سامیەکەوە پرسی:

"کام هاوڕێ؟ لەوانەی ئەندامی یانە؟"

و بێدەنگیەکەی منی بە سەلماندنی باسەکە زانی و بەو هۆیەوە شەوی جەژنەکەم دەگەڵ ماویسیدا بەسەر برد. ئەوە یەکەمین جار بوو بە بیانووی جەژنێوە هەندێکم دیاری هەمەجۆر بۆ بردبوو و تەواوی لەندەنم بۆ هەڵبژاردنێیان ژێرەو ژوور کردبوو تا یەك جووت گوڵی ئەڵماس نیشانم بۆ پێڵاو و جووتێك گۆرەوی بە گوڵی رەنگاوڕەنگ چنراو و دەرپێیە تۆڕێك، و ملوانکەیەك و گەورەترین چەپکە گوڵێکی کە هەبوو و شووشەیەك شەڕابی تایبەتیم بۆ ئامادە کرد. ئەویش خەنجەرێکی یەکجار زۆر



کەونارای دەسك و مشتو زێڕی کە نووسینێکی لەسەر رەش کرابۆوە و کڕێنرا بوو دایە من و ئێستاش کە ئەوانە دەنووسم خەنجەرەکەم لەلایە و لە بەر دەستمدایە. چەندین جارم لە کالانێ دەرێناوە و سەیری تێغەکەیم کردووە و تاقیم کردۆتەوە و دە دڵی خۆممدا بیر کردۆتەوە... کاتێ ماویس خەنجەرەکەی دەدامێ گوتی: "دەستکاری مەجارستانە."

و نووسینەکەی سەر وی ئاوا لێك دایەوە"قووڵی داگرە."

دەو دەمیدا ماویس خەنجەرەکەی لێ وەرگرتم و لە جێی خۆی راپەڕی و لە بەر دەمی سۆبەکە لە بەرتیشکی رووناکی بڵێسەکان دەستی بە سەمای ئاگر کرد و ئاوازێکی کێویانەی زۆر کۆنی گوت. منیش دەستیم راکێشا و لە سەر هەر دوو ئەژنۆیەکانی خۆمم دانا، قەیتانی گۆرەوییەکانم پێوە بەست، قژەکەیم بە چەند لاسکە گوڵ رازاندەوە، لێوەکانیم ماچکرد و گوتم ئێستا دووبارە سەماکەوە. هەمدیس هەستایەوە و بەکەفوکوڵێکی بێ وێنەوە، شێتانە سەمای کرد و گۆرانی گوت و جارجاریش خەنجەرەکەی هەڵدەدا و هەر بە هەواوە دەیگرتەوە و دواییش هێنای لە سەر عەردی لە بەرپێی منی دانا و خۆی دەباوەشێ هاویشتمەوە. نانی ئێوارێمان خوارد و دوای ئەوەش بە سەنگینیەکەوە داستانگەلێکی دەربارەی جەژنی لە دایکبوون و سەردەمی منداڵی و دەورانی کچێنی خۆی و زەمانی دار و نەداری و هەژاریە، و زۆری دیکەی دەربارەی پاریس و ڤییەننا باسکرد تاشەو بەنیوە بوو و ئەو دەمی پاڵتۆ و کڵاوەکانمان پۆشین و بۆ نزاو پاڕانەوەی نیوە شەوێ چووینە کەنیسەی و جارێکی دیش من لەو شوێنە پیرۆزەدا هەموو شتێکم بیر چۆوە و کەوتمەوە ناو قووڵایی دنیایەکی پاك و خاوێن و بێگەردەوە.

کاتێکی کە لە کەنیسەی هاتینە دەرێ من هەستم کرد کە هاوبەشی راستەقینەی ژیانی من ماویسە. ئەمە ئەوە کە خۆشبەختی تەواوی بە من بەخشیوە، هەر ئەو بوونەوەرەی کە وەك هەموو ژنەسادەکانی دی نەبوو، پەری بوو، بوونەوەرێکی خەیاڵی و ئایدیالی بوو.

من ناچار بووم دەستبەجێ بگەڕێمەوە و تەنیا تا دەرکی ماڵێی دەگەڵ چوومەوە. شەوباشم لێکرد و بەپەلە بەرەو ماڵ بوومەوە. دە رێیەمدا یەك بڕیاری راشکاوانە دا. بڕیارێك کە دڵم گەرم و خوێنمی بە کوڵ دێنا. دەمهەویست بە هەر نرخێك بووە خۆم لە کۆت و بەندی بەندو باوان رزگار کەم و ماویسی بێنم و سەر لە نوێ ژیان دەست پێبکەمەوە. بەڵام ژنەکەی من کاسۆلیکیەکی دەمارگیر بوو و دەشمزانی کە کاسۆلیکیەکی دەمارگیر دەربارەی تەڵاقێ بیرو باوەڕی چۆنە!

## ١٦

رۆژی جەژنی لە دایکبوونێ نەمتوانی بچمەلای. ئەیوا بەرنامەی ئەو رۆژەی رێکخستبوو و ئەو رۆژەش هەرچەند جارێکی کە باسی تەڵاقێم وەبیر دەهاتەوە نەفرەتم لێدەکرد و بێزار دەبووم. شەوی رابوردوو ئەوکارەم زۆر بە سادەیی هاتە بەرچاوان بەڵام ئێستا... رۆیشتن دەگەڵ ماویسیدا کارێکی هەروا سادەوساکار نەبوو و دەبوو نەخشەیەکی رێك و پێکی بۆ دابڕێژرێ. لە هەمووشی گرنگتر پارە بوو. ئەوەی لە بانکدا هەمبوو نە دەگەییە پەنجا لیرە و دەشمزانی هەر کە لە لەندەن بچمە دەرێ لە هەموو کەس، لە ئەیواو لە کۆمپانیای بیمە دادەبڕێم و خانووە بچکۆلانەکەشم هەر لە دەست دەچێ و ئەودەمی دەبمە کەسێکی بێ ماڵ و حاڵ و بێ هاوڕێ و دۆست و ئاواڵ و پەڕبووت دەبم.

من نە شارەزای پاریس و نە هیچ شارێکی دیکە نەبووم و سەریشم لە هیچ کارێکی بەکەڵك دەرنەدەچوو تابەهۆیەوە خۆم بژیەنم.

ئەو بیرو خەیاڵانە تا دەهاتن دەقیقە بە دەقیقە نارەحەتیان دەکردم. هەر بەو ئەندازەی کە حەزم لێبوو لێدەم و بڕۆم، بە هەمان ئەندازەش لەو قومارەی دەترسام و غەمی ئەوەشم بوو نەکا دۆست و هاوڕێ و ئاواڵەکانیشم خۆم تێنەگەیەنن. مەزەندەی ئەوەم کردبوو کە ئەوان دەربارەی ماویس لەوانەیە چ بڵێن و هەر ئەو بۆچوون و مەزەندانەش شێت و هاریان دەکردم و نەدەحەجمیم. شەوی پێشێ، لەکەنیسەی،



دەحاڵێکیدا کە ماویس بەتەنیشت منەوە لەسەر ئەژنۆیان دەپاڕایەوە و نزای دەکردن، بەو بیرو باوەڕەوەی کە دەخۆمدا دەدیت هیچ گومان و دڵە راوکەیەکم دە دڵێدا نەبوو، بەڵام ئێستا هەموو شتەکان نەگونجاو دێنە بەر چاو.

## ١٧

جەژنی لە دایکبوونێ لە چەند رۆژێك زیاتر تێنەپەڕیبوو کە دەستی قەدەر و چارەنووس ژیانی مەی سەرتا پا ژێرەو ژوور کرد و گۆڕی. لە شەوی جەژنی بابا نۆئیل کە ماویس سەمای بۆ کردم و گۆرانی بۆ گوتبووم، من بە پێێ داگرتنێکی تەواوەوە حەزم لێبوو هەمیشە هەر بۆم بڵێ هەندێ جاران ملی دەدا و شتگەلێکی هەڕەمەکیانە و منداڵانە، یالە سەرەخۆ لایلایەیەکی دەلاواندەوە. رۆژێکیان پێمگوت:

"ماویس. من حەزم لێیە تۆ پڕ بە گەرووی خۆت و بەتەواوی دەنگتەوە گۆرانیم بۆ بڵێی. من دەزانم کە دەتوانی."

بریسکەی لە چاوانڕاهات و گوتی:

"چۆن دەزانی؟"

"ماویس. تۆ ئامادەگی و هونەرەکەت لە من دەشاریەوە. بۆ دەبێ وابێ؟ تۆ دەتگوت کە مەشقی دەنگیت نە خوێندووە و نەکردووە."

"ئێستاش هەروا دەڵێم کە نەمخوێندووە و نەمکردووە، یا هێندە کەمە کە شایانی باسکردنێ نییە.

ئیدی هەرچۆنێکە نایڵێم، چونکە نامهەوێ بیڵێم."

"باشە بۆ؟"

"بە تووڕەییەوە گوتی:

"ئەگەر ژنێك، ژنێکی جادووگەر، لە مەجارستانێ پێی گوتبم کە من خاوەنی دەنگێکی خۆشم بەڵام ئەگەر بیڵێم و بگاتە گوێی خەڵکی، و ئەو کەسەی کە خۆشمدەوێ، تووشی بەڵایەکی دەبێ، دەڵێی چی؟

"له خورافیاتانه."

"خورافیات؟ تۆ پێتوایه؟"

"هەر چۆنێکە حەز ناکەم تاقیکەمەوە."

"بە راستی چ خەیاڵاتێکە؟ ماویس دەنگت لە ڕادە بەدەرە."

"یەکجار واش نیە."

"دڵنیام، و تۆش هەر دەبێ بۆم بڵێی."

"نا. نا. زۆریم لێ مەکە."

"ماویس بۆ من قەیناکا."

"لەوانەیە یەکێك گوێی لێبێ."

"ئەو دەمی چ دەبێ؟ خۆ تا کەسێك نەیەتە پەنا دەرکێ گوێی لێنابێ و دەنگت نابیسترێ."

"وا دەردەکەوێ تۆ خۆت وات کردبێ."

"زۆر جاران."

"هەی جاسووس."

"ئاخر ماویس دەگەڵ منیش..."

"ئۆی خۆ ئەوە خەریکە بە شەڕ بێین، بیر بکەوە من و تۆ.. ئاگات لێیە کە جادووگەرەکە هەقی بوو."

"راستیەکەی بڵێ بزانم. ژنەی جادووگەر دەیگوت ئەو پیاوەی تۆ خۆشت دەوێ بەربەڵا دەبێ؟"

"بەڵێ."

"بەڵام ئەوە قەت نابێ. باشە تووشی چ بەڵایەکی دەبم و چم بەسەر دێ؟

تۆ پێتوانیە بەو هەموو عیشقەی کە بۆ تۆم هەیە، مافی ئەوندەم نییە کە داوایەکی ئەوتۆت لێبکەم؟"



ئەو حەزی لێنە بوو درێژە بە باسەکە بدات و منیش بڕیارم دابوو هەر پێی بڵێم. بۆیە هەوڵم دا خاڵێکی لاواز بدۆزمەوە، ئەو جا پێمگوت:

"ماویس. من بە منداڵی دەنگێکی خۆشم هەبوو و لە گەڵ تەراتیل خوێنەکان تەراتیلم دە کەنیسەیدا دەگوت. بەڵام دەنگم گۆڕا و نەما و من هەمیشە هەست دەکەم کە شتێکی بەنرخ و دڵخۆشکەرەیەکی گەورەم لە دەستداوە و لێم ون بووە و ئەگەر ئێستا دەنگم خۆش بوایە هێندەم هەست بە تەنیاییە نەدەکرد و بەخششێکم دەبوو و ئێستاش کە ئێستایە تۆ وەرە ئەو ناگوزووریەی پڕکەوە."

هێندەم گوت و گوتەوە کە پێم وابوو شل بووە. ئەوجا گوتم:

"هەر جارێکم بۆ بڵێ و لێمگەڕێ با غەمەکانم لەبیر بچنەوە."

قۆڵی دەقۆڵی نام و گوتی:

"بەڵێن دەدەی ئەگەر جارێکت بۆ بڵێم پێم نەڵێیەوە و زۆریم لێ نەکەی؟"

"ماویسی ئازیز، دەبیڵێ و ئەو هەموو کۆت و بەندو مەرج و بەڵێنانە دەکار مەخە، ئەوە ویژدان نیە وام دەگەڵ بکەی."

هەمدیسیش هەر دوو دەڵ بوو. لێی پاڕامەوە، دڵم دایەوە، تا وای لێهات تەسلیم بوو و خۆی رانەگرت. ئەوجا چووە پەنا سۆبەکەوە راوەستا و گوتی:

"من دەیڵێم و ئەگەر پێشهاتێکیش بوو، ئۆباڵ بە ملی تۆ"

ئەوجا رێك راوەستا و سەری کەمێك بۆ دواوە بردەوە و شەپۆلە ئاوازێکی دڵەنگێو و دەنگێکی هێندە ناسکی لە گەروویەوە دەرچوو کە من مات و خامۆش و هەوت و هێز و بێ جووڵە لە جێی خۆم چەقیم. دەتگوت دەستێکی بە هێز توند دڵم دەگوشێ. هەرگیز پێموا نەبوو دەنگێکی وا شکۆدار لە لەش و لارێکی وا بچکۆلە و لاوازەوە هەستێ و من ئاوا شێت و شەیدا و دێوانەی خۆی کا. ئاوازەکە تەواو بوو و ئەو بە روخسارێکی سوورهەڵگەڕاوەوە و چاوانی دەرەوشاوەیەوە سەیری منی دەکرد.

"ئای بیلێ...بیلێ. رامەوەستە."

و ئەو دووبارە دەستی بە گوتنێ کردەوە. ئەم جارەیان بە ئاوازێکی ئاشقانەوە. ناڵەیەکی کە لە قووڵایی دڵەوە هەڵدەستا. هاوارێك کە لە بوونەوەرێ سەرچاوە دەگرت و هەڵدەقوڵا، سەری کرد. لەو دەقیقەوە هاتمە سەر ئەوەی کە دڵنیا بووم ئەو توانای ئەوەی هەیە هەرچیەکی بوێ بەمن و چارە نووسی منی بکا. من ئامادە بووم گیانمی لەبەر پێی دانێم و بمرم، یا بژیم و کۆت و بەندی بەندایەتیەی لەمل کەم و لە پێناویدا هەرچی برسیەتی و تینووەتییە بیچێژم و شانی بدەمە بەرێ. دەنگەکەی لە عیشق و ئەوین و هەڵچون و کەفوکوڵەکەی کاریگەرتر بوو بۆمن.

هێشتا دوایین نۆتەی ئاوازەکەی تەواو نەببوو کە من بەرامبەری ئەژنۆم دادا و دەستەکانیم ماچکردن و نامنە سەرچاوم و گوتم:"ماویس...ماویس..." کە لە پڕ دەنگ لە دەرکێ بڵند بوو، چاوەکانی ماویس بە ترس و لەرزێکی سامناکەوە دەحاڵێکدا کە ڕەنگی سپی هەڵگەڕا بوو لە منەوە چەقین و بێ ئیختیار دەستی منی توند گرت.

بەڵام من زوو هاتمەوە سەرخۆ و چووم دەرگاکەم کردەوە.

## ١٨

پیرەمێردێکی جل ڕەشی شڕ و وڕو کۆنە ساڵی موو ماش و برنجییەکی مەیلەوسپی و درێژ کە تایەخەی دەهات، لە زالکی دەرکێ ڕاوەستا بوو، چاو شینی زیتڵە و نێوچەوانێکی بڵند و گۆچانێك بە دەستەوە، پێش ئەوەی دەرفەتی قسەکردنی من بدا یەکسەر پرسی:

"ئەوە کێ بوو گۆرانی دەگوت؟"

من بە توندی پرسیم:

"ئێوە کێن؟"

"ڕێ هەیە بێمە ژوورێ و ئەو دەمی بیڵێم"



ماویس کە ئێستا بە بیدەنگیەوە ڕاوەستا بوو هاتە پێشێ و فەرمووی لێکرد، ئەویش هاتە ژوورێ و لە بەردەمی ماویسی سەر دانەواند. گوتی:

"خانم ئێوە بوون گۆرانیتان دەگوت؟

"بەڵێ."

پیرەمێردە خۆی ناساند کە ناوی "جۆزێف کۆنیت"ە و کرێچی نهۆمی سەرەوەیە. سەروەختێك مامۆستای باڵێ بووە و دەتوانێ ئامادەگی هونەری دەستنیشان بکا. ئەوجا دەستی بە ستایش و پێداهەڵدانێ دەنگی ماویسی کرد کە بەراستی دەو سەدەیەدا بێ وێنەیە و جێی داخیشە کە مادام بەو دەنگە خوا پێداوەیەوە لە کونجێکی دوورە دەست و دووردا دەژی.

ماویس بە تووڕەیی و خێراییەکەوە گوتی:

"ئاغا، دەنگی من هەرچیەکە، ئی منە و منیش حەزناکەم بەکاری بێنم و سوودی لێ وەرگرم."

"ئاخر خانم ئێوە هەڵەن، ئەو جۆرە دەنگە هەر تەنیا ئی ئێوە نییە. ئی کۆمەڵە. ئی هەموو دنیایە، هەموو دنیا خانم، تێگەیشتی چدەڵێم؟"

ماویس شانەکانی هەڵتەکاند و سەیرێکی منی کرد.

کابرا هەمدیس دەستی پێکردەوە. جارێك بە ئینگلیزی و جارێك بە تێکەڵەی فەرەنسیەوە دەیویست ئەوەی دە دڵیدایە بیڵێ. بە دەست و بە گۆچانەکەیەوە دەجوڵایەوە، هەڵدەستا، دادەنیشتەوە و ماویسیش وەڵامی دەدایەوە و لۆجیکەکانی وی ڕەتدەکردنەوە بەڵام من وام هەست دەکرد کە ماویس بەو قسانە گرژ بووە، بەڵام لە دواییدا پشتی دەمە کرد و چووە پەنا سۆبەکەوە و چاوی دەبڵێسەکانەوە بڕی. پیرەمێردە دەویەوە ڕامابوو زگم بە کابرای سووتا. نیشانەی داخ و کەسەر و دەرد و ژانێکی زۆری بە ڕووخساریەوە دیار بوو و پێدەچوو کە زۆر ڕەنجاوە. پێمگوت:

"قەیناکا ئاغا. خانم پێی خۆشە تەنیا هەر بۆ خۆی گۆرانی بڵێ."

لە پڕ ماویس وەك شێرێکی تووڕە ڕووی دە من کرد و گوتی:

"من هەرگیز حەز ناکەم گۆرانی بڵێم، هیچ کاتێ، هیچ کاتێ. ئایا هەقی خۆمە یانە نا؟"

"ئەڵبەتە هەقی خۆتە ئازیزم، بە ئارەزووی خۆت بکە."

دوایی پیرەمێردەکە رۆیی و منیش تا دالآنەکەم بەرێ کرد. ئەو دەمی بیرم کردەوە شتێکیشی بدەمێ باشە و پارەیەکم دایە و زۆر بە گەرمیەوەی وەرگرت و سوپاسی کردم و بە زمانیەی تێیگەیاندم کە ئەو هەمیشە هەروا هەژار و دەستکورت و بەدبەخت نەبووە. پێمگوت:

ئەڵبەتە، ئەڵبەتە، بێگومانم لەوە."

من ویستم تا زووە رزگارم بێ لە دەستانی و بێمەوە لای ماویس. بەڵام ئەو پەنجەی هاویشتە سەر سینگم و بە سپایی گوتی:

"ئاغا. لە منی ببیە و لە خانمێ بگەیەنە کە دەبێ ئەو دەنگەی بە گوێی دنیایە هەر بگەیەنێ. بە پێچەوانەی ئەمەوە گوناهێکە و هەرگیز لێبوردنی نییە. هەوڵدەن رازی کەن."

"خانم پێیوایە کە گوتنی وی ئاخیری خێر نابێت."

"ئامان لە دەست ئەو هونەرمەند و بیروباوەڕە پووچانەیان. ئەوە شوومە؟ ئەوە چاکە!؟ هەموو هەر وان. هەموو هەر گیرۆدەی خەیاڵی پڕوپووچ و بۆچوونە هیچەکانیانن."

"بەڵێ راستە. بەڵێن دەدەم قسەی دەگەڵدا بکەم."

" منیش دەچمەوە بە سەلامەتی ئێوە پێکێك هەڵدەدەم. شەو باش."

من دەستبەجێ هاتمەوە ژوورێ و دەرگاکەم لە دواوە کلۆم دا.

ماویس خۆی بە سەر کورسییەکی دادا بوو، قاچی خستبووە سەر قاچی، بێدەنگ دانیشبوو و کاتێ منیش هاتمەوە هیچ سەیرێکی نەکرد و چ قسەشی نەهێنانە ناوێ.

من هەر بۆ ئەوەی قسێکی بکەم گوتم:

"ئاخیرەکەی رۆیی."

هەمدیس وەڵامێکی نەدایەوە.



لەسەر عەردی دانیشتم و ئاورەکەم تێك وەردا و داهاتمەوە خۆم گەرم کەمەوە. هەمدیس هەر بێدەنگی. دووبارە ئەو ماتیە پڕ نهێنیە، و ئەو تووڕەییە سامناکەی وی ئەوی دەخۆوە گرتبوو. ئازایەتی و بوێریە شکاندنی ئەو ماتی و بێدەنگیەم نەبوو.

ماوەیەك چاوەڕێ مام و ئەو دەمی تەماشام کرد کە چاوەکانی نووقاون. سەرەتا پێموابوو نووستووە بەڵام لە پڕ دیتم برژانگەکانی تەڕ و دڵۆپە فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتوونە خوارێ و پڕمە پڕمی گریانییەتی و ڕەنجێك لێوەکانی وە لەرزە خستوون. زۆر بە پەرێشانیەوە ئەژنۆم بەلایەوە دادا و ویستم لە باوەشێی گرم بەڵام ئەو دەستی راداشت و بەلاوەی نام.

گوتم:

"بۆ، بۆ؟ بۆ چبووە ئازیزەکەم؟"

ئا لێرەدا لافاوی فرمێسك سەری کرد و دەنگی گریانێی بەرز بۆوە. کاتێ ویستم دەئامێزێی گرم بەرگری نەکرد و ماوەیەك هەروا گریا تا وردە وردە کوڵی نیشتەوە. دوایەش سەیرێکی منی کرد و گوتی:

"هەر ئێستا دەی بەو خەنجەرەی کە دامە تۆ بیهێنە و ـ لێدە و قوڵ دایگرە."

"ئای! ماویس گیان."

"یا بیدە بە خۆم با بۆخۆم دەو گەرووە خیانەتکارەی خۆمی راکەم."

"وای لەو قسە غەماویانە! چ گەنجەفەیەکی ناخۆش و دڵگیر."

"نا، نا، ئەوە گەنجەفە و گەمەو گاڵتە نییە. دەیبینی. ئەگەر مای دەیبینی."

"زۆر چاکە. من دەشمێنم و دەشیبینم و هەرچیەکیش روویدا بە خۆشییەوە پێشوازی لێدەکەم."

"ئارەزووی خۆتە."

## ١٩

ماوەیەك دوای ئەم رووداوە. بە هەر جۆرێك بووە ویستم سەری باسێك لە بارەی ئەم بابەت و مەسەلەیە بکەمەوە. ئەو مۆری بێدەنگییەی لە لێوەکانی خۆی دابوو و هەروەك رۆژەکانی سەرەتای یەکتر ناسینێمان مات و بێدەنگ بوو و پڕ بە دنیایەك غەم و خەفەت کە هەمووی نیشانەی ئالۆزی دەروونی بوون بەسەری دەبرد. من هەوڵم دەدا دڵخۆشی بدەمەوە و لەو بیرو خەیاڵانەی دوور خەمەوە. بەڵام ئەو هەر رووی لێ وەردەگێڕام و منیش دەمم چووبووە کلیلەوە و متتەقم لە خۆ بڕیبوو و دە دڵی خۆمدا دەمگوت وردە وردە وازی لێدێنم و فەرامۆشی دەکەم، بەڵام شەوێکیان حەوسەڵەم نەما و گوتم:

"باشە ماویس، تا کەی دەتەوێ بەو غەم و خەفەت و کەسەرانەوە ژیان لە من و لە خۆشت حەرام کەی؟ من ئەو ماویسەی هەوەڵێم دەوێ نەك بوونەوەرێکی مات و بێدەنگ.

هیچ پێویست بەو تووڕە بوونە ناکا."

"من تووڕە نیم"

"بەڵام مانت گرتووە و زیزی!"

"نا، زیزیش نیم."

ئەدی ئەو بێدەنگییە هەمیشەییە یانی چی. بە تایبەتی لە نێوان دوو خۆشەویستدا یا لە راستیدا لە نێوان دوو ئەویینداری شەیدا و عاشقی یەکتری وەکو من و تۆ. تۆ دەڵێی تووڕەنیت و لە منیش دڵگیر نیت. ئەی کەواتە بۆوام لێدەکەی؟"

لێرەدا دەستەکانی کە بەسەر مێزەکەوە بوون بەرەولای منیەوە راداشتن و منیش گورجێکی ئەم فەرموویەم قۆستەوە و دەستم نایە بان دەستەکانیەوە وەك بەفر سارد بوون. گوتم:

"باشە چ شتێك بۆتە هۆی ئەو هەموو غەموخەفەتەت؟ من هیچ بەڵگەیەك نابینمەوە، هەر تەنیا لە بەروەی پیرەمێردێك گوێی لە دەنگت بووە؟ بێدەرەتانە خۆ مەبەستێکی نەبوو،هیچیشی نەکرد. تەنیا مەبەستیشی ستایشی تۆ بوو و بەس.



بەڵام ماویس سەرێکی راوەشاند و گوتی:

"هەرگیزا و هەرگیزیش. ئیدی جاریکی دی پەلەم دەگەڵ مەکە گۆرانی بڵێمەوە."

"جا ئەوە چۆن دەبێ! دەڵێی تۆ نازانی کە چ دەنگێکی ئاسمانیت هەیە! پیرەمێردە هەقی بوو کە دەیگوت:" خۆشترین دەنگی ئەم سەدەیەیە." پێموانیە دەنگێکی دیکەی ئاوا هەبێت.""ئاه. تۆ ئاگات لێ نیە!"

"ئەگەر هەر نیگەرانی قسەی ئەو ژنە جادووکەرەی مەجارستانێی کە گوتوونی، زۆرم پێ سەیرە. ئەدی ئەو هەموو بیرە و باوەڕانەی تۆ کوان؟"

"ئەوە کاری بەسەر ئەقڵ و بیروباوەڕانەوە نییە. ئەوە پەیوەندی بە چارەنووسەوەیە." ئەو قسە پووچانە چن! ئەو قسانە هەرگیز راستین و لە راستیشەوە دوورن."

"وانیە. گوێ بدەیە. ئەو ژنە لە ناوچوونی خاو و خێزانی مە، مردنی دایکم لە غەریبایەتییە و دوور لە زێدی خۆی. شووکردنی من و مردنی.. مردنی مێردەکەم، هەمووی پێش وەخت پێشبینی کردن و هەمووشیان هاتنە دی. و ئەو پێشبینی ئەوەشی کرد کە دوای هەموو ئەمانە بۆ یەکەمین جار عیشق لە دەرگای دڵم دەدات و هەر بە هۆی ئەو عیشقەشەوە ناچار دەبم دەنگی خۆم بە خەڵکی بگەیەنم و پێشانی بدەم و دەرخەم و سەرەنجامیش عیشقەکەم لە دەست دەدەم. واشی لە دەست دەدەم کە ئیدی هاتنەوە و گەڕانەوەی نەبێ و گوتیشی لە سەرەنجامی هەموو ئەمانەشەوە و بە هۆی منەوە و لە بەر من خۆشەویستەکەم. ژەهر و تاڵ و ژاری دووری و لێکدابڕانێکی زۆر دەچێژێ و خۆی دەداتە بەرێ.

هەرچی ئەو گوتبووی هەمووی دەگەڵ راستیەکاندا جووت هاتەوە و ئەوەی تا ئێستاش رووی نەداوە، روو دەدا."

ئەگەرچی من لە پێشدا هێندێك نارەحەتی روودانی پێشبینیەکانی ئەو ژنەی بووم. بەڵام بە سەر خۆمم نەهێنا و هەوڵم دا دووبارە دڵخۆش و شاد و ئارامی کەمەوە. ئا لێرەدا ئەو دەستەکانی منی دەنێو دەستی خۆی گرتن و گوتی:

"ئاه! ئەگەر هێندەم خۆش نەویستبای، ئەگەر هێندە ئازیز نەبای...؟"

دەستیم گوشی و گوتم:

"ماویس. من ئامادەم لە پێناوی تۆ و ناوبانگی تۆدا چی سزایەك هەیە بیچێژم. من ناترسم و ئامادەشم هەر قوربانیەك هەیە لە پێناوی تۆدا بیدەم و خۆمی لەبەر راگرم وشانازیشی پێوە دەکەم."

"وا مەڵێ. بۆ بە بوونی من قایل نی؟ ئایا بوونی من ئەوەندە نرخەی نییە؟ ئایا ئەوەی من هەمبوو هەمووم نەداویەی و دەستم لە هیچ شتێك گێڕاوەتەوە و دەستم وەبەر دەستی ناوی؟ باشە ئەدی بۆ هێندە بێ بەزەییت؟"

"ماویس گیان، وەرە تەکمەوە دانیشە.. دەستەکانت بێنە با گەرمیان کەمەوە. سەرما غەموخەفەتان دێنێ.گوێ بگرە. چیم بە مێشکیدا هاتووە. ماویس، من حەزدەکەم دەگەڵ تۆ لەو شارەی برۆم. ئەم ژیان و ئەم ماڵ و ئەم شێوەکارکردنە دەگەڵ تۆ دا ناگونجێن. تۆ بۆ ئەمجۆرە کارانە دروست نەکراوی. درووماني بەردەوام و خۆکوێرکردن کارنیە. من لە ناخی دڵمەوە حەزدەکەم رێیەکی ببینمەوە بەڵکە بتوانین بە هۆیەوە پێکەوە برۆین.

"من" و "تۆ" پێکەوە خۆشبەختی و کامەرانیەکی نوێ لە نوێ دروستکەین بۆ تاهەتایە.

و تا ئێستاش بیرم بۆ چ لایەکی ناچێ چونکە سەرچاوەی هەمووشتەکان و لە هەموانیش گرینگتر لایەنی ئابووری ئەم نەخشە و پلانەیە و ئێستاش بەو هونەرەی کە تۆ هەتە رەنگە بتوانی رێیەکی بۆ ئەو مەبەستەمان بدۆزینەوە و ئەگەر بتوانین بچینە پاریس یا ڤییەننا یا هەرشاریکی دیکە کە تۆ بتوانی مەشقی پێویست بۆ ئاوازەکانت وەربگری، من وەك کۆیلەیەك بۆ ئاگاداری و پارێزگاریەت دێم. و کارێکی پەیدا دەکەم و بە هەر سەختی و دژواریەك بێت رۆژگار بەسەر دەبەم. تا کاتێك کە تۆ لە مەشقەکانت دەبیەوە و دەبیتە گۆرانیبێژ و هونەرمەندێکی بە ناوبانگ. من دەتوانم لە راهێنانەکانتدا یارمەتیت بدەم و کە بووشیتە هونەرمەندێکی بە ناوبانگ و



دیار ئەو دەمی من بە ناوی سکرتێر یا پێشکاری تایبەتی و یا هەرشتێك لەم بابەتانە لەلای تۆ دەمێنمەوە."

ئەو هیچی نەدەگوت و منیش لە دڵەوە دەمزانی کە ئەم نەخشەو پلانە کەموکورتیەکی زۆری تێدایە بەڵام چ بکەم. ئەوە تەنیا نەخشەیەك بوو کە من دەمزانی و تەنیا رێیەکیش بوو کە لەوانە بوو ئێمەی لەو ژیانە رزگار کردبایە.

ئەگەرچی باشیشم دەزانی کە چوونە ناو دنیای هونەرەوە پێوستی بە دیتنی کەسانی دیش هەردەبێ بەڵام من هێندەم ئەو نەخشە و پلان و بیرۆکانە بەلاوە شیرین و گرینگ بوون بە ئەنقەست خۆم لەو خەیاڵانە دوور دەگرت و لە جیاتیان هەر رووم لە ژیانێکی ئازاد و بێ بەندوبار بوو. هەرچۆنێك بوو، هەر جۆرە ژیانێکی دی لە گوزەرانی ئێستامان چاکتر بوو.

ماویس تا دەهات وردتری گوێ دەدایە قسەکانی من و دەگەڵ ئەوەشدا کە لاوازی نەخشە و پلانەکەشی هەستدەکرد، کەچی وردە وردە تا دەهات رەنگی دە رووان دەگەڕایەوە و لە هەمبەر بەرجەستەکردنی ژیانێکی ئازادتردا دڵی زیاتری لێدەدا. دەوماوەیەیدا کە دەستی دە نێو دەستی مندا بوو و من دەستم پێدا دێنان و هەوڵم دەدا گەرمیان کەمەوە. دەستی منی توندتر گرت و هەر ئەو کاتی لە پڕ قۆڵی لە گەردەنێ ئاڵاندم و روخساری نوقمی ماچ کردم و هێندەی ماچکرد کەمن هەموو شتێکم لە بیر چۆوە.

ئاه! ئەوە هەر تەنیا ماویس بوو بتوانێ ئەو جۆرە دڵبەری و ئاشقایەتیە ئاوابکات و ئادەمیزاد دەگەڵ خۆیدا بەرێتە حەوت تەبەقەی ئاسمانێ و ئێستا کە بیر دەکەمەوە ئەو پەرییە... بەڵام جێی باوەڕێ نیە، قەت نابێ.

## ٢٠

لەوانەیە مەزەندە بکەن لەبەر وەی کە من ژیانی خۆم بەوییەوە گرێداوە تاچ ئەندازەیەك بێدەرەتان بووبم. ئەگەر بێدەرەتان نەبامایە نەخشەو پلانم دانەدەنان و

ئەویشم نەدەدایە دەست خەڵکی دیکە و بە کەسانی دیم نەدەناساند. چونکە دڵنیاش بووم کە ئەو لە هەرکات و شوێنێکدا بێت بەرامبەر من هەر بە ئەمەك و وەفادار دەبێ، بیرۆکەی ڕۆیشتنێم دەگەڵ ویدا ڕۆژ بە ڕۆژ تا دەهات تاوی دەستاند و وەکی نەخۆشیەکی دەخوێنمدا بڵاو ببۆوە و پەرەی دەستاند من دەمهێنایە بەر چاوی خۆم کە چۆناوچۆن دەگەڵ ماویسیدا دەڕۆینە وێ. ئەوشارەی کە ئەو تێیدا بتوانێ مەشقی دەنگی لێ فێر بێت و ئەو دەنگەی بگەیەنێتە ئەوپەڕی و شکۆی ئەودەنگەش بێنێتە سەر شانۆی ژیان.

ئەڵبەتە دەمزانی ماوەیەك هەژار و دەستکورت و بێ نازی هەموو شتێك دەبم، بەڵام ماوەیەکی کورت. دوایەش من بۆ خۆم ئیشێکم هەر دەدۆزیەوە و چونکە من لە کاروباری حیسابداری و دەفتەرداریيەدا پسپۆڕ بووم. و هەروەها دەمتوانی زمانی ئینگلیزیش بلێمەوە، سەرەڕای ئەوەش من هەر لە منداڵیەوە دەگەڵ مۆسیقایدا ئاشنا بووم و دەگەڵ هەندێ ئامێری مۆسیقای وەك پیانۆ وکەمانچە وئیدیش سەرەوکارێکم هەبوو دەمتوانی دەکاتی مەشق کردنێدا و لەکاتی پێویستدا هاریکارێکی باش بم تا ئەودەمەی ئەو ڕۆژی شانازیەی دەهات و پێکەوە بەرەوپێش دەچوین و ئەوەی حەزم لێبایە و دڵمان بیویستبایە بە دەستمان دێنا. ئەو دەمیش کارەکانی من هەر تەنیا دەبوونە ئاگاداری بڵاو کردنەوە و ڕێکخستنی تەدارەکی سەفەر و بەسەر ڕاگەیشتنی ئەو وردەکاریانەی دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی ناو و ناوبانگ و پێشکەوتنی وی، تا پلە بە پلە دەگاتە لوتکەی ناوبانگ و پلەوپایەی بەرز و ئەو دەمی ئەو گۆرانیبێژە بێ وێنە ببێتە ژن و هاوبەشی ژیانی من.

ئێوە نازانن ئەو خەونە زێڕینانە چۆنیان من دەخۆوە لوول دابوو. هێندە دەبیروخەیاڵی ئەوەیدا بووم هەر کاتێ کە لە ماڵێوە دەچوومە دایەرە و لەوێشڕا دەهاتمەوە ماڵێ ئاگام لە خۆم نەبوو. لە دایەرەی بەزۆریم هەڵە دەکردن، تاوای لێهات وردە وردە هاواریان لێ هەستا. بەڵام من هەر گوێم نەدەدایە چونکە دەمزانی دوا "گێلێك" هەرپەیدا دەبێت ئەو هەڵانە ڕاستکانوزو؟ من هەروا بەو زووانە ئەو دایەرەم



بە جێدەهێشت و لەوەش کە ڕۆژێکی ئەو پانێرانە داستان و بەسەرهاتەکانی من دەبیسنەوە و لە حەژمەتان زاریان بەش دەبێتەوە ئۆخژنم دە دڵی دەگەڕا و پێم خۆشبوو و چێژم لێدەکرد. تەنانەت ئەوەشم دێنایە بەرچاوی خۆم کە ئەوە تا خەڵکی هەموو سواری شان و کۆڵی یەکتری بوون و بلیتی کۆنسێرتی ماویسی دەکڕن، دە دنیای خەیاڵدا تەنانەت"ئەیوا"شم دەدیت کە خەریکی بلیت کڕینێیە بۆ خۆی و گریسی کچی.

بەڵام ماویس کچێکی یەك دەندە بوو من دەبایە زۆر بە پارێزەوەی بۆ بچم و ڕەفتاری دەگەڵدا بکەم تا بە گوێرەی حەز و ئارەزووەکانی من بجوولێتەوە. بابەتێکی دی هەبوو، منی خستبووە گومان و دڵەڕاوکێوە، ماویس جوانی و لاوەتی و دەنگێکی بێ وێنەی هەبوون بەڵام ئەو لەش و لارە بچکۆلانەی وی دەگەڵ ئەوکارەیدا دەگونجا و ئەو هێز و توانایەی کە دەبوو دە گۆرانیبێژێکیدا هەبێ، ئەو هەیبوو؟

سوێند دەخۆم کە ئامانجی من لەو نەخشە و پلانەیدا هەرگیز ئەوە نەبووە کە لەم ڕێیەوە ببمە خاوەن پارە وسامان و پووڵ و پارە پەیداکەم.نا. من ماویسم تەنیا لەبەر خودی خۆی دەویست، بەڵام بەوەش ڕازی نەدەبووم کە بە هەژاری و نەدارییەوە وەدوا خۆمی دەم. حەزم لێبوو دەناز و خۆشیەیدا نقووم کەم و ئەوەی دەستی مرۆڤ بیتوانێ لە خۆشی و، ئاسوودەیی و دڵنیایی و گەورەیی وشکۆمەندی بۆی پەیدا کەم و بیدەمێ.

ماویس سەرتاپا ببووە یەك دەندە و وڕکاوی. نەمدەزانی چی دەوێ، دەگریا، سوێندی دەدا، دەپاڕایەوە، و جاریی واشبوو منی تاوانبار دەکرد کە گوایە من دەمهەوێ سوودی ماددی لێ ببینم و چونکە دەشیزانی کە ئەو قسانە چەندم نارەحەت دەکەن بۆیە بەتایبەتی لەم بارەیەوەمڕا بۆ دەهات و پەنای بۆ ئەم لایەنە دەبرد و بەوەش تائەندازەی شێتیەی تووڕە دەکردم.

من تا ئەودەمی دەگەڵ وی تووڕە نەببووم و ئێستا لەو کردارەی دەترسم و خودی ئەویش دەوکاتانەدا ترس و سامێك دایدەگرت و دەیگوت:

"سەیریێ، سەیریێ ئەوە خۆ ئێمە شەڕێ دەکەین، وەرە و توبی خودا مەهێڵە ئەم باسە شوومە درێژەبکێشێ من داواوتکات لێدەکەم کە هەر لە بیر خۆتی ببەیەوە کە من دەنگێکم هەیە. ئاه چبکەم وات لێبکەم واز لەمە بێنی؟ ئایا گەرووی خۆم پارچە پارچە کەم! کوا ئەو خەنجەرەی دامە تۆ؟"

ئەو هەڕەشەی منی تۆقاند، چونکە دەمزانی کە ئەو هەرچییەکی بڵێ دەیکا.

و دووبارە گوتی:

"من دەڕۆم، هەڵدێم، دەچمە جێیەکی دەستت نەمگاتێ و نەشتوانی بمدۆزیتەوە. شتەکانم بە سەعاتێکی دەگوازرێنەوە، و شەوێکی دێی و دەرکە داخراوە و ئەو دەمی دەزانی کە من بۆ تا هەتایە رۆیشتووم."

لەوە بەدواوە، هەمووشەوێ، کە دەچوومە ئارتیستۆ، هەر لە پلیکانەکانەوە بە دڵەکوتە و شێواوییەوە رامدەکردە سەرێ و دەستگیرەی دەرگاکەم تاقیدەکردەوە تابزانم داخراوە یانە نا. دەمەتەقێمان هەروا بەردەوام بوو و ئەویش بە باوەشمەوە دەگریا. پڕی دەدامێ، دەتۆرا. بە شێوەیەکی وا کە دڵنیا بووم هیچ ئینگلیزێك ئەو کارانەی لە دەست نەدەهات و وەکو وی نەدەتوانی. شەوێکی هەر بۆ ئەوەی ئازاری دەم گوتم:

"پێویست بە هەڕەشە ناکات. من دەزانم کە هەموو شتێکت لە دەست دێت، هەر لە کوشتنەوە تا زیندوو کردنەوەی کەسێك و هەر لە نەفرەت کردنەوە تا ئەو پەری عیشق، چاکت دەناسم."

بە تەواوی سەرسامییەوە دیتم رەنگی وەك گەچ سپی هەڵگەڕا و روخساری وەك کەسێکی شەقاززللەیەکی لێدرابێ تێکچوو. من راپەڕیم، دە ئامێزێم گرت و گوتم:

"ماویس! ماویس ئازیزم. چیم گوتووە؟ بۆ وا تێکچووی؟ باوەڕکە ئەگەر هەموو دنیام بدەنێ بە تۆرانی تۆی نادەم و نامهەوێ.

"حەتمەن مەبەستێکت نەبوو لەو قسانە، وەنا؟"

"نا، نا ئازیزم، من هەرچی بیلێم هەرتەنیا بۆ ئەوەیە کە بڕۆین و پێکەوە بین دەتۆ بیری لێبکەوە بزانە چەند بەختیار دەبین."



"من لەگەڵ تۆ هەر دێم، بۆ هەر جێگایەك بڵێی. تۆ چاك دەزانی کەمن ملکەچێکی رووتم."

و دیسانەوە بۆ هەزارەمین جار ویستم تێی بگەیەنم کە رۆیشتنی ئاوا لە غەریبایەتیە شارێکی، تەنیا و بێ پوول و پارە چ ناخۆشییەکی بەدواوەیە... راستە کە پێکەوەین بەڵام...ئادەمیزاد دەبێ کەساسانە بژی. پێمگوت خۆ ئەگەر هەر دەرامەتێکی کەمتاکورتیلەشم هەبایە، ئەوە بە بێ چەند و چوون دەڕۆیشتین و لە جێیەکی خۆش ئاو و هەواو هەرزانی وەك کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست بۆتاهەتایە بە خۆشی پێکەوە دەژیاین.

بەڵام بیرو خەیاڵی سەرکەوتن و ناو و ناوبانگ، هۆش و گۆشی لەمن بڕیبوو و ئەقڵی پێ نەهێشتبووم، حەزم لێبوو خۆ لەسەر خەڵکی بادەم، حەزم لێبوو ئەوانەی کە سەرەتا هەڵاتنێ من و ماویسی دەبیسن دوایەش بزانن کە من مێردی جوانترین و شیرینترین و هونەرمەندترین گۆرانیبێژی هەموودنیایەم.

## ٢١

ماویس لە بەرامبەر سوور بوون و پێداگرتنی مندا مانگێکی خۆڕاگرت، و دوای قسەو بگرەو بەردەیەکی زۆر توند و تیژ، بارو دۆخێکی گرژو نالەبار هاتە پێشێ. من بۆ سەدەمین جار هۆی ئەو نارەزایەتیەم پرسی و ئەو هەر قسەی ژنەی جادووگەر و پێشبینیەکانی دەکردنە بیانوو. گوتم:

"خۆ ئەگەر بەسەر هاتێکی ناخۆشیش رووبدات، بۆ منە خۆ بۆتۆ نیە، کەواتە ئەم هەموو نیگەرانییە بۆ؟ تۆ ئەگەر منت خۆش دەوێ، ئەوەی بەڵایەکەی بەسەر دێت منم، لێگەڕێ با بێ، بە خێر بێ."

"وای وامەڵێ. وامەڵێ. بێدەنگ بە و بیبڕەوە، ئەی نازانی سروشت گەمان نازانێ و گاڵتەکان بەراست دادەنێ."

"ماویس ئەو قسانە بەلاوە نیێ. ئەگەر منت خۆشویستبایە بە قسەت دەکردم."
لێرەدا شتێکم هاتە بەر چاوان، و هەرچەندە باوەڕیشم پێ نەبوو. هەر گوتم:
"دیارە یەکێکی دیکەت هەڵناوە و خۆشتدەوێ و ناتەوێ وازی لێ بێنی."
بە چاوێکی کە لە ڕقان گرد ببوونەوە، تێم راما و گوتی:
"تۆ زۆر چاك دەزانی کە کەسێکی دیکەم دە ژیانیدا نیە."
"هەر تەنیا منت خۆشدەوێ؟"
"ئەوەیان بۆخۆت چاکتری دەزانی."
"دەگەڵ ئەوەشدا ناتهەوێ خۆشبەخت و کامەران و بەختەوەرم کەی؟"
"ئایا من هەرگیز تۆم خۆشبەخت و کامەران و بەختەوەر نەکردووە؟"
"بۆ هەندێ جاران، هەروا بۆ رابواردنی چەند دەقیقێکان، و هەر دەو دەقیقانەشدایە کە دەزانم ژیان دەگەڵ تۆدا چەند شیرینە، بەڵام تۆ ناتەوێ و ناهێڵی ئەو خۆشیە تاسەر بێت؟"

شەوی دواتر، کاتێ کە لە پلیکانەکان وەسەر کەوتم، یەکەمجار بوو کە دیتم دەرگاکە کلۆم دراوە و ژوورەکە تاریکە. من هەرگیز ناتوانم پێتان بلێم کە بە دیتنێ ئەو بارودۆخەی چیم بەسەرهات. بلێسەی ترس و تووڕەییەم دەدەرونیدا زمانەی کێشا، حەزم دەکرد شووشەکان هەموو ورد و خاش کەم و بیانشکێنم، لە پەشۆکاویان دەلەرزیم وام بیرکردەوە کە ئەگەر هەرجارێکی دیکەی ببینمەوە لە بەردەمیا و لەسەر عەردی تخێڵ دەبم و واز لە هەموو خەونە سەوز و ئایدیا خەیاڵیەکانم دێنم. بە دەستی لەرزۆکەوە دووسێ جارانم بە پەنجە لە دەرکێ دا بەڵام وەڵامێك نەبوو. گوێم بە دەرکێوەنا و هەستم راگرت، بەو هیوایەی بەڵکە ئێ خۆی شارد بێتەوە، بەڵام بێدەنگیەکی رەها هەموو جێیەکی داگرتبوو. دوای چەند دەقیقێکان دەرگای بەرامبەرێ کرایەوە و ژنە کرێچیەکە هاتە دەرێ و گوتی:

"ببوورە ئاغا، خانمێ کۆترل رایانسپارد کە ئەگەر ئێوە هاتن پێتان رابگەیەنم کە ئەوان ناچار بوون لێرە برۆن و ئێرە بە جێ بێڵن.



"نازانی چوونەتە کوێ؟"
"هیچیدیان نەگوت. نازانم."
"وەك ئاگاداربی چ شتێکیان دەگەڵ خۆدا برد؟"
"نەخێر ئاغا، بەڵام گوتیان کە ئەگەر یەکجاری لێرە برۆن دەنێرن شتەکان دەبەن."
"زۆر چاکە سوپاس. ژنەکە چۆوە ژوورێ و من هەر لەوێ لەسەر پلیکانەکان راوەستام.

هەرگیز. تەنانەت ئەوکاتەی دەرگا ئاسنەکەی زیندانێشیان لەسەر داخستم، هێندەم هەست بە تەنیاییە نەکرد بوو. نە هەر تەنیایی و بەس بەڵکە نەمان و بێ خانوومانی و بەدبەختی، نەمدەزانی چ بکەم و هەروەك گیانلەبەرێکی شێت و ویت بێرەو بەوێدام راوێچکە دەکردن و تەنیا هەر خەیاڵێکیشم دەسەریدا بوو:" دەبێ هەر بیدۆزمەوە."

هیچ رێیەکم بە مێشکیدا نەدەهات، و هاتمە سەر ئەوەی کە هەرگیز هیچ شتێك دەربارەی تایبەتمەندییەکانی ژیانی وی نازانم. چۆن دەبێ دەو لەندەنەیدا ناسیاوێك و ئاشنا ورۆشنایەکی نەبێ؟ ئەو هەمیشە دەربارەی ئەو کۆچبەرانە دەدوا کە دەوگەڕەکەیدا ئاکنجی بوون، بەڵام قسەیەك کە بەڵگە و نیشانەی پەیوەندی و هاورێیەتیەی بێ دەگەڵە واندا، لە زاری نەهاتبووە دەرێ. تەنانەت ئەوانەشی کە سات وسەودای دەگەڵدا هەبوون هەر نەمدەناسین. تەنیا ناوی ئەو کۆمپانیایانەم دەزانی کە ئیشی بۆ دەکردن، ئەویش بەو نیوە شەوەی بەکەڵکی چی دێ؟ باوەڕم نەدەهات کە ئەوم لە کیس چووە، و تازە نایبینمەوە، خۆ ئەو هەرتەنیا بەشێکی ژیانی من نەبوو، ئەو هەموو ژیان ورەگی ژیانی من بوو، و من لە بەر ئەو و ئەو ئایندەی پێموا بوو چاوەڕێمانە، زیندوو بووم و دەژیام. هەروا دە راوێچکاندا بووم کە لە پڕ زانیم یەکێك لە پلیکانەکانەوە دێتە سەرێ. لە پێشدا وامزانی ماویسە کە بە یەك دنیا پەشیمانییەوە گەراوەتەوە و هاتۆتەوە،بەڵام هەر زوو زانیم ئەوەی کە دێ خۆشەویستەکەی من نیە، چونکە هەنگاوی قورس و لەسەرخۆ و بە کوتەکوتی گۆچانیەوە بوون. و هەر زووش سەر و کەللەی پیرەمێردەی سەرۆکی بالێ وەدەرکەوت.

هەر کە منی دیت، دەگەڵ ئەوەی هێشتاش هەر بەسەر پلیکانەوە بوو، راوەستا و زەردەخەنەیەکی بە رووخسارە سوورە فلەکەیەوە دەرکەوت، و بە سەر و دەست و گۆچانەکەیەوە گوتی:

" ها، ئاغا، توانیتان خانمێ رازی کەن؟"

"نا، خانم ئەو پێشنیهادە زۆر بە توندی رەتدەکاتەوە."

"داد لە دەست ئەو هونەرمەندە یەك دەندە دیکتاتۆرانە! هەر من دەیانناسم و هەمیشەش هەر دەڵێم خودا لە ناویان ببات."

"پێموایە نزایەکەت گیرا بوو بێت و خوا ئەو خانمەی بۆ خۆی برد بێتەوە."

"رۆیوە؟ خانم رۆیوە؟ جا چۆن شتی وا دەبێ؟"

"نەك هەر شتی وادەبێ، بەڵکە لێشی راسپاردووم کە ئیدی هەر نایەتەوە."

"هەر داد لە دەست ئەو ئارتێستانە!هەموو هەر شەیتانێکیان دەگیانیدایە، بەتایبەتیش خۆ ئەگەر گەنج و جوان بن. جا چۆتە کوێ؟"

"چووزانم.."

"ئاغا مەگەر ئێوە... مەگەر" قسەکەی بڕی و سەرنجە حەپەساوییەکەی دەمنەوە بڕی. نازانم بۆ راوەستا و من بۆ دەگەڵ ئەو پیرە مێردە گێلەیدا کەوتمە قسان. رەنگە هەر لە بەر وەی پێموابووبێ بەڵکە ئێ بتوانێ سووسەیەکیم داتێ. لە دواییداگوتی:

"و ئێوە نازانن خانم چی لێهاتووە؟"

"نەخێر نازانم، ئەدی ئێوە؟"

"من؟ من ئاغا؟ جا پیرەمێردێکی وەکو من و شۆڕە ژنێکی ئاوا جوان و ئارتێست چ کارێکیان بەیەکە؟"

"ناتوانی هیچ مەزەندەیەکی بکەی؟"

لە پڕ هاواری کرد:

"من.. من چووزانم چۆتە کوێ خۆی شاردۆتەوە؟



هیچی لێ هەڵناوەرێ، بۆیە بە پلیکانەکاندا بەرەو خوار بوومەوە. بەڵام گومانێکم بە دڵیدا هات. رەنگە ئەو شتێکی هەر بزانێ، کێ دەڵێ پیرەمێردە ماویسی بەلای خۆیدا رانەکێشاوە؟ هێندەی پەیوەندی بە ماویس و هونەرەکەیەوە بوو لێی دەوەشێتەوە ئەوەش بکات! ئاه، ئەوە بۆ شتێکم نەدایە؟ لەوانەبوو زمانی بکرێتەوە. سەیرێکی سەرەوەم کردەوە و دیتم لە نهۆمی سێهەم تێپەڕیوە و دەنگی کوتەکوتی گۆچانەکەشی ئەوا زۆر لەو سەرەوە دێتە گوێ.

هەرچەندە قسەکردن دەگەڵ پیرەمێردەیدا بێ ئەنجام بوو، بەڵام هەر بووە هۆی ئەوەی مێشکم هێور بێتەوە، و تا ئەندازەیەك ئارام ببمەوە و بێمەوە سەرخۆ. دەمزانی ئێستاکە دەبێ زۆر بە قوڵی و تێڕامانەوە نەخشێکی بکێشم و پلانێکی وا دانێم کە دەبێ چبکەم. دەو دەمیدا گەیبوومە کۆڵانێ. ئەو دەیویست بترسێنێ و نەهێڵێ و منیش بڕیارم دابوو، هەر چۆنێك بێ و چەند بخایەنێ، هەر بیدۆزمەوە.

ماویس پێی گوتبووم کە کوریژگەیەك لە بێکاریان ئاو و خەڵووز بۆ کرێچییەکان سەر دەخا، بیرم کردەوە، رەنگە هەر بە ئەسکیناسێك و هەندێ گفت و بەڵێنی دیکە بتوانم سوودێکی لێوەرگرم، تا هەر کە ماویس هاتەوە، یا کەسێکی نارد کەل و پەلەکان بەرێ، دەستبەجێ تەلەفۆنم بۆ بکا.

وەك بڵێی بیرێکی چاك بوو، دووبارە هاتمەوە بەردەرکی خانووەکە و سۆراغی کوریژگەکەم لە ژنە دەرکەوانەکەی کرد گوتی:

"تا پێش سەعات یازدە نایەتەوە چونکە لە شانۆی کار هەیە."

بەوەی کە کارێکی دیوەتەوە و نەشیدەتوانی مەبەستەکەی من بێنێتە دی و لە ئارتیستۆش وەمێنین زۆر دڵگران بووم و گوتم:

"من بە تایبەتی دەمهەوێ بیبینم."

"ئاغا گوتم کە سەعات یازدە دێتەوە."

بەخششێکم دایە و سوپاسم کرد و کەوتمە رێ، دۆزینەوەی ماویس هەروا ئاسان نەبوو. دووبارە ترس دایگرتمەوە. پەرێمەوە ئەوبەری شەقامێ وسەیری

پەنجەرەکانم کرد تا بەڵکە ئێ ترووسکاییەکیان لێوە بە دی کەم. ئای خودایە هەر ئەوجارە من لێرە ترووسکاییەکی ببینمەوە! ناکا هەموو ئەمانە لە خەون بەولاوە هیچیتر نەبن! بەڵام ژوورەکە چۆڵ بوو و تاریکی هەموو جێیەکی داپۆشیبوو. نەمدەزانی چبکەم و روو لە کوێ کەم. خۆ نەشمدەتوانی بە سەعات هەر لە وێ راوێچکان بکەم و بێم و بچم، ئەوکارە گومانی پەیدا دەکردن، تەنانەت لەوانە بوو جێی گازندە ومەزەندەی پۆلیسیش بێت، و منیش نەدەکرا سەرنجی خەڵکی بۆلای خۆم راکێشم بەڵام خۆ چارەیەکیش نەبوو. وەبیرم هاتەوە کە رێك دوازدە مانك لەمەوپێش بوو کە یەکەمین شامم دەگەڵ ماویسیدا خوارد، و بەو بیرەوەرییە حاڵێکی وام بەسەر هات کە لە غەم و کەسەر و لە خەفەتان سەرتاپام لەرزی.ئای ئەگەر ئەو پەیامەی رانەدەسپاردمێ، لەوانە بوو ئومێدێکی گەڕانەوەێیم هەر هەبایە ئای لەوژنە سەیرەی! ئەدی بەر لە ساڵێك پێی نەگوتم کە چاوی لە بەرزیەیە؟ دەگەڵ ئەوەشدا هەر بە بیریشیدا نەدەهات کە هونەرێکی بەرز و شایستەی هەبێ، و ئێستاکە منیش کە لە بەروی چاوم لەشتەوەیە کەچی ئەوەتا بە جێم دەهێڵێ و لێدەدا دەڕوا! ئایا کۆنە داستانی ژنە قەرەجێکی مەجارستانی، دەکرێ ئاوا کارێکی لێبکا؟ بەلای منەوە شاردنەوەی دەنگ و ئاوازێکی وا تاوان و گوناهێکی هێندە گەورەیە لێبووردنی نیە و ئێستاش بەو هەموو شێواوی و شلۆقی و نیگەرانییەوە کە زۆریم لەوی کرد و پێم داگرت پەشیمان نەبووم و دڵنیاش بووم کە لەبەر ئەوەی قسەکانی من کاریان لە ناخی دڵ و دەروونی کردبوو و خۆشی لەبەرامبەریان رانەگرتبوو بۆیە لە من هەڵاتووە.

ئای ئەگەر دەمتوانی پێش ئەوەی بێتەوە سەر خۆی و بەخۆیدا بێتەوە بیدۆزمەوە، ملکەچم هەر دەکرد. ئالێرە دا بوو کە وەك بڵێن دەرگای ئومێدێکم بەڕوودا بکرێتەوە و هیوایەکم بێتەوە بەرێ.



## ٢٢

تاشەو رادەشکا بڕیارەکەی من بە هێزتر دەبوو کە بچم لەبەر ماڵەکەی ئەوان ببمە ئێشکچی، هەموو رۆژێش بەناو پلیکانەکاندا خوار و ژووریە بکەم تا دەیدۆزمەوە.

سەعات یازدە و نیو، کوڕێژگەکە هات و قسەم دەگەڵ کرد. ئەسکیناسەکەی وەرگرت و بە وردی و وریاییەوە گوێی دایە قسەکانم. ئەوجا گفتیشم دایە کە ئەگەر لە سۆدرەی ئەم کارەوە ئیشەکەی لە دەست چوو، ئەوەکارێکی دیکەی بۆ پەیداکەمەوە و هەمدیس دەستم کردەوە بە راوێچکان تا بووە سەعات دوازدەی تەواو. ئالێرەدا زانیم کە ئیدی مانەوەی من بێسوودەو کەڵکی نییە. و تازە ئەو نایەتەوە، و جێیەکی بۆخۆی هەر دۆزیوەتەوە لەبەر وەی بەو کوڕێژگەیەشم ئەسپاردبوو کە تەلەفۆنم بۆبکا. ئەقلم وای دەبڕی بچمەوە ماڵێ.

تا ئەندازەیەك هەستم بە ئاسوودەییەکی دەکرد، چونکە مەئمورەکەشم کوڕێژگەیەکی زیتەڵە و وریا و تێگەیشتوو دەهاتە بەرچاو، و بەڵێنیشی دابوو، ئەگەر بۆخۆشی لەوێ نەبێ برایەکەی لەوێ لە جێی خۆی دانێ، هیوایەکم بە دۆزینەوەی ماویسی پەیداکردبوو، بەڵام چاوەڕشێش نەبووم هەروا بەو زووانە یانی دەوروبەری سەعات ٨ هەشت. کاتێك کە دەگەڵ ئەیوا و گریسیدا قاوەڵتیمان دەکرد تەلەفۆن بکا. ئەیوا تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و گوتی:

"رۆجەر تۆیان دەوێ."

هەر هێندە دەنگی زەنگی تەلەفۆنەکە هات، یەکسەر زانیم کە بۆمنە، دەستبەجێ لە ژووری نانخواردنێ چوومە دەرێ و گوشییەکەم هەڵگرت، هەر زووم دەنگی کوڕێژگەکەی ناسیەوە کەگوتی:

"خانم هاتۆتەوە و ئەوە لە ژوورەکەی خۆیەتی."

نەمدەزانی چبکەم، ئەگەر چووبامایە ئارتیستۆ بۆ دایەرە درەنگ دەبوو. و ئیدی بەهەر شێوەیەك بوو دەمزانی کە لە دوای ئەم رووداوە باس و روونکردوەیەك و پرسیارێکیش لە پێشە، و ئەو جۆرە قسانەش بە پەلە ناکرێن. بەڵام دەگەڵ هەموو

ئەمانەشدا کە هەر دەبوو جارێ سەرێك لە ئارتیستۆ بدەم و دوای ئاشتبوونەوەیەکی سەر پێیانە، چارە نەبوو کە بچمەوە دایەرەش. بە کوڕیژگەکەم گوت: "هەروا ئاگادار بە ئەوا هاتم، هیچ شتێك دەربارەی هاتنی من نەڵێی."

"ئەیوا پرسی ئەو تەلەفۆنە کێ بوو گوتم:

"مادام کۆترل" (چەند ئاسان بوو بەو ناوەوەی بانگ کەم وەك ئەوەی هەر هیچ پەیوەندییەکی بە ماویسەوە نەبێ.)

"وای خۆ ئەوە بە ناسیاوان ناچێ؟"

"مادام کۆترل یەکێکە لە مشتەرییەکانی کۆمپانیا و منیش دەبێ پێش چوونە دایەرەم بیبینم."

"ماڵەکەیان لە کام لایە؟"

"لەو پەڕی شاریەوەیە، دەبێ خێرا کەم."

ڕەنگە بەو پرسیار و وەڵامانەوە منتان زۆر ئارام و لەسەرەخۆ و خوێنساردبێتە بەرچاوی. بەڵام ئاگرێکم دەدڵی بەر بووبوو و بەرەو ئارتیستۆ فڕیم.

کوڕیژگەکە لە خوار پلیکانەکانەوە دانیشتبوو. هەرکە منی دیت بە سەر ئاماژەی سەرەوەی کرد و گوتی:

"مادام هێشتا هەر لە سەرێیە."

"ئافەرین! هەر لەوێ بە تا دێمەوە و بەخششەکەتت دەدەمێ." دوو پلیکانەم بە هەنگاوێکی دەبڕین، ئەوە دڵیشم دەڵێی دەهۆڵە لێدەدا، دەرکەم کردەوە و خۆم دەژوورێ هاویشت. ماویس لەبەردەمی سۆبەکەی داهاتبۆوە و دەیهەویست سۆبەکەی هەڵکا، بەڵام وەك بۆی هەڵنەبێ. تروسکەی ئاگری شقارتەکە روخساری رووناك کردبۆوە و هەر بەبیستنی دەنگی پێی منیش، راستبۆوە ئاوڕی بەلای مندا دایەوە، و بە دیتنی من هاوارێکی وەك ناڵەی لێ هەستا و وەك برووسکە خۆی دەباوەشێ هاویشتم.

بەو رەنگە پەڕیوەی، و چاوە هەڵامساوە پڕگریانەی، و برژانگە بە فرمێسك تەڕانەیەوە بە باوەشمەوە دەلەرزی و هۆن هۆن دەگریا.



کە دەباوەشێ خۆم وەرێنایەوە، ئیدی دەنگی لێبڕا و قسەی نەما. منیش وەك تینوێکی سەر و ڕوویم نقومی ماچان کرد و هەروا کە سوێریە فرمێسکەکانیم بە لێوەمەوە هەستدەکرد گوتم:

" ئەوە بۆ هەروا بە جێتهێشتم و رۆیشتی؟ هێندەی نەمابوو هەر بشمکوژی. ئەوە چۆنت دڵ هات هێندە دڵڕەق و بێبەزەیی بی؟ کەچی دەشڵێی خۆشمدەوێی. ئەوە چۆنت دڵ دێ ئازارم بدەی." ئەو کە خۆی تەواو بە باوەشمەوە نووساند بوو، بە گوێشیدا دەچرپاندم:

"ببوورە، ببوورە، ببوورە."

"من تەنیا پێنج دەقیقەم دەرفەت هەیە و ناتوانم لەوە زیاتر بمێنمەوە. هەر ئەوەندەم دەوێ بزانم داخوا گاڵتەیەکی دیکەی ئاوام دەگەڵدا دەکەیەوە؟"

"نا،نا."

"پەیمان بدە."

"گفت و پەیمان دەدەم."

"ئەو شۆکە بێمەوە لێرە دەبی؟"

"بەڵێ، بەڵێ."

"سوێندێ بخۆ."

"سوێندێ دەخۆم."

سەروڕوویم جارێکی دیش ماچباران کردەوە و ئەوم دانایەوە عەردی و ئەو جا سۆبەکەشم بۆ پێکرد.

"وەرە ئێرەوە خۆت گەرم کەوە. نەشگریەی. لە بیرت نەچێ کە سوێندت خواردووە ئەمشەو لە ماڵێ بی. ئێستاش من دەبێ بڕۆم." هەمدیس لێوەکانیم ماچکردنەوە و بەپەلە لە دەرکێ چوومە دەرێ.

قەراوڵەکەم هەر لەوێ دانیشتبوو. ئەو بەخششەی گفتم پێدا بوو دامێ و بە سپاییی گوتم:

"یەك دوو رۆژی دیش هەر ئاوا بە سەویەت بەو دەکاتی پێویستدا تەلەفۆنم بۆ بکە."

ئەو جا بەرەو دایەرە کەوتمە رێ. تـەواوی ئـەو رۆژە خۆشـی و شـادییەکی سـەیر هەموو گیان و لەشی داگرتبووم، و چاوەڕێی شەوێکی خۆش و بێوینەش بـووم دەگـەڵ ماویسیدا کە ئیدی نەخشە و پلانـەکانیش سـەر دەگـرن، چـونکە تـاڵی و ژاری ئـەو جوداییەشی کە بەمن نیشاندا بۆخۆشی چەشتبووی.

ئەمشەو. ئەمشەو، هەرچی خۆشبەختی و ئومێد و کامەرانی و خۆشـیەکانە، کـە جارەهای جارم پێشبینی کردوون، دەرگای هەموویانم بە ڕوودا دەکرێتەوە.

دوایین هەفتەی مانگی فەوریە بوو و مـن وام مەزەنـدە کـرد کـە دوای سـاڵێکی رەبەق، ناخۆشی و سەختی و دژوارییەکان تێپەڕیوون و من و ماویسیش گەیـشتووینە هەواری مەبەستەکانمان.

هەر کە دایەرە تەواو بوو. بە پەلە بۆ کـڕینی هێنـدێك دەسـتودیاری وەڕێکـەوتم. ئەمشەو دەبێ بیکەینە جەژن،میوە، و شەراب و گوڵ و شـتێکی دیکـەش...چ بـێ؟ دواییش بێچووە پشیلەیەکی خۆڵەمێشی رەنگی ئێرانیـشم بـۆ مـاویس کـڕی. و وەك قوتابییەکی زۆر خۆشحاڵی قوتابخانـە، کـە دەچـێتە ژووانـی خۆشەویـستەکەی خـۆی، بەرەولای ویم تێتەقاند. و دیتم کە ئەویش بۆ ئەو ژووانەی خۆ ئامـادە کـردووە. هـەر دەرکە کرایەوە خۆی دەباوەشێ کردم و گوتی:

"ئای گوڵی لالە!"

"بەڵێ، لە بەروەی سوورگوڵ یەکجار گرانە، تا هاوینێ بۆت نـاکڕم، وەرە ئـەوەش هاودەمێك بۆ تۆ، هەرچەندە رێشی ناکەوێ هاودەمی تۆبێ."

"بە دوو دڵیەوە پشیلەکەی لێ وەرگرتم.

"ئەوە بۆ! دەڵێی حەزت لە پشیلەی نیە؟"

"با، ئەگەر ئەویش منی خۆش بوێ، دەنا نا."

بـەڵام وەك دیـار بـوو پـشیلەکە هـەر لـە دەقیقـەی هـەوەڵێوە ئـۆگری بـوو. چونکەدەستبەجێ خۆی دەکۆشێدا مات کردو دەستیکردە پرخەپرخێ.



"تازە ئەگەر لەبەر پشیلەکەش بێ ئیدی نابێ هەڵێی و برۆی."

"دەتوانم پشیلەکەش دەگەڵ خۆمدا بەرم."

"نـا، دڵنیـام جـارێکی دی کـاری وا ناکـەی. مـن زۆر شـێواو و پەشـۆکاو و ئالۆز ببووم و ترسام."

"بۆخۆم زیاتر ترسا بووم."

"چوو بوویە کوێ؟"

"لای نانەوایەکە."

"جا بۆ! لای نانەوایەکە؟"

"بەڵێ هەمان نانەوای کە نانی لێدەکڕم. ژوورێکم بەکرێ گرت. چونکە زووتر پێی گوتبووم کە ژوور بـەکرێ دەدا. دوێ شـەوێ چـوومە لای ئـەوان ژورێکیـان دامـێ و دوایەش هەر لە ئاشپەز خانە بچکۆلە و گەرموگوڕ و پاکەکـەی خۆیـان شـام و نـان و شیرینیشیان دامێ."

"بەڵێ دیارە کاتێ کە نیگەرانی و رەنج و نارەحەتیە من هێندەیان نەمابوو شـێتم کەن تۆ راتدەبوارد."

"ئەوان زۆریان رووداممێ وگەلێکیان بەخێر هێنام سەرەتا وای بۆ چووم کـە ئەگـەر لای ئەوانە بمێنمەوە زۆر ئاسوودە دەبم، بەڵام بە داخەوە کە شەو هـات و لـە تـۆ دوور کەوتمەوە، هێندەی نەمابوو لە غەموخەفەتان وەزگ دەم و بمرم. خەوم لێ نەدەکـەوت. ژوور سارد و تەخت وبان رەق وتەق. هێندەم فرمێسك رشتبوو سـەرینەکەم تـەڕ ببـوو وکاتێکیش هاتمەوە ئێرە دڵنیابووم کە ئیدی تازە تۆم لە دەست چووی."

"بەڵام وا نەبوو، کاتێ ویستم سۆبەکەی هەڵکەم. هەڵنەبوو. وەك بڵێـی فرمێـسك تەڕی کردبێ. ئەو دەمی دەرکە کرایەوە و پیاوێك دەباوەشێیی گرتم، ماچـی کـردم، و کردیە شەڕ و داد و هاواری لێ هەستا. ئـەو پیـاوە ئـازیز و خۆشەویـستەی منـیش تۆ بووی."

دەستیم گرت و ماچم کرد. و ئەویش هەر ئاوای درێژەدایە:

"ئەو دەمی تۆ وەك بروسكە ڕۆیشتیەوە، بەڵام بڵێسەی ئاگری سۆبەكە زمانەیان كێشا، كەوتنە سەما، و ژوورەكە گەرم داهات و دڵی منیش گەرمتر."
ماویس هەرلێی نەپرسیمەوە كە چۆنم زانیوە ئەو هاتۆتەوە من ئاوا دە وەختدا گەیشتوومیێ، لێم پرسی:

"ئێستاش ماویس، دەبیە كچێكی چاك؟"

"یانی؟..."

"جارێ هیچ، وەرە شامێ بخۆین. پشیلەكە شیری دەوێ، دەبێ ناوێكیشی لێنێین. دەبێ گوڵەكانیش دەئاوێ خەین... قاپی شۆرباكە لە كوێیە تا من ئاوێ گەرم كەم."

ئەوجا مژوول بووین. ئەو پشیلەكەی تێركرد و گوڵەكانی ڕێكخستن. و منیش شۆرباكەم گەرم كردەوە. ماویس بە دەم ڕێكخستنێ گوڵەكانەوە نارەناری ئاوازێكی بوو، یانی چی؟ ئایا دەیویست یادم خاتەوە كە دەنگێكی دڵەنگێزی هەیە و تەسلیمی حەزەكانی من دەبێ؟

دەمەویست هاواركەم و سووڕدەم و هەڵپەڕم، چەند گێل بووم! بەڵام لە جیاتیان شۆرباكەم گەرم كردەوە لەپڕ شۆرباكە هەڵچوو و بەسەر ئاگركەیدا ڕژا، ماویس هاواری لێ هەستا:

"ئەهای ئەوە چدەكەی؟""

من پێكەنیم، چونكە ئاوازەكەی ئەو وەك دەنگی ژنێكی دەچوو كە سەرزەنشتی مێردەكەی بكا، ئاوام هاتە گوێ. پرسیم:

"ئامادەی؟ من ئامادەم."

گوڵە لالەكان جیلوەیەكی تایبەتیان هەبوو. ماویس پەنجەی بە ناوەڕاست یەكێكیاندا كرد و پەڕەكانی لێ جودا كردنەوە و گوتی:
"سەیركە، ئەو میلە ڕەشانە دەبینی؟ ئەوانە دڵی لالەكانن كە وەبەر تاوێیان دەدەن. بە بێ هەتاو زۆر شاراوە و نادیارن. سەیركە پەڕەكان چۆن تێكەوە پێچراون! من لە ناو هەمواندا ئەو گوڵانەم خۆشدەوێن كە دڵیان دەشارنەوە و تەنیا بە ماچی هەتاو



دڵیان دەكەنەوە. هەندێ گوڵ هەموو دەمێ تەنانەت دە هەوای ساردیشدا پەڕەكانیان دەكەنەوە. و بەلای منەوە، ئەوانە هیچ و پووچ و جرپن و بەرهەڵدان."

ئەو جا بەلای سۆبەكەوە دانیشتم. ماویس گریانەكەی دەبن پێڵواندا بوو. دوایەش من شتێكم وەبیر هاتەوە و گوتم:

" دەی، ئێستا ئامادەی هەرچی بیلێم بیكەی.؟"

"یانی...؟"

"زۆر چاك دەزانی یانی، ماناى چیە. یانی كە مەشقێ بكەیت و فێرببی و گوتنێ بكەیە پیشەی خۆت و ببیە هونەرمەند."

هەناسێكی هەڵكێشا و گوتی:

"هەرچی تۆ دەتەوێ ئەوەیە. چبكەم. دەزانم سەرەنجام بەڵایەك هەر دێ. باوەڕكە، بەڵام نابێ هیچ كاتێك گلەیی و گازندانم لێ بكەی."

"من بەڵێنت دەدەمێ كە هەرگیز گلەییيانت لێ نەكەم."

"ئای كە خۆپەرستی، سەیركە چەند خۆشین، یەكتر دەبینین، باشە بۆ ئەو هەموو خۆشی و بەختەوەرییە بە شتێكی نادیار و نەدیتە بگۆڕینەوە، ئەوە گێلەتییە. شێتییە! لە ڕاستیدا ئینگلیز هەموو هەر شێتن."

"پیاوان هەموو شێتن، هەر نەبێ لە هەندێ شتاندا."

"ڕاستە. بۆ نموونە باوكی من، ئەویش هەر شێت بوو. بەڵێ، هەموو پیاوێك، هەرچۆنێكە بڕیارم داوە كە ئیدی بەرگری نەكەم. ژنەی جادووگەر دەیگوت ئەمانە هەمووی ڕوو دەدەن، ئادەمیزاد كە نەتوانێ دەگەڵ چارەنووسی خۆیدا ململانێ بكا، كەواتە  من شێتم ئەگەر بەرگری و بەربەرەكانێ بكەم. كێ چووزانێ، لەوانەیە ئێمە خۆمان ڕانێین و بتوانین دەبەرامبەردا چەنگە چڕپیەكی بكەین. یا ئەگەر دوای هاتنی بەڵایەكە و بەخێر بەسەرچوونی بتوانین پێكەوە بەختەوەر بین. من هەر ئەمشەو دەچم و لە بەرامبەر مەریەمەی پاكیزە نزا دەكەم و دەپاڕێمەوە."

"بوونەوەرێكی سەیری، شتی پڕوپووچ و گوماناوی تێكەڵ بە ئایین و ئایینزا دەكەی."

ئاخیریەکەی هەر سەرکەوتم. لە سەرەتای ئەم بێنەو بەرەیەیدا بوو کە من هەروام مەزەندە دەکرد کە ڕۆژێك دێ ماویس ڕازی هەر دەبێ، ئەو دەمی لە خۆشیان چبکەم! بەڵام خۆهەمیشە هەروایە، کاتێ مرۆڤێك بە دوای مەبەستێکدا دەچێ. پەلە قاژەیەتی و هەوڵی بۆ دەدا، کەسەریش کەوت وەك کەسێکی هێز لێبڕاو، بەتەواوی بێحاڵیەوە، سەیری ئەنجامەکەی دەکات و لێیدەڕوانێ. یا هەر پەشیمان دەبێتەوە. ئەم مەسەلەیە بەسەر منیش هات و منیش لەوەی نارەحەت و دڵگران بووم کە پاژێکی لە ژیانی ئێمە دابڕی. لەوەش نارەحەت و نیگەران بووم کە لایەنێکی ژیانی ڕاستەقینەی دڵنیایی ئێمە بەرەو چارەنووسێکی نادیارەوە دەچێ. حەزم نەدەکرد ماویسی لەو ژوورە، ئەو جێیەی کە گەورەترین بەختەوەریم تێدا دیبوو هەڵکەنم و بیگوێزمەوە.

دەبێ بیر لە ماڵ و ژیانێکی دیکە بکەمەوە. دەبێ کارێکی دیکە بدۆزمەوە. دەبێ واز لە ژنەکەم بێنم. خودایا! ئەوم هەر لەبیر نەبوو. کە دەبێ ئەو ئەرێ بدات و من ئازاد بکا.

لەوە بەولاوە من چۆن دەتوانم ماویسی بخوازم و بیهێنم؟

لایەنێکی دیش هەبوو کە هەر بیریشم لێ نەکردبۆوە و بەخەیاڵیشمدا نەهاتبوو بیر و ڕای مێرد کردنێ ماویسی بوو. ئایا ڕازی بوو ببێتە هاوسەری ژیانی من. یا بڕوا و ئایینزایەکەی لەمپەر بوو؟

هەوڵم دا لە بارەی دژواری و لەمپەرەکانەوە بیرنەکەمەوە و ئەمانە بەلاوەبنێم. ئەوجا بە ماویسم گوت:

" یەکەمین کارێکی کە دەبێ بیکەم ئەوەیە کە یەکێك لە مامۆستا هەرە گەورەکان ببینمەوە تا گوێی لە دەنگت بێ."

"بەڵێ:" ڕیزیۆ" ئێستا لە لەندەنە."

"بەڕاست؟"

"بەڵێ لە میوانخانەی ساوی. بەڵام نازانم دەتوانم ببینم یانە نا."

"شاگردان وەردەگرێ؟"



"هەر جارەی یەکێك."

"نەء، کچێك کە دوایین شاگردی بوو مرد و خەڵکیش دەڵێن.."

"دەڵێن چی؟"

"کە ڕیزیۆ بێجگە لە دەنگ خودی ئەو کچەشی خۆشویستووە."

من هیچم نەگوت وماویس ئاوای درێژە دایە:

"قەیدی چیە؟ لەوانەیە خۆشی ویستبێ، بەڵام مامۆستایەکی وا سەیرە ئاوا خۆی بداتە دەست هەست و نەستەکانی!"

"پێتوایە چۆناوچۆنی دەتوانین ببینین؟"

"تەنیا ڕێگایەك هەیە کە بەهۆی سکرتێرە تایبەتەکەیەوە نامەیەکی بۆ بنووسین و هەست و نەستە کونجەکاوییەکانی بوروژێنین."

"هەر ئەمشەو دەینووسم."

## ٢٣

هەروەکو گفتم دابوو نامەیەکم بۆ پاولۆ ڕیزیۆ نووسی. ڕاستیەکەی بوونی وی، دەو دەمەیدا و لە لەندەنیش، شانسێکی بوو. من سەرم لەوەی سووڕمابوو کە ماویس ئەو باس و خواسەی لە کوێ زانیبوو و چۆنی دەزانی. هەر دەبێ دە ڕۆژنامەکانیدا دیبێ، بەڵام تایبەتمەندییەکانی وی کە شاگردەکەی مردووە، و ڕیزیۆی زۆر خۆشویستووە، ئەمانە چی؟

نارەحەتیەکی تایبەتیم دەخۆمدا هەستدەکرد و وێنەی ڕیزیۆم دە ڕۆژنامانـدا دیبوو. پیاوێك بوو مەیلە و پیر و کەتە کە هیچ جێیەکی سەرنج ڕاکێشی نەبوو. بەڵام وام هاتە بەرچاوی کە پیاوێکی عاشق کارە. من دەمهەویست ماویسی بدەمە دەست ئەو پیاوەی تا بەسەعات بەتەنیێی دەگەڵدا بێت و هەرچی بڵێ ئەو بڵێ بەڵێ، من بەو کارەی دڵخۆش و ئاسوودە نەبووم بەڵام هیچ دەکرا؟ هەموو سەرکەوتنەکانمان بە شێوەی فێربوونی مەشقەکانی وییەوە بەسترابوونەوە. ئەمەجگە لە وەی کە من زۆرم

باوەڕ بە چاکی و ساغیە ماویسی بوو و دەشمزانی کە زۆر بەباشی دەتوانێ ئاگاداری خۆی بێ. ئەو دەجوانییەشدا شۆخەژن و ژن چاکێك بوو بۆ خۆی... گریمان ریزیۆی دەبینین، دڵنیا نەبووم ماویسی بەشاگرد وەرگرێ. هەمووشارەزای خوو ورەوشتی ریزیۆی بوون کە چەند ناهەموار و خۆپەرستە. هیچ پارە و پوولێك نەیدەتوانی شاگردێکی پێ وەرگرێ ئەگەر بۆخۆی نەیویستبایە، بۆ نموونە ئەو کچەی کە مادام"ئۆستاوا" هێنا بووی، هەم جوان، و هەم تابلێی دەنگێکی خۆشیشی هەبوو، بەلاّم ریزیۆ وەرینەگرت و نەگرت.

ریزیۆ لە بەر وردیلەییانی دەیتوانی وەری نەگرێ، یان بڵێ تازە تەمەنی فێربوونی وانەی دەنگی زۆرە، جگە لەوەش لەوانەبوو لە جێی شاگردە مردووەکەی یەکی دیکەی وەرگرتبێ. بەلاّم شتێکی بەڵگە نەویستش بوو کە ئەگەر ریزیۆ ئەم بلیمەتە بێ وێنەیە، ئەو وەرگرێ سەرکەوتن و ناوبانگی ماویس بێگومان یەکجارەکی بوو. چونکە ریزیۆ تا ئێستا تەنیا شەش گۆرانیبێژی فێر کردبوون، چوار پیاو و دوو ژن. هەموو ئەوانە گەیبوونە لوتکە و پەڕپەڕۆچەکەی پلەوپایە و ناودەنگی خۆیان. هەر کە ماویس تکایەکەی منی گرتەوە و رازی بوو، یەکەمین مامۆستایەکی کە دەبەرچاوی گرت ریزیۆ بوو. هەروەك ئەوەی ئەگەر بڕیار بێ فێری مەشقی دەنگ بێ، دەبێ مامۆستایەکەی هەر ئەو ریزیۆیە بێ و بەس. من تاوەرگرتنەوەی وەلاّمی ریزیۆی نەچوومەوە سەردانی ماویسی. سکرتێرەکەی نووسیبووی کە سەعات دە و نیوی بەیانیەکەی رۆژی شەممە لە لایەن ئاغای ریزیۆوە بۆ تاقیکردنەوە پێش وەختیەکان چاوەڕوانمانە. بڕیارم دا کە لەبەر دەرکی ئوتێل ساوی جێی دابەزینی ریزیۆی، لە کات و ساتی دیاریکراودا ماویسی ببینم و بێتەوێ. ماویس بەبێ هیچ سەرپێچیەك بە تەواوی خوێن ساردییەوە قبوولّی کرد.

لە رۆژ وسەعاتی دیاریکراودا لەبەردەمی ئۆتێلێ بووین. من چڵێك گوڵم بۆ ماویس کڕیبوو هەر کە دامێ پێمگوت:

"بە هیوای کامەرانی. داخوا چۆنی؟"



گوڵەکەی بە یەخەیەوە کرد و گوتی:

"زۆر چاکم."

لەپڕ شتێکم هاتەوە بەرچاو و گوتم:

"ماویس. نەکەی لە کاتی خوێندنێدا بیکەیە گاڵتەو گەمەو قەشمەر جاری؟"

"بۆ نموونە لەوانەیە چبکەم؟

"چووزانم" تۆ زۆر بەدفەڕ و نالەباری." (ئەم وشەیەم هەروا لە زاری دەرپەڕی.)"

"باشە جا ئەگەر هەر بەڕاستی پێتوایە. هەروا بەو جۆرەش دەبێ."

"نا ماویس گیان، کاری وانەکەی، بەڵێن بدە کە ئەوپەڕی هەوڵ و تەقەللا و کۆششی خۆت بخەیتەکار و بەکاریان بێنی... زۆر جارانم گوتووە کە هەموو شتەکانمان بەندە بە سەرکەوتنی تۆوە."

ماویس بە هەنگاوی پتەو و بەڵێنی پتەوترەوە بەرەو ناو ئوتێلێ کەوتە هەنگاونان، ومنیش بەو پەڕی نارەحەتیەوە کەوتمە دووی.

وەك ئەوەی بیەوێ بڵێ:

"من ئەو ڕێیە تا ئەوسەری دەبڕم، جا تۆ بێی، یانەیەی، بە ئاسانسۆر سەرکەوتین، بە دالاّنە درێژەکاندا تێپەڕین، تا گەیشتینە جێیەکەی ریزیۆ، و چووینە ژوری سکرتێرەکەی. یەکەمین شتێك کە سەرنجی راکێشاین، شارای گوڵی جۆراو جۆر و ڕەنگاوڕەنگ بوو کە سەر مێز، و سەر سۆبە، و هەرچوار دەوری ژوورەکەی داگرتبوو، و بۆنێکی کەسکوونیش لە گوڵە مەریەمەکانەوە دەهات، گەرمی ژورەکە و بۆنی گرانی عەتر و لەوەنتەش مێشکی ئێمەی سست کرد و حاڵەتێکی غەماوی دابە من و غەم دایگرتم.

ماویسیش سەیرێکی ئەملاولای کرد و دیتم لێوەکانی خۆی دەکرۆشتن شانەکانی کەمێك هەڵتەکاندن. بە سپایی پرسیم:

"پێت خۆش نەبوو؟"

وەلاّمی نەدایەوە:

ده و دەمیدا دەرگا کرایەوە و سکرتێری سینیۆر ریزیۆ، بە خۆ و بە چاویلکەی یەك چاو و گوڵی یەخەوە، هاتە ژورێ. دوای سڵاو و بەیانی باش، بەماویسی گوت و چاوێکیشی پێداگێڕا و گوتی:

"ئەوە خۆیانن؟"

"بەڵێ، خانم کۆترل، کە لە بارەیانەوە نووسیبووم."

"زۆر باشە ئێستا با بۆمنی بڵێن."

"لەم ژووره نا."

"بۆ؟"

"بۆنی ئەو گوڵانە پشوویان سوار کردووم و خەریکە دەمخنکێنن."

من بە نارەحەتیەوە سەیری ماویسم دەکرد. لە شێوەی قسەکانی نارەحەت ببووم، ودەگەڵ ئەوەشدا کە هەر دەقیقەیەك زیاتر لە نەخشە و پلانەکەی خۆشم پەشیمانتر بووم. بەڵام دەی بە هەر جۆرێك بوو، نەمدەویست ئەو کابرایە بڕەنجێ، مادامەکی کارەکە گەیوەتە ئێرە بابزانین دەگاتە کوێی دیش."

سکرتێر هێندێکی برۆ هەڵێنان و پرسی:

"خانم حەز دەکەن لە کوێی بڵێن؟"

"هیچ جیاوازییەکی نیە، من هەرگیز گوێ نادەمێ. بەڵام دێرەدا و لەم شوێنەدا هەرگیز."

"کەواتە، مۆڵەت بفەرموون، با ژوورێکی دیکە سازکەم." و لە دەرکێ چووە دەرێ. بەنارحەتیەوە بە ماویسم گوت:

"ماویس، کارێکی وانەکەی ئەو کابرایە تووڕە بێ."

"جا چیە، خۆ خودی ریزیۆ نیە."

"راستە. بەڵام ئەو کەسێکە کە دەبێ لە پێش ئەو هونەرمەندە گەورەیەوە ئاواز و دەنگەکان ببیسێ."



وام هەست دەکرد کە ماویسیش لەمن تووڕە و تۆسن و گرژ و مۆنترە. دە و دەمیدا سکرتێر هاتەوە و بردینیە ژوورێکی دیکە. ماویس سەیرێکی دەور و بەرێی کرد و گوتی:

"دەتانەوێ لێرەی بڵێم؟"

سکرتێرەکە تا دەهات خەریك بوو لە شێوەی قسەکانی ماویس بێ حەوسەڵە دەبوو، کەمێکی شان هەڵتەکاندن و گوتی:

"بەڵێ خانم."

"هەرگیز نابێ."

دووبارە سەر پێچیەکەی کابرای سکرتێری لە دین دەرکرد. ئەو وای دانابوو کە ماویس لەوێ بیلێ کە چی ئەو چووبووە داری لەعنەتێ کە نایلێ و گوتی:

"من لێرەی ناڵێم. من بۆ تۆی هەر ناڵێم تەنیا بۆ خودی سینۆر ریزیۆ نەبێ و بەس."

"ئاخر خانم ئەوە هەر نابێ، تا من گوێم لە دەنگێك نەبێ و چاکی و خراپیەی ئەو دەنگەی پێ نەڵێم هەرگیز پەسەندی ناکات و وەری ناگرێ."

ماویس هەستا و بەرەو لای زەنگی سەر دیوارەکەوە چوو و پتێکی پێوەنا، هەر دوای چەند چرکەیەك بەردەستێك هات. ماویس پێیگوت:

"رێزم بە سنیۆر ریزیۆ بگەیەنە و بڵێ خانمێك دەیەوێ بە خزمەتی بگا."

"بە ناوی کێ، مادام؟"

"مادام ریتاژانسی."

سکرتێرەکە کە بەسەر سامیەوە زەق زەق سەیری ماویسی دەکرد گوتی:

"بەڵام مادام..."

"ماویس زۆر بە خوێن ساردیەوە پشتی دەوی کرد و چوو لەبەر پەنجەرەکەوە راوەستا.

لە پڕ دەرگا کرایەوە و بەردەستەکە هاتەوە و گوتی:

"سنیۆر رێزیۆ دەڵێن با مادام بفەرمووێ."ماویس بە بێ هیچ ئاوڕدانەوەیەك بە لای مەدا، لە دەرکێ چووە دەرێ. سکرتێرەکە بە منی گوت:

"ئێوه گوتتان ناوی خانم کۆترله."

"وایه."

"ئەدی ئەو ناوە چییە؟"

"نازانم. دایکی ئەو خانمەی خەڵکی ڤییەننا بووە..."

سەعاتێکمان چاوەڕێ کرد، چ بوو؟ ماویس چی دەکرد؟

وەك سکرتێرەکە پێی شەرم بێ بە جێم بێڵێ، ماوەیەك دە ژووریدا هات و چوو. ئەوجا رۆژنامەیەکی دامێ، و یەکێکیشی بۆ خۆی تاودایە و دەستی بە خوێندنەوێ کرد. ئەو سەعاتە وەختە تەواو نەدەبوو. تا دەهات خەریك بوو شێت بم کە لە پڕ دەرگا کرایەوە و ماویس ئاماژەی کردمێ کە وەدوای کەوم.

سکرتێرەکە لە کونجەکاویان خەریك بوو وەزگی دەدا. زاری بەش ببۆوە و جارێکی سەیری من و جارێکی سەیری ماویسی دەکرد. ئەوجا بە خەیاڵی ئەوەوە کە کارەکەمان تەواو بووە و لەسەر رۆیشتنێین، کەوتە خواحافیزی. بەڵام ماویس بە بێ ئەوەی هەر ئاوڕیشی لێ بداتەوە بە منی گوت:

"ریزیۆ حەز دەکا تۆ ببینێ."

کەوتمە دووی تا گەیشتینەوە ژوورەکەی ریزیۆی. بە سپایی پەنجەی گەیاندە دەرکێ، دەرکەی کردەوە، و چووینە ژوورێ. ژوورێکی گەورە و پڕ پەنجەرەی بەرز کەهەتاوی پێدا دەهەموو جێیان گەڕابوو. پیاوێکی کەتەی زلە سڵاوی لێکردم. دەودەمیدا ماویس گوتی:

"سنیۆر. ئەوە ئەو دۆستەیە کە پێم گوتن."

سنیۆر دەستی درێژ کرد و تەوقەی دەگەڵ کردم و بە ئینگلیزییەکی رەوان پێخۆشحاڵی خۆی بە دیداری من دەربڕی.

من زۆرم کەیف بە روخسار، و چاوە تیژە خۆڵەمێکشیەکانی، و قژە ماش و برنجەکەی هات.

ریزیۆ گوتی:



"سەیر کە ئاغا، خانم بە چ جەربەزەییەکەوە ناچاری چاوپێك کەوتنێی کردم؟

من بەوە بەختیارم کە داکێ خانمێم ناسیەوە، ئەو یەکێك بوو لە جوانترین ژنانی هەموو دنیایە."

"ئەوەش مایەی بەختەوەرییە مەیە سنیۆر."

دەگەڵ ئەو هەموو لوتفەیدا کە پێشانی دەدا، گومان و گرێیەکم دەدڵیدا پەیدا بوو دوایەش گوتی:

"من گوێم لە دەنگی ئەم خانمە گرت."

ئیدی من لە خۆشییە چاوڕوانیە بیستنی ئەنجامەکەی لەرزم هاتبوویە. لە پڕ سەیرم کرد تەماشایەکی ماویسی کرد و هەر دووکیان بە رووی یەکەوە پێکەنین و ریزیۆ گوتی:

"خانم دەنگێکی زیاد لە پێویست بە هێز و پاکوبێگەردی ئەوتۆی هەیە کە هەموو جۆرە مەشق و راهێنانێك هەڵدەگرێ. من ئەو دەکەمە شاگردی خۆم، بەو مەرجەی کە تاسێ ساڵان هەر دەگەڵ خۆمدا بێت. بۆ هەر کوێیەك چووین، من هەر مەشقی دەم و فێری کەم."

"بۆ هەر جێیەکی بچن، هەر دەگەڵتدا بێ؟!"

"ئەوە شێوازی کاری منە، مەترسن، خانم سەرپەرشتیارێکی چاکی دەبێ چاوی لێی بێ، بۆ هونەرمەندێکی هەر هێندە بەس نیە فێر ببێت و گۆرانی بڵێت و بەس دەبێ فێر بێ چۆن ژیانێکی هونەرپیشەی هونەرمەندانە دەژی، جا لە بارەی تەندروستی، و خۆراك، و نووستن، وراوەستان، و دانیشتنەوە و بە کورتی تەواوی ئەو هێمایانەی بۆ ئەم کارە پێویستن فێر ببێ. هەر بۆیەشە کە شاگردانی من هەمیشە دەبێ راستەوخۆ لە بەر چاوی خودی خۆم بن."

من بەلای خۆمەوە پێموابوو کە مەشق کردنی دەنگ یان چەند سەعاتێکی چوونە لای مامۆستا بۆ مەشق کردنێ. هەرگیز بەرنامەی وام بە خەیاڵدا نەهاتبوو. بەسەر سامیەوە سەیرێکی ماویسم کرد، سەرەتا جۆرە بەزەییەك و پاشانیش حاڵەتێکی

گاڵتەجاڕیانەم دەچاوەکانیدا دیت. بەرەولای مامۆستاکەم ئاوڕدایەوە ودیتم کە هەر هۆشیشی بەلای منەوە نیە و هیچ سەیرێکی من ناکا و تەنیا هەر ماویسە بەلای ئەوەوە بوونێکی هەبێ.

تادوایی تینم دەخۆم کرد و گوتم:

"من دەبێ چاوێك بەو باسەدا بخشێنمەوە و تاوتوێیەکی بکەمەوە. تکایە بفەرموون کە بۆ مەشقی دەنگی خانمێ دەبێ چەندی پارە بدەین؟"

چاوەکانی تێبڕیم و گوتی: نرخی راهێنان و مەشقی من بە شاگردەکەمەوە بەندە. تەمەن. کەسایەتی. توانای دەنگ و شتی تر. بۆ نموونە لەبەر وەی خانم تەمەنی بیست ساڵە و قەد وقەوارە و پەیکەرێکی بچکۆلانەی هەیە..." لێرەدا مستێکی لە سینگی خۆی داو گوتی:

"هەر گۆرانیبێژێك پێویستە سینگێکی پان و پڕ و گەرووپەکی بە هێزی هەبێ... خانمیش بۆ گۆرانیبێژیە زۆر بچکۆلانەیە بەڵام... دەنگەکەی بێ وێنەیە... دەنگێك کە دوای مەشق و راهێنانی پێویست دەبێتە دانە گەوهەرێك. جا بۆیە کەسێك کە ئەو کەمایەسییانەی سەرەوەی تێدابێ، نرخی فێرکردنەکەی من سێ هەزار لیرەیە."

چاکم لە بیرنیە. بەڵام وا دەزانم لە پەشۆکاوی و سەرسامیانم زارم بەش بۆوە.

لە تەواوی ئەوماوە درێژەیدا کە دەدوا دڵنیا بووم کە پارەیەکی کەلان دەڵێ، بەڵام پێشموابوو کە ئەو گوژمە پارەیەش هەرچەندێك بێ، وەك مووچەی مانگانە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا و بە پچڕ پچڕ دەدرێ. و هەرگیزیش چاوەڕێی ئەوە نەبووم کە ریزیۆ گوتی:دیارە دەزانن کە ئەو گوژمە پارەیە خۆراك وسەفەر وهەمووشتێکی خانمێش دابین دەکا، ساڵی هەزار لیرە زۆر نیە ئەویش بۆ مامۆستایەکی وەکو من، کە شاگردەکەشی لە بەرچاوی خۆی و بە شێوازی خۆی چاودێری دەکات و ئاگای لێی دەبێ."

"بەڵام سنیۆر. لەوانەیە کە سێ هەزار لیرە بەلای ئێوەوە بۆ مەشق دادانێك و فێرکردنێکی ئێوە زۆر نەبێ بەڵام من توانای دانی ئەو پارەیەم نیە."



من هەر لە سەرەتاوە دەمزانی کە ریزیۆ بڕیاری وەرگرتنی ماویسی داوە و لەو بڕیارەشی دڵم خوێنی دڵمی دەخواردەوە. دووبارە ریزیۆ گوتی:

"سەیرکە ئاغا، من کارێکی دەکەم کە ئێوە رازی بن. خانم کچی ریتا ژانسییە کە من پەیوەندییەکی زۆر و رێزێکی تایبەتیم بۆی بووە. پێموایە خودی خانمیشم کە ئەودەمی منداڵ بووە لە ڤییەنا دیبێ.

بۆیە لەبەر خاتری رۆژانی پێشوو، و لەبەر خاتری ئەو بیرەوەرییانەی کەمن لەو رۆژانەم هەیە، و بەخاتری ئەو دەنگە ناوازەی خانمیش هەیەتی، من ئەو پارەیە دادەشکێنم و بۆ سێ ساڵ مەشق و راهێنان و فێرکردنی دەنگ و سەر پەرشتی و ئاگالێبوونی راستەوخۆی خۆم لێی تەنیا هەزار لیرەی کاشتان لێوەردەگرم.

دەمتوانی چ بڵێم؟ چۆنی تێبگەیەنم کە پەیداکردنی هەزار لیرەکەش بە ئەندازەی سێ هەزار لیرەکە سەخت و گرانە، لە رۆیشتن بەولاوە لێرە، چارەیەکی دی نەبوو. هەر گوتیشم:

"دەبێ بیرێکی بکەمەوە. و هەموو شتەکان دە بەرچاو بگرم."

پیاو بۆ خواش بڵێ کە ئەویش لە لانی خۆیەوە ئە پەڕی پیاوەتی و لە خۆ بووردەیی پێشان دا. دەودەمیدا ریزیۆ گوتی:

"دیارە، دیارە، ئاگادارم، ئێوەش دەبێ دەگەڵ خانمێدا راوێژێکی بکەن، بە تایبەتی کە ئەم کارە دەبێتە هۆی لێك هەڵبڕان و جوداییتان."

بە پەلە گوتم:

"جودایی؟ شتی وا هەر نابێ. خانم بچێتە کوێ ئەمنیش لەوێم، ئەوەش بزانن کە من دەبێ هەموو رۆژێی هەر ببینم."

ئالێرەدا ریزیۆ شانەکانی تا بناگوێیان برد، لێوی خوارێی هێنا پێش و گوتی:

"کاتێ خانم لە ژێر رژێم و فەرمانەکانی مندایە دەبێ هەر گوێڕایەڵی من بێ و رێنماییەکانم جێبەجێ بکات، و لەوە بەولاوە ئەگەر وانە بێ من لە فێرکردنێی دەست دەکێشمەوە و پاشگەز دەبمەوە، و پارەکەشتان دەچێت."

"تا مەرجەكانی نێوانێمان بە تەواوی نەبڕێتەوە و ڕێك نەكەوین من هیچ پارەیەك نادەم."

"و منیش لەوەرگرتنی خانمی پاشگەز دەبمەوە و ئەویش هەرگیز نابێتە گۆرانیبێژێكی گەورە."

من بە ناچاریەكەوە تەماشایەكی ماویسم كرد بەلأم نەمتوانی هیچی لێوە تێبگەم، وەك ئەوەی بیەوێ بڵێ تەواوی بەرپرسییەكان لە ملی من ببەستێ. بە ریزیۆم گوت:

"سنیۆر دانی هەزار لیرە بۆ من كارێكی هەروا ئاسان نیە. دەبێ هەزار جۆرە حیساب و بەرخوردانی لێبكەم.

چەندم مۆڵەت دەدەی؟"

"ئەگەر هەوای ئێرەم پێ بكەوێ ئەوا تا دوو هەفتەی دیكە لێرەم."

"كەواتە بە ئیجازەی ئێوە دوو هەفتەی دیكە هەر دەو سەعاتەیدا دێمەوە لاتان."

هاواری كرد:

"سەعات (١٠) دە؟ خوانەكا. ئەوڕۆش من هەر نووستبووم، ئیسراحەتم دەكرد، و خانم بەو چاپووكیەی خۆی ناچاری كردم بەو پەلەپەلەوە ئامادە بم بەلأم جارێكی دی وانابێت."

"ئەدی چ سەعاتێك سنیۆر؟"

"ئێوە دەگەڵ خانمی بۆ نیوەڕۆیە وەرنەوە لای من، سەعات یەك و چارەكی دوای نیوەڕۆیە، كەواتە تا ١٥ پازدە ڕۆژی دیكە خواحافیز."

ئەوجا تەوقەی دەگەڵە مندا كرد و دەستی ماویسیشی ماچكرد و وەدەركەوتین.

## ٢٤

دیدی ماویس هەرچی بوو، هیچی نەدەگوت. و ئێمە ماوەیەكمان هەروا بە بێدەنگیەوە ڕێ بڕی. لە پڕ وەبیرم هاتەوە كە یەك شەممەیە رووم دەوی كرد و گوتم:

"ماویس من دەبێ بڕۆم. ئەوشۆ دێمەوە پێكڕا قسان دەكەین."



سەرێكی بە مانای رازیبوون بادا.

هەمدیس گوتم:

"من زۆر نیگەرانم، نازانم چبكەم دەبێ دانیشین و قسان بكەین. ئەو مەسەلەیە لەوە بەولاوەترە كە من بیرم لێ دەكردەوە."

زەردەیەكی سووكەڵەی هاتێ و هیچی نەگوت. لێرەدا ئەوم بە جێهێشت و چوومەوە ماڵێ. ئەیوا لە بەرەوەی كە نەچووبوومە كەنیسە و تا ئەمدەمەش نەهاتبوومەوە تووڕە بوو. دەتەواوی ئەو ماوەیەیدا كە نیوەڕۆژمان دەخوارد، بێدەنگ بوو و بەتووڕەییشەوە كورتە سەرنجێكی غەزەبێی دەدامێ. نیوە رۆژە تەواو بوو و ئەیوا بە هەڵپنمانێكی تەواوەوە دەحاڵێكدا كە گریسیشی بە دواوە بوو هۆڵەكەی بە جێهێشت و من تەنیا مامەوە.

كاتێ كە قەرەواشەكە هات سفرەكە خڕ كاتەوە، من بە ناچاری چوومەلای پەنجەرەكەوە دانیشتم و لەكەلێنی پەردە لێوار دڕاوەكانەوە سەیری باغچە بچكۆلانەكەی سوورگوڵەكانم دەكرد كە تەنیا ئەوشتە بوو من و كچ و ژنەكەمی پێكەوە دەبەستینەوە ـ بیرم لەوكێشەیە كە بێدەرەتانی كردبووم و بەدەستیەوە پێوە ببووم دەكردەوە. لە راستیدا ئەمە گەورەترین گرێ كوێرەیەك بوو كە تووشم ببوو.

ئێوە وەزعی من بێننە بەرچاوی خۆتان. هەروەكو گوتم بوونی بانكیم لە پەنجا لیرە زیاتر تێنەدەپەڕی. رەنگە كەمتریش. چونكە دەو ماوەیەیدا، بە بێ حیساب، بەردەوام، گوڵم بۆ ماویس كڕیبوو و هیچ گوێم نەدابووە قەردان، تەنیا پشتیوانیشم ئەوەندە پارەیەی بیمەكەی ژیانم بوو. كە هەرچی سەنەدەكانی بوو دەگەڵ كاغەز و ماغەزی ماڵێ لە جێیەكی توندو تۆڵ، لای ئەیوا هەڵگیرابوو، وخۆ ئەگەر گریمان بمتوانیبایە رایكێشمەوە، تائێستا نیوەشی نەدەما.

خانووەكە ئی خۆم نەبوو و هیچیشم نەبوو رەهنی كەم و داینێم. ئاهێكیشم نەبوو و هەزار لیرەش پارەیەكی كەم نەبوو.

هاتمە سەر خەیاڵی هەفتەی یەك لیرەكەی ماویس. كە گریمان ئەگەر هەموو حیسابەكەی ئەویش لەبانك راكێشمەوە، هێشتا ناچار بووم پێنج سەد شەش سەد لیرەی دی هەر بخەمە سەریّ. لەوەش بترازێ خۆ ماویس نەدەبوو بە دەستی بەتاڵ بچێتەوە لای ریزیۆ.

وام هاتە بەرچاو كە پێویستە بە یەكجارەكی واز لە ریزیۆ بێنم، و رێیەكی دی بدۆزمەوە، بەڵام كام رێ؟

لەبەردەستبوونێ ریزیۆی ئەنجامەكەی دڵنیا و مسۆگەر بوو و جگە لە مەشق و راهێنان دەنگیش، ئەزموون و پەروەردەی تەواوی هونەرمەندیشی دەودا پێدەگەیاند. ریزیۆ خۆشەویستی ورد و درشتان بوو و لە هەموو جێیەكی بە رێزەوە ناوی لەسەرزاران بوو. ئەو هەرگیز رێی بە شاگردەكانی نەدەدا تا دوایین رۆژەكانی مەشق تەواوكردنێ بچن لە شوێنە گشتیەكاندا گۆرانی بڵێن. بەڵام من دەمزانی كە ماویس، دەگەڵ ئەو هەموو جوانی و خۆشەویستی و كەسایەتی و رەسەنایەتیەشیدا كە هەیەتی بە مەشق و راهێنانی ریزیۆشەوە دەبێتە شتێكی یەكجار بەرزو بێوێنە.

دیارە ئەو هەموو لایەنە جوانانەش كەمتر دەكەسێكیدا كۆدەبێتەوە. من لە لایەكیەوە دڵم نەدەهات واز لەو نەخشە و پلانە بێنم و دڵێشم نەدەهات بە ماویس بڵێم كە توانای ئامادەكردنی ئەو پارەیەم نیە، و دیسانەوەش دڵم نەدەهات كە ئەو بنێرمە لای مامۆستایەكی پلە دوو یا سێ بۆ فێربوونێ.

بە تایبەتیش كە دەمزانی فێربوونی بەردەستی ریزیۆی ئەنجامی دەبێ.

بەڵام لایەنەكەی دیكە جوداییە من و ماویسی بوو. زۆر لە گوین بوو كە ریزیۆ دەستور بدات كە ئێمە یەكتر نەبینین و من هەستی ئەوەشم دەكرد كە مەبەستێكی واشی هەبێ. دیار بوو كە ریزیۆ جگە لە دەنگەكەی ماویس چێژی لە جوانیەكەشی وەردەگرت. بەڵام من ئەوەشم چاك دەزانی كە ماویس زۆر بەباشی دەتوانێ ئاگای لە خۆی بێت و خۆی بپارێزێ.



ئەڵبەتە ریزیۆ وای دادەنا كە هەم دایكی ماویسی دەناسی و هەم خۆیشی دیوە، و هەر دەو ماوە كورتەشدا ئاشنایەتی و دۆستایەتییەكی قوڵیان كەوتبووە نێوانێوە. بەڵام لە راستیدا ئەوە ئەركی ماویسی بوو و بۆ وەدەست هێنانی هاورێییەتی و متمانەی ریزیۆش ئەوە راستترین كارێك بوو. دەنا رەفتاری وی دەگەڵ سكرتێرەكە یا دەگەڵ منیشدا لەسەرەتای ئاشنایەتیەماندا چبوو؟"

لێرەدا، ئەو كە لەبەردەمی میحرابێی چۆك دادا بوون و نزای دەكردن و دەپاڕایەوە، وەبیرم هاتەوە، و باوەڕیشم هات كە ماویس پاكترین و پیرۆزترین ژنێكە، چونكە هەمیشە هەستم دەكرد كە كارەكانی وەك بۆنێكی زۆر خۆش كە بەملاولایاندا بڵاوبێتەوەو هەموو شتەكان بۆنخۆش كا ئاوای منیش ئەفسووناوی دەكرد وگیانێكی سەیر و سەمەرەی وای دەمندا دێنایەكایەوە، باس ناكرێ.

من دەبوو، تەنانەت دە دنیای خەیاڵیشدا، گومانێك دەربارەی وی بە دڵدا نەهێنم. بەو خۆشەویستیەی كە ماویس بەرامبەری منی هەبوو دیار بوو كە تاكۆتایی هەر بە ئەمەكداری دەمێنێتەوە، و خۆ ئەگەر لەمپەرێكیش بۆ یەكتر دیتنێمان هاتبایەتە پێشێ ئەو بۆخۆی لای دەدا و نەیدەهێشت، كەواتە ئەو سێ ساڵ خولەی تاقیكردنەوەش بە دان بە خۆداگرتن و قوربانی و فیداكاری بەسەر دەچێ و تەواو دەبێ.

## ٢٥

كاتێ كە چوومە سەردانێی، دیتم ئەوە بەلای پەنجەرەكەوە دانیشتووە و واچەمیوەتەوە نێوچەوانی بە شووشەكەوە نووساوە. سەیری كۆڵانێی دەكرد. بە بێ وەی بجووڵێ یا ئاوڕێكی بداتەوە، گوتی:

"ئەوە تۆی؟ وەرە سەیركە."

چووم و لە پەنجەرەكەمڕا تەماشای خوارێ كرد.

"هیچ شتێك نابینم."

"نا...بە راستتە، هیچ نیە. دەگەڵ ئەوەشدا رەنگە ئەوە تەنیا یادگارێکی ئێمە بێ."

هەستا، چاوی دەمنەوە برین. و ئەوجا دەستی گرتم و بە روومەتەکانی خۆیەوە نا و گوتی"

"ئای خۆشەویستە ئازیزەکەم.وەرە با بە بوونی یەکتری قنیاتێ بکەین. هەر بەوەندەی کە هەیە بیسازێنین، قەیدی چیە. ئەوە یەکتریمان هەیە. پێکەوەین، ئەگەر هەر لەو ژوورەوە سەیری ئەملاولای خۆمان بکەین زۆر شتی بچکۆلانەی جوان و بەرچاو هەن، دڵخۆشکەرە، گوڵە هەمانە، دوو قاپە شۆرباوە دوو پێکە شەراب و سۆبەیەکی گەرم وگوڕ، وەنا؟ هەموو ئەمانە باش و جوان و دڵ پەسەندن. ئاه! دەوەرە بابەوەندەی قنیاتێ بکەین و بەسمان بێ."

من لەسەر کورسی دانیشتم، و ئەو هەروا دەستی منی دەدەستی دایەو یاری پێدەکاو وردە وردەش دەدوێ. هەروا دەستم بە دەستی دادێنێ ومیهر و خۆشەویستی دەنوێنێ، تا کاتێ ئیدی لە وزەمدا نەما. بڵندم کرد و وەك مندالێکیم بە سینگی خۆمەوە گوشی و گوتم:

"وای ماویس، گیانە شیرینەکەم، هیوای ژیانم. تۆ هێزت لێبڕیم، وەك بڵێی خەریکە بێمە سەر ئەوەی بە یەکجارەکی واز لەو کارەی بێنم."

"وای، تووبی خودا, تووبی خودا!"

"من تێناگەم. لە بیرتە لە سەرەتای ئاشنایەتیەمان چەندت حەز و ئارەزوو هەبوون و ئێستاش..."

"ئاخر ئەو دەمی تۆم نەبوو."

"باشە لە چی دەترسی؟ نارەحەتی چی؟"

"تەنیا کاتێك بەلاّ و ئازارێك بەسەر من دێت کە تۆ دەگەڵمدا بێ ئەمەك بیت و منیش لەوە دڵنیام کە ئەوە هەرگیز لە تۆ ناوەشێتەوە."

"هەرگیز، هەرگیز من بێ ئەمەکی دەگەڵە تۆدا ناکەم."



"زۆرکات و زۆر جاری وادەبێ مرۆڤ هەڵخەڵەتانێ بەلاّم ئەگەر تۆ بەڵێنم دەیەی و گفتم پێ بدەی من هەرگیز گومان ناکەم. چونکە باوەڕم وایە کە تۆ نەجیب وراست و ڕەوانی و هەرگیز ناکرێ هەڵە یا گوناهێك لە تۆوە رووبدات و دەرکەوێ."

هەروا کە بێدەنگ و ئارام دە باوەشێمدا بوو هەستم کرد کە لەرزێك سەرتاپای داگرتووە و گوتی:

"ئەگەر من بەکردار، بە گوفتار یا تەنانەت بە بیر و خەیالیش خەیانەت لە تۆ بکەم، خودا هەردوو چاوم کوێرکا."

بە جۆرێکی وا ئەو سوێندە بەزاریدا هات کە هەر بە نزاو پاڕانەوە دەچوو تا بە سوێند."وای، ماویس، ئەوقسانە مەکە، خۆ دڵت دەرێنام، ئەوقسانە چین، تووك و نەفرینان لە خۆت مەکە، چونکە دەڵێن ئەو شتانە لە خۆت زوو گیرا دەبن."

خۆی دەباوشی هاویشتمەوە پەنجەیەکی نایە سەرسینگم و گوتی:

"سەیرکە. سەیرکە تۆش هەر باوەڕت وایە، کەچی بە منیشت دەگوت تۆ خەیالی و شتی پووچ پەرستی."

"من باوەڕم بەوە نیە کە تۆ ببیە گۆرانیبێژێکی گەورە، من بەلاّیەکم بەسەر بێ. بەڵکە بە سۆز و خۆشەویستیت بەختیارم دەکەیت و هەرچی حەز و ئارەزووەکانیشمە بەتۆوە دێنەدی."

"هەموو ئەوشتانە بە چوونی من بۆلای ریزیۆ دێنە دی؟"

"بەڵێ، بەمەرجێك تا کۆتایی دەگەڵ مندا بە ئەمەك و بەوەفابی. من دڵنیام ریزیۆ رێ لە چاو پێکەوتنی ئێمە ناگرێ، چونکە بەڵگەیەك نیە، ئەو تەنیا رێی ئەوشتانە لە تۆ دەگرێ کە بۆتۆ خراپ و زیانبەخشن."

"باشە، تۆ بڕیاری یەکجارەکی ئەوەت هەر داوەکە من بە ریزیۆ بسپێری؟"

"نازانم راستیەکەشی ئەوەیە کە من تا هێشتا نەپرژاوم و پێم نەکراوە بزانم چۆناوچۆن و لە چ رێیەکەوە دەتوانم پێویستیەکانی ئەم کارە دابین بکەم. بەلاّم دڵنیاش بە هەر رێکی دەخەم."

سەر لە نویٚ سەری بەسینگی کردمەوە و ئیدی هیچی نەگوت و ماوەیەکی دوور و درێژ هەروا دانیشتین و من بە پەشۆکاوییەکی تەواوە وەبیرم دەکردەوە ئەو مەتەڵەی چۆن حەل کەم، چۆناوچۆن هەزارلیرەی بە دوو هەفتان پەیداکەم و "ئەیوا"ش نارەحەت نەکەم، دەبیٚ بیر لەویش بکرێتەوە، خۆپیاو ژنیٚ خۆی رووت ناکا."

ئیدی ماویس نەیپرسیەوە و لە مبارەیەوە کەمن چۆناوچۆن و بە چ رێگایەك دەمهەویٚ پێویستیەکانی ئەم کارە بێنمە دی هیچ قسەیەکی نەکرد، بەڵام ئەو شەوە سۆز و میهرەبانی و خۆشەویستی و گەش و بەشیەکەی دوو چەندان ببوو. وەك ئەوەی بیهەویٚ ئاوا لەو رێیەوە وازم پیٚ لە نەخشەکە بێنیٚ. بەڵام تا ئەو کارەم سەخت و دژوارتر بهاتبایەتە بەرچاو من سوورتر و توند و پتەوتر دەبووم لەسەری.

ئەو بیرو لێکدانەوانەش وایان تین بۆ هێنابووم کە خەو و خۆراکم لیٚ هەڵگیرابوو و یەکجار توورە و تەنگاویش ببووم. سەرەتا نەمدەتوانی بچووکترین رێیەك بۆ کردنەوەی ئەو گریٚ کوێرەیە بدۆزمەوە. بەڵام وردە وردە زۆر رێگام وەبەر چاوان هاتن.

یەکەمین رێگایەکم کە وەبەر چاوان هات ئەوە بوو کە ئەگەر خزم و کەسەکانی ماویسی یاباشتر بڵێم خزم و کەسەکانی باوکی، ئەگەر سووسەیەکی لێوە بزاننەوە و بزانن کە نەخشەیەکی ئائاوای بۆ ئایندەی کێشراوە دەبیٚ ئامادە نەبن هەر یەکە بە گوێرەی خۆی یارمەتییەکی بدا؟

بەڵام دووشت هەبوون کە نەیاندەهێشت پشت بەو بۆچوونەم ببەستم. یەکەمیان ئەوەیە حەزم نەدەکرد لە خۆم بەولاوە کەس یارمەتی ماویس بدا و من ئەوەم تەنیا هەر بە مافی خۆم دەزانی و ماویس ئی من و ئایندە و ناوبانگە و دەرکەوتنی وی تا ئەندازەیەك بەمنەوە بەند بوو و من پێم ناخۆش بوو و حەزم نەدەکرد یارمەتی لە کەسانێکی نەدیتی و نەناسی وەرگرم. سەرەڕای ئەوەش نەمدەویست ماویس بەمە بزانیٚ. چونکە ئەودەمی کە بیزانیبایە لەوانە بوو تەواوی دەمەقاڵێکان نویٚ ببنەوە، چونکە ماویس هەرگیز دەربارەی ماڵە بابی خۆی هیچی نەدەگوت و منیش هەستم دەکرد کە بیرەوەرییەکی تاڵ و ژاری ئەو بابە خۆپەرستەی دەدڵیدایە. من ئەو مافەم



دەدا کە لە نێوان دایك و باوکیدا بەلای دایکیدا کەوتووە و ئەوی هەڵبژاردووە. دوایەش بڕیارم دا بەتەنیٚ بچمە ئەو گوندەی هەمیشە پێی هەلاٚ دەگوت کە پێش بیست ساڵ لەمەوبەر تێیدا لە دایك ببوو و زۆر چاکیشی بۆ من باسکردبوو کە چۆنە و لە کوێیە.

بۆیە بیٚ ئاگاداری ماویس و دیارە بیٚ ئاگاداریە"ئەیوا"ش کەپێی وابوو بۆکاروباری دایەرە دەڕۆم. بەرەو "سوسکەس" کەوتمە ڕیٚ. و بۆ شوێنە ونکردنێش چەند جارێکانم ئۆتومبێل گۆڕی، و دوایەش دەگەڵ شوفێرەکەیدا بۆ دۆزینەوەی جێی مەبەست کەوتمە ڕیٚ. میوانخانە، و مەیخانە، موغازە نەما نەپرسم تا سەرەنجام ماڵەکەم دۆزیەوە.

لەو دەمیەوە تا ئێستا زۆری کرێچی چووبوونیٚ و رۆیشتبوون، دانیشتووە راستەقینەکانی ئەویٚ خانوو و باغەکەیان کڕیبوونەوە، کەسیشیان لەوانە نەدەناسینەوە کە ئێمە بە دوایاندا دەگەڕێین. تەنانەت جوانیە بەناوبانگ و بیٚ وێنەکەی داکیٚ ماویسیش شوێنەوارێکی لەسەر ئەو لاپەڕانەی ئەویٚ جیٚ نەهێشتبوو و بچووکترین سەرەنجامێك وەگیر نەهات. تەنیا ختوورەیەك نەبیٚ کە دە دڵی مندا پەیدا بوو لەوسەر دانەی جیٚ لە دایکبوونی ماویسی. کە ئەویش ئەوە بوو کاتیٚ کە تازە دەگەیشتمیٚ و ژنم نەهێنابوو، خودایە! بۆ فریشتەیەکی میهرەبانی نەهات و بەگوێیدا نەچرپاندم کە ئا ئەلێرەدا منداڵێك لە دایك دەبیٚ و لە پێناویدا ماڵوێران و بەدبەخت و چارەڕەشیش دەبم؟

خودای مە بۆچی دەتاریکیەماندا بەرهەڵدا دەکەن تا لە ڕێی ژیان و رووناکی لاڕیٚ بین و کوێرانە دە تاریکیە دا پەلان باوێین و لاقان بکوتین و دەست لەملانی ناکامیە بین دواییش بە بیٚ هیچ سەرەنجامێك ئەم دنیایە جیٚ بێڵین.

بەڵیٚ ئەو خودا و ئەو چارەنووسە لە کوێن وا هەر چەندی لێیان دەگەڕێین نایاندۆزینەوە؟

ئەو خودایە کەی دەزانیٚ؟ مادامەکی خۆی بشارێتەوە، ئێمەی بەندەی مەفلوك، هەرگیز ناتوانین بیدۆزینەوە!

ئەو رەوشتی خۆشاردنەوە و خۆپەنادان و بزرکردنە لە قەشمەری و گاڵتەجاڕیەك بەولاوە هیچی دی نیە. و من کە بەندەیەکی هیچم، خەریکە ـ پەنا بە خوا ـ لە بەندایەتیە دەردەچم.

من لەو سەفەرەمدا جگە لەکات بە فیڕۆدان و خەرج کردنیّ پارەیەکی کە دەودەمیدا بۆ من زۆر بوو هیچیدیم وەگیر نەکەوت و کە لە دۆزینەوە و سەر سۆراغکردنیّ خزم و کەسەکانی ماویسیش نائومێد و هیوابڕاو بووم، هاتمە سەر خولیای کەس و خزمەکانی خۆم و بەلای وانمدا بادایەوە.

من دوو برام لە "کرن واڵ" هەبوون کە دەستیان بە خۆ رادەگەیی و کاروباریان دەسووڕا.

ئێمە هەرگیز پێك نەدەچووین، و من دەمێك بوو ئەوانم جیّ هێشتبوو و هاتبوومە لەندەن. پەیوەندییەکانمان پێکەوە زۆر کەم و زۆر لاواز بوون و تۆ بڵێیّ هەر هیچ نەبوون. هەربۆیەش نەدەچووە مێشکەوە کە هەوڵ و تەقەللایەکەم بگاتە چ جێیان و هیچی لیّ شین بێتەوە. و نە ئەوانیش کەسانێك بوون باسی پارەیان لا بکەیت و نەڵێن ئەدی بۆ پاشەکەوتت نیە و لەلایەکی دیکەشەوە دەبوونە مایەی کونجەکاویە بۆ ماویسیش.

بەڵام من ناچار بووم ئەو تاقیکردنەوەی هەر بکەم و بزانم. بۆیە یادداشتێکم بۆ جۆرج نووسی کە بۆ کارێکی گرینگ دەمهەویّ سەرێکی لێدەم و بیبینم. و ئەویش بەتەواوی خۆشحاڵیەوە وەڵامی دایەوە کە زۆر دڵشاد و خۆشوەختی ئەو سەردانەیە.

تامن نامەکەم بۆ جۆرج نووسی و وەڵامی هاتەوە، رۆژی هەینی هاتەوە، یانی نزیکەی هەفتەیەکمان بە فیڕۆ دا و تێپەڕی. من بە ئەیوام گوت کە بۆ پشووی دوا رۆژەکانی هەفتە دەچمە کرن واڵ لای برایەکەم. و ئەو بەسەرسامیەوە گوتی:

"سەیرە من ئاگام لیّ نیە کە نامە و نامەکاریتان دەنێواندا هەیە! "

"هیچ لە گۆڕیّ نیە تەنیا ئەوەندە نەبیّ کارێکی پێویستم پێیەتی و دەچمە لای."

و بۆیەکەمین جار "ئەیوا" قولاغ بوو تا بزانیّ ئەوکارە چیە. بەڵام هیچی لەمن



وەرنەگرتەوە. دەگەڵ ئەوەشدا کە من و برایەکەم نێوانمان نەبوو، کەچی دەربڕینی خۆشحاڵیە جۆرجی لە دیتنی من زۆری کارتێکردم، منی خۆشبین کرد. داخی ئەوەم خوارد کە بۆ ئەو ماوەیە تا ئێستا هەواڵێکیم نەپرسیوە چونکە بە هۆی بیّ ئاگایی و ئەو ماوە درێژەوە، لێك غەوارە بووبووین. من هەوڵم دەدا جۆرج بێنمە بەرچاوی خۆم و بەرجەستەی بکەم، چل و چوار ساڵە. لە ژیان رازی و ئەندامی ئەنجوومەنی ناوچە و ئەنجوومەنی شارەداری و ئیدی و ئیدی" خاوەن پلەوپایە و شوێنی ئابڕوومەند و خاوەنی پێشینەی پڕشانازی و کاری چاك. سەرناس،رێزدار، جیّ متمانەی خەڵکی، خاوەن ژیانێکی ئاسوودە و بە دڵنیاییەوە ئەگەر من لە رێیەکی راستەوە کەوتبامایە قسەوە دەگەڵیاندا، نوختەی هەستیاری وانم دیتبایەوە، هەرگیز داوایەکەیان رەت نەدەکردمەوە و دەستیان بەڕوومەوە نەدەنا، تەنانەت ئەگەر بمتوانیبایە هەر پێنج سەدلیرە لەوان قەرد کەم بە هەر شێوەیەکیش بایە بەشە بیمەکەشم لە چنگی وی هەردەردەهێنا و پێنج سەدلیرەی دیکەشم هەر لەویّ دابین دەکرد. من زۆربەی شەوان ماویسم دەدیت. شەوێکیان داوام لێکرد کە پێویستیەکانی خۆیم پیّ بڵیّ تا جل و بەرگ و شتی پێویستی دیکەی بۆ ئامادە بکەم. من دەمتوانی تا پەنجا لیرەی بۆ ئەو شتانە بۆ خەرج بکەم، بەڵام ئەو پەنجەی نایە ناو گوێیەکانیەوە تا قسەکانی من نەبیسیّ و گوتی:

"تۆ نابیّ ئیدی هیچ شتێکی دیکەم بدەیەی...نا، نا، نابیّ. ئەدی ئەو پارە کەلانەی دەیدەیە ریزیۆی بەس نیە؟ ئەدی ئەوەندە پارەکەی خۆم بۆچیە، ئەدی نابیّ منیش کەمێکی بدەم، هەروەك یارمەتییەك؟

"نە گیانەکەم، تۆ ئەوەندەت هەر دەویّ پێت بیّ."

غەموپەژارە و دڵتەنگیەکی بیّ وێنە گیانی دەگوشیم و هەمیشە ماویسم دەهاتە بەرچاو کە دەگەڵ ریزیۆیدا دەژوورێکی نمرە یەکی شەمەندەفەرێدا پێکەوە بەرەو جێیەکی نادیار دەڕۆن و منیش تاك و تەنیا لەوێستگەی راوەستاوم. لە راستیدا وەك ناچاری ئەوەی بووبم کە لە ئینگلتەرەی وەمێنم.

راستە کە من گفتم دابوو ئەو کارەی نەکەم بەڵام وەك بڵێی لەوە زیاتر چارەیەکی دی نەبوو.

خۆمن لە چارەم نەنووسرابوو شارەوشار بەدوای ریزیۆیدا بڕۆم و بێر وبەوێدا وێڵ و ئاوارە و وەیلان بم. بەو پێیە سێ ساڵی تەواو لە ماویس دووربم. ئەگەر لە ئینگلتەرەی بمێنمەوە و ئیشێ بکەم رەنگە بتوانم هەر نەبێ قازانجی ئەو پارەی جۆرجی بدەم کە بە قەردی لێ وەردەگرم، بەڵام خودایە! چۆن سێ ساڵان ماویسی بدەمە دەست پیاوێکی وك ریزیۆی تا کەس نەزانێ بۆ کوێی دەبا؟ چۆن دەتوانم دوای وی دەو بیابانە وشکارۆ و قاقڕەیدا بە تاك و تەنیا بژیم، ئازاری دابڕان و جودابیە بچێژم و هەموو رۆژێ لە ماڵەوە بۆ دایەرە و لە دایەرەشەوە بچمەوە ماڵێ و بە نامە زیاتر هیچ هەواڵێکی نەزانم؟ وای خودایە!

دیسانەوە لێرەدا کەوتمەوە دڵدانەوەی خۆم، و گوتم:

با جارێ ئەو پارەیەی پەیداکەم و ئەوی بنێرم، ئەودەمی وردە وردە کارەکانم رێك دەخەمەوە، بەڵکە رێیەکی بدۆزمەوە و هەر بە دوایەوە بم. من نابێ بهێڵم هەستەکانم بەسەرمدا زاڵ بن و هەر تەنیا ئارام و هێوری وخۆڕاگرتن و لە سەرەخۆییە بەسەر گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەکانمدا سەرخەن. بڕیارم دابوو کە دەوکارەیدا هەر دەبێ سەرکەوم. گومانیشم لەماویس نەبوو کە تاسەر دەگەڵ مندا چۆنە هەروا بە ئەمەکداری دەمێنێتەوە.

## ٢٦

پێتان وانەبێ کە بیر و باوەڕ و متمانەی من بەراستی و دروستی ماویسی لە خۆپەرستیەوە بوو، یا وابووبێ کە من پیاوێکی واسەرنج راکێش و دیارم هەرگیز لە بیر ناچمەوە، نا، نا، من هێندەش گێل و وێل نەبووم. بەڵام دەستی رۆژگار و رێکەوت، ئەشقێکی هێندە بە نرخی بە نەسیبی من کردبوو، پێموابوو کە راستی و



دروستی و دەست و دڵپاکی هەرهەمووی سروشتین و بە زگماك دەگەڵ ماویسیدا پێکەوە لە دایك بوون.

دوای نیوەڕۆی پێنج شەممە کەوتمە رێ. بەو نیازەی کە دوور لە توندو تیژی و هەڵەشەو پەلەپەل وزۆر بەسەنگینی و بە سیاسەتەوە حەوسەد تاهەزار و دووسەد لیرەیەکیان جا بە هەر شێوەیەك بووە لێ بستێنم و لێیان وەرگرم، ئەوەشی کەم بوو، جا هەرچەندێك بوو ئەوە لە بەشە بیمەکەی دیزە بە دەرخۆنە و پینە و پەڕۆی دەکەم. و دوای رۆیشتنێ ماویس و ریزیۆش لە لەندەن بمێنمەوە چاکە، تاکاتێك کە بە شێوەیەکی ئاقڵانە بتوانم بە خۆشەویستە ئازیزەکەی هیوای ژیانم بگەمەوە.باوەڕم بەوەی بوو کە خوداوەند لایەنی منەو دەوکارەیدا رابەریەم دەکا. کە لە شەمەندەفەرێ دابەزیم هەوا تاریك ببوو. جۆرج هاتبووە پێشوازییەم. کە دەستمان دە دەستی یەك نا وام هەست کرد کە برایەکەم یەکجار زۆر خۆشحاڵ و بەکەیفە. لە وێستگەی هاتینە دەرێ و سواری ئوتومبێلەکەی خۆی بووین. ئەو دەمی جۆرج پرسی:

"ژنەکەت چۆنە؟"

"باشە، سوپاس."

"ئەدی کچەکەت! ناوەکەیم بیر چۆتەوە."

"گریس، ئەویش خراپ نیە."

"چیت بۆ لەبەر چاوگرتووە بۆ دوارۆژێی؟"

"خوا دەزانێ."

"منداڵەکانی من هەر دووکیان هەر لێرە لەلای خۆم کار دەکەن."

"چاکترە، کۆمپانیای بیمە سوودێکی وای نیە."

گەیشتینە دەرکی ماڵێ جۆرج گوتی:

"تۆ بچۆرە ژوورێ، ژنەکەم فەرمووت لێدەکا، من دەبێ ئوتومتێلەکە بەرمە گەراجی. بەلای تۆوە چ ئوتومبێلێکە؟"

"زۆر شیك و جوانە، تۆش چاك داژۆی."

بەو قسانە، سیاسەتی خۆم چاپلوسانە دەستپێکرد. جۆرج زۆری پێخۆش بوو و منی بردەوە ژووری ئەو ماڵەی کە سەردەمی لاوەتیە خۆمم تێدا بەسەر بردبوو.

گۆڕانێکی زۆرم لە کەل وپەل و شتومەکی ناو ماڵێدا دیت. و واشم هاتە بەرچاوی کە جۆرج ژنێکی رێك و پێك و بە سەلیقە و مجێزداری هەیە. مۆبیلە هەمووی دارگوێز، قالی و رایەخی بە نەخش و نیگار. گوڵدانی پڕلە گوڵ، هەمووی هەر سەرنجڕاکێش و زیندوو بوون، رووناکی و گەرموگوڕی و چالاکیە مالێ جێیەکی تایبەتیان دەگیانمدا گرت و کارێکی زۆریان تێکردم.

کڵاو و پاڵتۆ و دەستکێشەکەمم دە دالانەکێدا بە جێ هێشتن. بە برایەکەمم کە تازە گەیبۆوە لام، گوت:

"هێندەتان گۆڕانکاری دێرەدا کردووە کە ناناسرێتەوە. زۆر بە سەلیقەوە رازاوەتەوە."

دووبارە دیتم برایەکەم لەو زمان چەوریەی خۆش دێت. جۆرج گوتی:

"جێنی لە مۆبلەکردنێ نێو ماڵێ زۆر بە سەلیقەیە. مارگری کچیشم چۆتەوە سەر داکی، ئەوە هەر بە نیازم لقێکی بۆ دیکۆرسازیە بکەمەوە و مارگری لەسەر دانێم. کچێکی زۆر ئاقڵە."

گوتم:

"لە ئاقڵیەی بە تۆ دەچێ."

"زۆرکەس وا دەڵێن."

"زۆر چاکە، ئەدی مارك چۆنە؟"

"زۆر باشە. دیارە دە ئالۆ وێر و سەوداییاندا زۆر چالاك نیە، ئەویش خانووێکی تازەی لەسەر شەقامی سەرەوە کڕیوە."

"لەو جێیەی قەرەج چادری لێ هەڵدەدەن؟"

"بەلێ لەوێ، تازەترین گەڕەکی شیك و جوانی ئێمەیە، هەرجێیەکی سەیرکەی تەلار و باڵەخانەیە. مارك باغێکی دروستکردووە و هەموو دەمێ ئەوە بە گوڵی سوور



و بە بەخێوکردنێ مێشەنگوینیەوە سەرقاڵ و خەریکە، کوڕەکەی موغازەکان بەڕێوە دەبات. ئالۆ وێرمان ئێستا چوار بەرابەری جارانە."

"لە راستیدا ئەوە هەمووی لە دەست و قام و چالاکیە تۆوەیە."

"کەمو زۆر، مارك تا پاریش چاکی کار دەکرد. بەڵام پار ریخۆڵە کوێرەی گرت و هێشتا هەر نەهاتۆتەوە سەرخۆ. هێندێك هەروان."

"بەڵام لە ڕاستیدا پیاوی ئیش و کار هەر تۆی."

"ئیدی هەروایە هەر دەبێ یەکێك بارەکەی هەڵگرێ و بەکۆڵێی دادا. وەرە بابچینەلای جێنی."

لە پلیکانان وەسەر کەوتین و چووینە ژووری نانخواردنێ. شێوازی نوێ دە هەموو شتێکیدا بوو. جێنی کە ژنێکی بالابەرزە و خۆش روو و خەپە بوو هاتە پێشێ و بەخێر هاتنی کردم.

شام هەڵگیرابۆوە. هەموو هەوڕ و رەنگەکان سەرنجڕاکێش وبەنرخ بوون. و دەودەمیدا دەرگا کرایەوە و کچێکی جوان بوو، قیژاندی:

"وای مامە رۆجەر گیان! بەخێر بێی. ئەوجا بەگەرمی تەوقەی دەگەڵدا کردم.

من لە پڕ بە هەستێکی هەڵچووەوە زانیم کە من هەرگیز ئەوانم نەدیوە، هەر نەدیوە و هەرگیز لە بیری جۆرجیشدا نەبووم." چاك بوو کە ئەو پەیوەندییەی خۆم دەگەڵدا پاراستبوون، هەرچەندە لەبەر قەرد کردنی هەندێك پارەش بوو ئەوانم وەبیر هاتبۆوە، بەڵام هەرچاك بوو. خۆ ئەگەر ئەو پارەیە نەبایە، هەر نەمدەزانی براشم هەیە. بەڵام من ئەو بیر و بۆچوونانەمم ئاشکرا نەکردن و نەمهێشت پێمەوە دیار بێت و رۆڵی مامێکی ونبووم" وازی کرد و گێڕا.

جۆرج بە هەوایەکەوە سەیری ژن و منداڵەکانی دەکرد، و من ئەوم وەك پیاوێکی کارامە و گوستاخ دە ژن و مێردایەتی و کاروبار و سەوداو مامەڵەدا دەدیت، هەمیشە سەرکەوتوو.

ئەوەی لە بارەی مارکیشمەوە بیست وام قولاّغ کرد کە ئەویش کامەران و بەختەوەر و ئاسوودەیە. چ دەگەڵ خاو وخێزانیدا وەك باوکێك، چ لە نێو گولّە سوور و خەڵێفە مێشەکاندا، زۆر بە خۆشیەوە ڕۆژەکانی بەسەردەبردن.

کاتێ خۆمم دێنایە بەرابەر برایەکەم و خۆم دەگەڵە ویدا رادەگرت. دەمزانی کە من ژیانێکی چەندە شلۆق و بێ پایەم هەیە، تەنانەت پەیوەندییە ئاشقانەکەی دەگەڵ ماویسیشم هەر بێ پایەومایە دەهاتە بەرچاو.

شاممان بە خۆشیەوە خوارد. گوتمان، پێکەنین و دیارە زۆربەی قسەکان دەربارەی رابوردو بوون. جۆرج باسی چالاکییەکانی کاری بازرگانی و موغازەکانی زیاتر دەکرد و دەیگوت لەو کاتەوەی کە کۆمپانیای دالتۆن و کوڕەکان بوو بە برایانی دالتۆن گۆڕانی بەسەر داهات و تای تەرازووی سەوداو مامەڵەکان زۆر سەرکەوت. ئەوەندەشی لێ زیاد کرد:

"کاتێ کە بەرپرسییەتی بە ملی مارك و مندا هات، هاتین دانیشتین. سەرەتا نەخشەیەکمان دانا و شان و بەشانی یەکتری، بەکەم و زۆری، و بەرز و نەویەکانەوە دەستماندایە، و لە هەر شوێنێکەوە گونجابایە و بکرابا بارودۆخەکەمان دەگۆڕی و وەزعەکەمان فراوان و بەرین و هەراوتر دەکرد و بەرەو چاکترمان دەبرد و لق و پۆپی زیاترمان لێدەکردەوە.هەروا بەو زووانە مارگریش پێشانگایەك لە یەکێ لە بەشەکاندا دەکاتەوە.

"بەراستی سەرکەوتنێکی چاکتان وەدەست هێناوە و ئەگەر هەروا بڕوا زۆر نابا کە تەواوی موغازەکانی ئەو بەشەی شەقامەکە هەمووی دەکڕن و دەبێتە ئی ئێوە. ئەدی هێلین بەتەمایە چ بکا؟"

"پێم وایە هێلین هەوای لاوێکی لە کەللەی داوە، خراپیش نیە، بەلاّم پەلەشمان نیە، بزانین چۆن دەبێ."

لێرەدا جێنی دەربارەی ئەیوا و گریسی پرسی و منیش ئەوەی ویستی ئاگادارم کرد. بەلاّم حەزم دەکرد جێنی و کچەکان بڕۆن و من و جۆرج پێکەوە جێ بێڵن. تا ئەوەی جێنی هەستا و گوتی:



"جۆرج، رۆجەر کاری پێتە، واباشە تەنیا بن." جۆرج گوتی:

"بابچینە نووسینگەکەی من." و بردمیە ژوورێکی بچکۆلانە کە پڕی بوو لە قەفەزەی دەفتەر و سەنەدو شتی وا. مێزێك و چەند کورسییەکی چەرمینیشی لە لایەکی دیکەوە دانابوون.

"خراپ نیە من کاروباری نووسینگە و حیسابداریە هەر بۆ خۆم ئەنجام دەدەم. ئەڵبەتە نووسینگەیەکی گەورەتریشمان دە نێو موغازەکاندا هەیە بەلاّم من جێیەکی تەنیا و چۆڵم پێویست بوو هەر کاتێ کە ویستم لێی دانیشم، یا یەکێکی تێدا ببینم." لێرە دا دۆلاّبچەیەکی بچکۆلانەی کردەوە و قوتووە جگەرەیەکی چاك و شووشە وێسکیەکی بە دوو پەرداغانەوە لێ دەرێناو لەسەر مێزەکەی دانان و گوتی:

"تۆ دەتهەویست بۆکارێکی پێویست من ببینی، ئێستا هەر چیەکت دەوێ بلێ. زمانم بەسترابوو و نەمدەزانی چۆنا و چۆن دەست پێ بکەم. بەدەم ڕێوە ئەوەی دەمهەویست بە برایەکەمی بلێم هەموویم دەمێشکی خۆمدا ئامادە کردبوو و ئێستاش کە ئاوای بەقەڵەوی و تەنگە ستووری و ژیانێکی ئاسودە و گومانەوی دەسەودا و مامەلاّندا دەبینم نەمدەزانی چ بڵێم.

بەلاّم ناچار تینم دایە خۆم و ئازایانە گوتم:

" راستیەکەی ئەوەیە من هاتووم هێندێکم پارە بە قەرد بدەیەی."

"ئاوا، چەند؟"

"هەزار لیرە."

"چۆناو وچۆن؟"

"چـــــــۆناو هــــــــیچ، دەنــــــــا بــــــــۆ دەهاتمــــــــە لای تــــــــۆ."

برایەکەم هیچی نەگوت و من درێژەم دایە:

"هەروەك دەزانی من لە کارمەندێکی سادە بەولاوە هیچی ترنیم و هیچ دەرامەتێکی دیکەشم نیە."

"ئەدی پاشەکەوت؟"

"هەر هیچ."

" چۆن؟"

"ئەیوا تادوایین فلسی مووچەکەم خەرج دەکا."

"من بیستوومە کە ئەو خۆی پارەی هەیە."

"بەڵێ، هەیەتی، بەڵام بە من چی، خۆ من سوودی لێ نابینم."

"ئاخر تۆ لەو هەموو ماوەیەدا دەبوو شتێکت هەر هەبایە."

"بەهیچ جۆرێکیم بۆ نەدەکرا."

"کاتێ باوکمان مرد تۆ هێندێك پارەی کاشت بەمیرات برد."

"بۆ دەست پێداهێنانی ماڵێمان خەرج کرد."

"بۆماڵەکە هەرئی تۆیە؟"

"نەء."

"هیچی؟"

"هەرتەنیا مۆبێل و شتۆمەکەکانی نەبێ. ناشمەوێ دەستیان لێدەم."

"ئایا ژنەکەت دەزانێ کە تۆ ئەو پارەیەی قەرد دەکەی؟"

"بە  هیچ جۆرێ."

"بۆ قومارێتە..؟"

"نەء."

"بۆ ژنێتە..؟"

وەڵامیم نەدایەوە و ئەو وەك باوکێکی کە کوڕەکەی بدوێنێ و قسانی لێ دەردا ئاوای روانیمێ و گوتی:

"هەزار لیرە. هەزار لیرە و تۆ فلسێکشت دەجێدا نییە و ئەو پارەشت بۆ مەبەستێکی نادیاری ئەوتۆیە کە تەنانەت غیرەتی گوتنێشیت نییە و داواشی لێ لە من دەکەیت. ساڵانێکیشە من تۆم نەدیوە و ئاگایەکم لێت نییە. نازانم چۆن چاوەڕێی ئەوەی کە من ئەو پارەیەت بدەمێ. من هیچ شتێك لە بارەی تۆوە نازانم."



"تۆ پێت خۆشە لە بارەی منەوە چ بزانی؟"

"دەربارەی ژیانی تۆ و ئەو ژنە کێیە و تۆ ئەو پارەیەت بۆچییە؟"

"ئەو ژنە یەکێك بوو لە مشتەریانی کۆمپانیای بیمە. یانی مێردەکەی بیمە بوو و ئێستا مردووە. ئەو ژنە گوزەرانی زۆر تێکچووە، و چونکە دەنگێکی یەکجار زۆر خۆشیشی هەیە، وام لێکردووە کە بچێتە لای ریزیۆ کە ئەڵبەتە ناویت بیستووە تا مەشق و راهێنانی دەنگ فێر ببێ. ریزیۆش گوێی لە دەنگ و ئاوازەکەی بووە و ئێستا زۆری پێوە ئۆگرە، لە هەموو کەسێکیش سێ هەزارلیرە وەردەگرێ وئێستا تەنیا ئەوی بەهەزار لیرە وەرگرتووە فێری کا."

ماوەیەك بێدەنگ بووم و پیرۆزباییشم لە خۆم دەکرد کە توانیم ئەوەی بەملم داهاتووە و تەواوی مەسەلەکانیش هەموو هەر بڵێم.

جۆرج گوتی:

"باشە کێ ئەو پارەیە دەداتەوە؟"

"خۆی."

"کەی؟"

کەمەشقەکەی تەواو بوو و کەوتە سەرکار."

"کەی، چ وەختێ؟"

"دوای چوار ساڵ."

"ئەدی قازانجەکەی؟"

"پێنج لە سەدی قازانجەکە، من خۆم دەیدەم."

"ئەو دەیداتەوە تۆ؟"

"بێگومان."

"سەنەدەکان چۆن دەنووسێ، ئایا ئەو ئیمزایان دەکا؟"

" ئەوانەی هیچ ناوێن."

"تاقیکردنەوەکان وایان دەرخستووە کە ئەم جۆرە کەسانە هێندە بەلایەنی پـارەوە پابەند نین و گوێ نادەنێ."

"ئەو ژنێکی زۆر رووسوورە."

"دەتوانی چ کەفالەتێکم بدەیەی؟"

"من هیچم نیە و تەنیا دەتوانم گفت و بەڵێن بدەم کە تـەواوی ئـەو پارەیـە دوای چوارساڵەکە هەمووی بێنینەوە و قازانجەکەشی تا ئەو کاتەی پێویستە بیدەم."

ماوەیەك قونچکە جگەرەکەی جوی و گوتی:

"ئەوەی گوترا هەموویم بیست و ئەو قسانەش هیچ نرخێکیان نیە بەلای منەوە.

تۆ پێشنیار دەکەی کـە بـەبێ جـێ و بـێ کـەفیل مـن هـەزار لـیرە بدەمـە ژنـە ئارتێستێك کە نایناسم، هەر تەنیا لەبەرەوەی کە تۆ دەڵێی ئەو پارەیەت دەداتەوە.

هەرگیز ئەوە نابێ کەسێکی ئاقڵ کە سەری لەســەودایان دەردەچـێت بێـت کـاری وابکـا، خـۆ ئەگـەر وا بایـە و ئەوکارانـەم کردبایـە ئـەوە کۆمپانیـای والتـۆن هـەر ناویشی نەدەبوو.

ئەگەرچی مارك هێندێك دەوکارانەدا شلە بەڵام من هەرگیز پارێز نـادەم و ئەگـەر تۆ بتوانی هەموو مەرجەکان قبوڵ کەی ئەوە زۆر باشە و من ئەو پارەیەت بۆ ئامـادە دەکەم، بەڵام هەر بەوقسانە، هەرگیز."

"ئەگەر تۆ ئاوای بـیر لێدەکەیـەوە ئـەوە بەداخـەوە." ئـەو هـیچ گـوێی نەدایـە قسەکانی من و گوتی:

"''تۆ لەبەر چی ئەو هەموو رەنجەی پێوە دەکێشی باشە بۆ خۆی کەسی نیە؟"

"نەء، هیچ کەسێك."

"هیچ کەس؟"

"مێردەکەی مردووە و دایـك و باوکیـشی لـە شـەڕێدا لـە دەسـت داون، ئـەوەی هەشیبووە دەشەڕێیدا لێ لەناوچووە، و ئێستا ژنێکی ئاوارەیە."

"ئێستا چۆن دەژی؟"



"بە دروومان و کاری دەستی."

" کارەکانی باشن."

"لە کارە ناسکە فڕەنساوییانە؟"

"بەڵێ"

"ئێمە ماوەیەکە یەکێکمان دەوێ کە دروومان و کاری دەستی ناسك بزانێت. مـن پێشبینی دەکەم کە ئـەو پۆسـتەی بدەینـە ئـەو ژنـەی تـا لـە موغازەکـەی ئێمـەدا ئیش بکات."

## ۲۷

من ناتوانم ئەوەتان بۆ باس بکەم ئەو پێشنیارە چۆنی شێت و هار و تووڕە کـردم. هەستم دەکرد کە تەواوی ئارام و لەسەرخۆیی و هێوریەکی هەمە ئەوا دلۆپ دلۆپ لە پەنجەکانمەوە دەتکێنەوە. سەرتاپام دەلەرزی هاوارم کرد:

"ئەو پێشنیارانە شێتین. ئەو هەرگیز ئەم جۆرە کارانە بە هیچ دانانێ."

"دیارە لە بەروەی کارێکی چاکە. ئەوە هەر بۆ خۆی دیارە."

"چ شتێك هەر بۆ خۆی دیارە؟"

"کە ئەو ژنە لە چ پارچە قوماشێکە."

"مەبەستت چیە؟"

"بۆ خۆت باشتر دەزانی. تۆ خـۆت دەڵێـی، ئـەو گـوێ ناداتـە ئـەو کـارەی مـن پێشنیاری دەکەم و هەر ئاوڕیشی لێ ناداتەوە، ئەو دەیهـەوێ بـە هـەر جۆرێـك بـووە هەزار لیرە لە تۆ بەرداتەوە و دەگەڵ گۆرانیبێژێکی کە سەرسامی دەنگەکەیەتی لێـدا و بڕوا، من نازانم لە  ئاوەز و دەنگەکەی بەولاوە دڵی بە چیتریدا چووە؟ ئای! من بـەو شتانە هەڵناخەڵەتێم و ئەو جۆرە ژنانە چاك دەناسم."

" ئەوە لەوانە نییە کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە. من بە ویژدانەوە دەڵێم کە ئەو بـە دڵ و بە گیانەوە نەجیب و پاك و بێگەردە."

" باشه ئەوە چ پەیوەندییەکی بە تۆوەیە ئاوای دەست بۆ لەملی دەدەی و بە ویژدانتی سوێند بۆ دەخۆی. ئایا ئەیوا بەو شتەی دەزانیێ؟"

" شتی وەکو چی؟"

"دەربارەی تۆ و ئەو ژنە دەتوانم سوێندیێ بخۆم کە ئاگای لە مەحموودی بیێ زەواد نیە."

من وەڵامی ئەم رستەیەم نەدایەوە.

"دیارە ئەو ئاگادار نیە کە چۆن وا لە ناکاو جۆرجی برات وەبیر هاتۆتەوە و ئاوا بە پەلە کەوتوویتەتە سەر و سۆراغ و سەردانی، برایەك کە تا ئێستا بە لای تۆوە هەر نەبووە."

"من لەم لایەنەیانەوە تا بلێی بە داخەوەم و نیگەران و دلگیرم."

"سەیرکە رۆجەر ئەو ژنە چ پەیوەندییەکی بە تۆوەیە؟"

" هیچ!"

دیار بوو درۆیەکی گەورەبوو و جۆرجیش چاکی دەزانی کە درۆیە. من نەوێرام سەیری چاوی برایەکەم کەم چونکە ئەو دەیزانی راستیەکانیان تێدا بخوێنێتەوە.

دوای چەند دەقیقەیەك بێدەنگی بە وشەی توندو بەندو هەڵبژاردەوە ئاوای دەست پێکرد:

"رۆجەر، من پێم خۆشە تۆ ئەم باسە بەتەواوی لە بیر خۆت بەیتەوە. منیش بەڵێنی ئەوەت دەدەمیێ هیچ شتێك بە ئەیوا نەڵێم و باسی نەکەمەوە، هەرچی بیێ تۆ برای منی و من لە تۆ گەورەترم و چاکە وخراپەی دنیایە لە تۆ چاکتر دەزانم. لەمنی ببیە ئەو رێیەی کە تۆ گرتووتە بە کەڵکت نایە و تازووە و پێش ئەوەی کووکەیەك بقەومیێ واز لەو ژنە بێنە.

منێك ئەگەر زانیم کووکەیەك هەڵستاوە یەك لە بارە خۆم کۆمەك و پشتیوانیە ناکەم و لیێ دێمە دەریێ. دوایەش خۆ دەبیێ بیرێك لە ئابڕووی کچەکانم بکەمەوە



"تۆ پارەکەم بە قەرد بدەیە، جۆرج، من بەڵێنیت دەدەمیێ چۆنت پێخۆشە ئاوای لیێ دوور دەکەومەوە. ئەو دەگەڵ ریزیۆی دەڕوا. تۆ ئێستا دەست رۆیشتووترین کەسانێکی ئەم ناوەی و من دەزانم کە تۆ دەتوانی ئەوپارەیەم بدەیەی، تکات لێدەکەم."

" هەرگیز تەنانەت فلسێکیش، دەڵێی من کاروبارەکانم چاکن، ئەوە راستە، بەڵام ئەگەر بیێ و ئەوسات و سەودایانە بکەم یا بمکردبایە، ئێستا لە کویێ دەبووم، جوانترین کچ دەموغازەکانی مەدا ئیش دەکەن، و کەچی من هەرگیز سەیرێکیشیان ناکەم، بەڵام تۆ لەبەر خاتری تاکە ژنێك بە بیێ ئەوەی تاکە فلسێك شك بەری هاتووی داوای هەزار لیرە لەمن دەکەی. پێتوایە من گێلم؟" من لە جێی خۆم هەستام و گوتم:

"بە چی دەچیێ؟ تۆ بوونەوەرێکی چاوچنۆك و خۆپەرستی، هەمیشە و بەمنداڵیش هەر وا بووی."

"بەسیەتی، بەسیەتی." ئەوجا لە جێی خۆیەوە هەستا، و بەو روخسارەی کە شادی و خۆشی و گەشیەکەی پێشدانی پێوە نەمابوو گوتی:

"بیرت نەچیێ کە هیچ شتێك دەربارەی ئەم مقۆ مقۆیە لای جێنی نەڵێی. هەروەها شێوازی دانیشتن و هەڵس وکەوتیشت لە بیر نەچێتەوە، ئێرەماڵی منە و تۆ میوانی. ئەوانەی گوتیشمن لە بیریان نەکەی دەنا..."

"دەنا دەنا دوو وشان بۆ ژنەکەت دەنووسم."

## ٢٨

جۆرج لەو کەسانە بوو کە هەڕەشەکانی خۆی زوو دێنانە دی و دەکاری دەخستن ومنیش هەر حەزم نەدەکرد ئەوباسە بە هیچ شێوەیەك بە ئەیوا بگاتەوە و بیبیسیێ. پێکەوە هاتینەوە هۆڵەکە. من دەبوو زەردەخەنەیەکم بە لێوانەوە بیێ و واخۆم نیشاندەم کە زۆریش خۆشحاڵم! جێنی پرسی:

"قسەکان تەواو بوون؟ هێوادارم سەرکەوتووانە بووبن.. سەرکەوتوو بوون؟"

"زۆر، زۆر."

"ئای کە شادم. رۆجەر وەرە لای منەوە دانیشە."

من لە حەژمەتی ئەو هەموو سووکایەتییە کە پێم کرابوو لە رقان دەلەرزیم. دەگەڵ ئەوەشدا کە جۆرج رۆڵی خانە خوێیەکی باشی تەواو عەیاری دەگێڕا، و ئەوەشی دەهەڵس و کەوتاندا دیار نەبوو کە لە نێوانماندا روویدابوو و بەسەرماندا تێپەڕیبوو، و ئەوپەڕی دەست و دڵ والآیی( دەست و دڵ والا!) لە بەرامبەر مندا دەردەخست بە جگەرەو خواردنەوە و فەرمووی گەرموگوڕییەوە. بەڵام من چاوی دیتنێیم نەبوو. بەڵام ئەو بۆ ئەوەی ژنی جوان و دڵکەش و کیژەکانی خۆی بە من پێشان بدا و سەرکەوتن و پیرۆزی و کامەرانی خۆی بە رووی مندا بدا تا بڵێی خۆی هەڵدەخڕاند و خۆی لەسەر بادەدام.

سەعات دە و نیو جێنی و کچەکان هەستان. منیش ماندووەتیم کردە بیانوو و چوومە ئەو ژووری نووستنەی بۆیان تەرخان کردبووم. چاوم نەچووە خەو. خەون وئارەزوو و حەز و نەخشە و پلانەکانی کە دەگەڵ ماویسیم کێشابوون و تکا و پاڕانەوەکانی کە لە جۆرجم کردبوون و دەستخەڕۆیان بووم هەموویانم تێکڕا یەك بەدوای یەکدا بە بەرچاویدا رادەبردن.

سەی بەیانییەکەی دی یەك شەممە بوو. لە سەر قاوەڵتی جێنی گوتی:

"رۆجەر دەگەڵمان دێیە کەنیسەی؟"

و دە بارێکیدا کە سەری بەلایەکی شانیدا خوار کردبۆوە چاوەڕوانی وەڵام بوو.

جۆرج وەڵامی دایەوە:

" دیارە دێت" ئەوجا رووی دەمن کرد وگوتی:

"ئێمە هەرگیز چوونە کەنیسەمان وازلێ ناهێنین." لەوەڵامیدا گوتم:" من حەزدەکەم سەرێك لە مارك دەم و سەردانێکی بکەم."

جۆرج دەستبەجێ وریا بۆوە و گوتی:



"عەسرێ وردە وردە هەروا بە پێیان شۆڕدبینەوە و دەچینە لای. مارگریش دەگەڵە خۆماندا دەبەین.

جۆرج نەیدەویست من مارك ببینم، بۆیە سەر لە نوێ گوتی:

"مارك هەروا راهاتووە دوای نیوەڕۆیان وەنەوزێکی بدا و سەرخەوێکی بشکێنێ و ئێمەش کاتێك دەجوولێین کە دەوروبەری سەعات سێ و نیو بگەینە ئەوێ و سەر و چایەکی دەگەڵ ئەمیلی و مارکدا بخۆینەوە وبۆ سەعات پێنج بێینەوە. شەمەندەفەر، سەعات چەند دەڕوا؟"

"سەعات هەشت و نیو."

"کەواتە کاتمان هەیە."

هەموومان چووینە کەنیسەی و هەر کە پێم دەناو کەنیسەی نا، سەردەمی منداڵیەم، کاتێ کە لە دەستەی کۆرسی کەنیسەیدا ئاوازم دەگوتن وەبیر هاتەوە و واچوومەوە ناو ئەو دنیای بیرەوەرییانەوە کە هەرچی رەنج و ناخۆشی و نارەحەتیەك بوون، هەموویم لە بیر چۆوە. دوای ماوەیەك کە چاوم گێڕا دیتم مارکیش لە کەنیسەیە. بە بێ ئەوەی بچووکترین و کەمترین ئاسەوارێکی خزمایەتی و ناسیاوەتیەی بە روویەوە دیار بێ سەیرێکی کردمێ. نیشانەی پیریەتییەی پێوە دیار بوو. لە پەنجاو دوو ساڵیە گەورەتر دیار بوو. ئەمیلی ژنی ولاوێکی بالآبەرزە کە کوڕەکەی وی و برازایەکەی من بوو، لە هەردوولایەوە دانیشتبوون.

چەند گێل بووم! بۆ هەر لە هەوەڵێوە نەچوومە لای مارك؟ مارك زۆر لە جۆرج جیاوازتر بوو. دڵنیام دەستبەجێ پارەکەی دەدامێ. باشە بۆ لە سەرەتاوە نامەم بۆ جۆرج نووسی؟

پێموابێ هەر لەبەروەی کە تەنیا ناونیشانی جۆرجم دەزانی.

ئەگەر من پەیوەندیم دەگەڵدا نەبڕیبانایە و گۆڕانی ناونیشانەکەی مارکم زانیبایە ئێستا ئەو هاتنەی من ئاوا بێ ئەنجام نەدەبوو.

من نازانم بۆ لە پەیدا کردنێ پارەکەی نائومێد نەدەبووم. ددانی پێدا دەنێم کە خراپ تێکەوتبووم و دەشمزانی کە دەبێ تا یەك هەفتەی دیکە ئەو پارەی ئامادە کەم

یا واز لە هەرچی حەزو ئارەووەکانمە بێنم. ئەگەر هەر دەبوو ماویس مەشقی دەنگەکەی بکا، دەبایە هەر لە ئێستاوە بایە. ئێستاش تەمەنی هەڵکشابوو، و ئەوە هەر تەنیا ریزیۆ بوو کە دەیتوانی بیگەیەنێتە ترۆپکی سەرکەوتن.

ئەم هەفتە نا، هەفتەیەکی دیکە و من لێرە بەهەوای نەفس کاتم بە فیڕۆ دەدا. دەگەڵ ئەمانەشدا نازانم بۆ بێ هیوا نەبووم، وەك ئەوەی لەودیوی ویژدانمەوە هەستم بە شتێك کردبێ. وەك بڵێی دڵنیابم کە ئەو پارەی پەیدا هەر دەکەم. وەك ئەوەی چارەنووس وای گەرەك بێ ئەو پارەیەم هەر بێتە دەستی. هیچ هێزێکیش نەتوانێ پێشی پێ بگرێ. دەو کاتەیدا کە کەشیش ئامۆژگاری دادەدان، من بیرم بۆلای ماویس چووەوە، و ئەوم هێنایەوە بەرچاوی خۆم کە ئەوەتا لەو کەنیسە پەرپووتەیدا لەسەر ئەژنۆیان دەدنیای گیانیدا نقووم بووە. و ئەو هێزە لە رادەبەدەرەی کە هەستیشم پێدەکرد ئەوە گیانی من لەگوناهان پاك دەکاتەوە وهەردەو دەموسات و دەقیقانەدا لەبەر چاوم بەرجەستە بوو.

جۆرج خۆی بە پیاوێکی دیندار دەزانی، و بەڕاستیش ئەگەر مەبەستی دینداری و ئایینزاش هەر سروود گوتنی ئایینزایانەی نێو کەنیسەی بێ بە دەنگ و سەدایەکی بڵند، یا وەنەوزدان و خەوەکوتکەی دەم نزا و پاڕانەوان بێ ئەوە بە نیسبەت جۆرجیەوە دەقاودەقە و شتێکی راستە، ئەو هەر دەوان کات و وەختانەدا بە هەموو هێزی خۆیەوە دەیقوولاند و ئەو جا سینیی سەدەقە کۆکردنەوێی تاو دەدایە و دەیگێڕا(ئەوە جگە لەوەی کە پێموابێ بۆخۆی تەنانەت فلسێکیشی نەدەخستە ناو سینییەکەوە) بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا زۆر بە هەڵپە و تاسەوە دەحەفتەیدا شەش رۆژان و بەگوێرەی پێویستیش یەك شەممانیش ئەوە هەر خەریکی پارە خڕکردنەوێ بوو. هەموو خولیایەکی جۆرج تەنیا هەرئەوەندە بوو کە لە ریاڵێکی پێنج لە سەدی ئەو ریاڵەی دەستکەوێ. ماویسی شیرین، ئەو گوڵە سپییەی من، یەك ملیۆن بەولاوەتری هەموو شتەکانی دێنا و ئەوەش هەر لەبەرخاتری وی بوو کە من ئەو پارەیەم دەویست و بە دوایدا وێڵ بووم نەك لەبەر خاتری خۆم. و رەنگە نەشمتوانیبایە هەر دەست بۆ



فلسێکیشی ببەم. تەنانەت لەوانەشە من ماویس هەر نەشبینمەوە. ئەوانە لەوەی نەدەگەیشتن و ئەوەیان نەدەزانی بزانن داخوا جوانییەکەی چ جوانییەکە، یا ئەوەی بزانن کە من دەمهەویست چ گەنجینەیەکی بەنرخ پێشکەشی هەموو دنیایە کەم.

کەنزاوپاڕانەوەی کەنیسەی تەواو بوو لە دەرەوە تووشی مارك بووین، ئەو و ئەمیلی تەوقەیان دەگەڵ کردم و ئەو بەخۆشیەکی تەواوەوە گوتی:

"یەکجار زۆر بەدیدەنت خۆشحاڵم، کوڕەکە، ئەوە چۆنە وابەرەو ئەم ناوەوە هاتووی؟"

جۆرج بەرلەوەی دەرفەتی من بدا گوتی:

"دەیهەویست دەربارەی باسێکی پرسێم پێبکات."

"ئێ! باسێکی گرینگە؟"

من گوتم:

"زۆریش نا."

"ئایا جۆرج رێنمایی کردی؟"

"نەء. جۆرج، هێندە دەولاپەڕانەوەی روانیوە کە هێزی رانمایی و دەستنیشانکردنێ شتانی نەماوە. تۆ هێندە نەگۆڕاوی. بەڵام گەدوگیپاڵی جۆرجی هێندە زل بووە کە زۆر بە گران ناسیمەوە."

"واباشترە لە گەدو گیپاڵی من گەڕێی."

"ببوورە، پێدەچێ نوختەیەکی هەستیاربێ."

دێرەدا مارك دەستی دەدەستی نام و گوتی:

"تۆ دەبێ دەگەڵە مندا بێیەوە و تەماشایەکی مێش هەنگوین و گوڵە سوورەکانم کەی."

"مانگی مارت و گوڵی سوور و مێش هەنگوینە؟!"

"من گوڵخانەیەکی بچکۆلانەم هەیە، هێندەم گوڵەسوورە خۆشدەوێ، حەزدەکەم بە درێژایی ساڵێ گوڵە سوورەم لێ نەبڕێ. یەك خەڵێفەمێشی شووشەشم هەیە کە هەموو مێشەکانی تێڕا دیارن."

"زۆرم حەزلێیە هەموان ببینم. من نزیکەی پێنج مەترم زەوی هەیە کە شەش بنکە گوڵی سوورم تێدا رواندووە، و ئەوانە ماندووەتیم دەحەسێننەوە، دەنا خۆ ناچمە چ جێیان و کاتی ئیشی دیکەم نیە."

جۆرج لە بنەوەڕا سەیرێکی کردم بەڵام من بە سەر خۆمم نەهێنا. ئەمیلی پرسی:

"کەنگێ سەرێکیش لەمە دەدەی؟"

مارك گوتی:

"هەر ئێستا وەرە بچین، جێنی رێ دەدا خۆ تۆ نیوەی کاتەکەت هەر لای وان بووی."

"جۆرج تا ئەوپەڕی میواندارییە، میوانداری کردووم و هیچی تێدا نەهێشتۆتەوە و ئەگەر جێنیش رێ بدا دەگەڵ تۆدا دێم، چونکە چەند قسێکم پێتن."

"ئەڵبەتە بۆخۆت گەورەی، ئیختیارت هەیە."

ئەو جا دەگەڵ مارك و ئەمیلی بەرەو ماڵێ وان کەوتینە رێ. مارك بە دەم رێوە بە خۆشحاڵییەوە بێ وچان هەر دەدوا و ئاگاداری زۆر شتانی دەکردمەوە و پێی دەگوتم کە ئەوە ماڵێ فلانیە و ئەوە ئی فلانە. یاکێ مردووە و کێ ژنی هێناوە، هەمووی دەگوتن. دێرەدا هاتمەوە سەرئەوەی کە کوڕەکەی مارکمان بۆ دەگەڵ نیە و هۆیەکەیم پرسی. مارك زۆر بە رەزامەندییەکی تەواوەوە گوتی:

"ئاخر ئەو بە دەستگیرانە و واش باوە کە ئەو دوای کەنیسە لە ماڵێ خەزووری نانی نیوەڕۆ دەخوات. رەنگە هەر ئەو هاوینەی شاییەکەی بکەین."

"ئەو زۆر بەسەردەمی منداڵییە تۆ دەچێ. تۆ لە هەموومان جوانتر و قەبەتر بووی."

مارك لەو بەخێرهینانە زۆر شاد بوو. دەو وەختەیدا گەیشتینەوە ماڵێ. ڤیەللایەکی تەواو بە کەرپووچی سوور وسپی. من هەر چیەکی لە دەرێ و ژوورێم دیت هەر ستایشم کردن ومارکیش لەو ستایش و پێداهەڵدانانەی من تا دەهات رەزامەندتر دیار بوو و بەردەوام دەگەڵ ئەمیلیدا سەرنجی خۆش وەختی وشادی و شەنگوڵیان دەگەڵ یەکتریدا پێك دەگۆڕینەوە لەسەر سفرەی نانی نیوەڕۆیە باسی جۆرجی هاتە نێو قسانەوە و لە قسەکانی مارکی وا تێگەیشتم کە جۆرج بێ تاقەتیە مارکی کردۆتە



بیانوو دەنا دەستی پێ لە کۆمپانیای کێشاوەتەوە و ناهێڵێ دەست بۆ هیچ کاروبار و بەرپرسیاریەتێکی پارە و مارە بەرێ.

لە شێوەی قسەکانی مارکیڕا دیار بوو کە ناڕازییە، من گوتم:

"جۆرج دەئیشێدا کەمێك دیکتاتۆرە."

"بەڵێ وایە. ئەو حەزی لێیە هەموو شتێك هەرقسەی وی بێ و هەمووشتێکی بە ئارەزووی خۆی هەڵسوڕێنێ. بەلای منەوە لق و پۆپی لەئەندازە بە دەر زیادی لە کۆمپانیاکە کردوونەوە. شار بەو بچووکیەیەوە بەرگەی ئەوجۆرە سات وسەودا و ئاڵو وێرە قورسانە ناگرێت."

نیوەڕۆژە بەکاوەخۆ خورا. مارك هێندە دەربارەی جۆرج و کۆمپانیاکە دوا کە دەترسام بەرلەوەی دەرفەتێك هەڵکەوێ جۆرج و مارگری وەژوورکەون. ئەوجاکە نان هەڵگیرا مارك رووی دە ژنەکەی کرد و گوتی:

"واباشترە تۆبچی و پشوویەك بدەی و من و رۆجەریش دەچینە سەیری سوورگوڵەکان و یەك دووقسانیش دەکەین."

کە گەیشتینە گوڵخانەکە بەمارکم گوت:

"سەیرکە برالە. من لە لەندەنەوە بۆکارێکی گرینگ هاتووم."

ئیدی راستەوڕاست بەکوڵك و پێستەوەم بابەتەکە باس کرد. ئیدی هیچی دی پێویست نەدەکرد بابەتەکەم دەنکە دەنکە و دڵۆپ دڵۆپ لێ بپرسنەوە و پێم بگێڕنەوە ولێم دەرێنن و هەرکە باسەکەشم تەواو کرد وەك کەسێکی وانەکەی خۆی بۆ مامۆستای بڵێتەوە مارك گوتی:

وەك دەردەکەوێ یەك لەمشتەرییەکانتان کە بێوەژنێکی جحێڵۆکەیە و لێی قەوماوە، بەڵام کە دەنگێکی یەکجار لە ئەندازە بەدەر خۆشیشی هەیە ئەگەر بتوانێ مەشقی دەنگ فێربێ، ئەوە ئیدی کاری تەواوە و ریزیۆش کە ئەوکارەی بە هەزارلیرە و ئەو هەموو داشکاندنەوەشی لێ قبوڵ کردووە و دەبێ یەك شەممەی داهاتووش وەڵامی

بدرێتەوە و تۆش خاوەنی فلسێك نی ببیە کەفیلی جگەلەو پێنج لەسەدەی قازانجەکەی کە دەیدەی کارێکی چاکە.. بەڵام هەزار لیرە پارەیەکی یەکجار زۆرە."

"راستە و هەر ئەوەشە کە من بە تەنیا هیچم پێناکرێ و هیچیشم لە دەست نایە. من وەك تۆ خاوەنی کۆمپانیایەکی بە جێ نیم. مـن بەردەسـتێکی سـادەو سـاکارم و مووچەیەکی کەمم هەیە. و دەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر سـاکارانە دەژیـن، بـەڵام چـونکە دوای شەڕێ هەموو شتێك هەرگرانە بە چ جێیان راناگا."

"راســـتە. ئـــەدی جـــۆرج دەربـــارەی ئـــەم مەســـەلەیە چـــی گـــوت؟"

"هیچ، ئەو وەکو تۆ راستی بین نیە، و هێزی بیرکردنەوە و مەودای خەیاڵی کورت بڕە. بۆ نموونە تۆ پێتوایە ئەو کەیفی بەو گوڵەسوورانەی تۆ بـێ؟ چـوونە لای وی ئەوپـەڕی گێلیەتی بوو. ئەو تەنیا یەك بازرگانی بازاڕیی تێنەگەیشتوویە و هیچی دی.

"وای مارك، نازانم چۆنت سوپاسکەم. ئەگەر مادام کوترلت دەدیت و گوێـت لـە دەنگوئاوازەکەی دەبوو ئەو دەمی دەتزانی کە چ کۆمەك و یارمەتییـەکی فیرۆبـوون و پێگەیشتنی ئەوت داوە و چ کارێکی شەرەفمەندانەت بە ئەنجام گەیاندووە."

"تۆ هەمیشە پەیوەندیت بە مۆسیقاوە هەر هەبووە و حـەزت پێکـردووە. ئێـستا دەی بابزانم دەبێ چبکەم. من بۆ بانك دەنووسم، تۆش دەبێ سـەنەدێکی بدەیـە مـن، هەزار لیرە پارەیەکی کەم نیە، من دەبێ بیرێکی لـە کوڕەکەشـم بکەمـەوە ولـە بـیرم نەچێ."

"هەر جۆرە سەنەدێك یا پسوولەیەکی بە هەرچەندێکی بڵێـی دەنووسـم، بەشـە بیمەکەی هەشمە ئەوەنـدە پارەیـەی بـەزیادەوە تێـدە بێـت. دەگـەڵ ئەوەشـدا هـەر سوپاست دەکەم."

"ئەو ژنە تەمەنی چەند ساڵە؟"

"بیست ساڵ."

"بەڵێ  داستانێکی غەماوییە. دایك و باوکی مردوون و هەرچـی هەشـیان بـووە هەمووی دەشەڕێدا لە دەست چووە و نەماوە."



بەڵێ، چیرۆکێکی کاریگەرە. دەبێ کەی بچیتەوە لەندەن؟"

"بەداخەوە هەر ئەمشەو، چونکە بەیانی دەبێ لە دایەرە بم."

"جارێکی دیـشمان سـەر لێـدەوە و چـەند رۆژێکـان وەمێنـە. ئـەوە بـۆ شـاییە کوڕەکەمان هیچ، هەر دەبێ بێیەوە."

"هەوڵ دەدەم."

"هەر ئەم بەیانیە بۆبانك دەنووسـم، چـونکە هەفتەیـەك زوو دەڕواو تێدەپـەڕێ و بەش ناکا و دەبێ پارەکەش ئامادە بێ."

"ئایا واچاتر نیە کە هەر بۆخۆم نامە بەرم و کاتەکەش بەفیڕۆ نەدەین!؟"

"بۆنا، لەوانەشە هەر یادداشتێکت بۆ بنووسم. جۆرجیش واخەریکـە دێـت. هـەر فێرە یەك شەممان سەرێك لێرە هەر دەدا."

"واباشترە باسەکە پێش هاتنی وی تەواوکەی و بیبڕێنیەوە."

مارك نامەکەی نووسی و دایە من و منیش زۆر بە وریاییـەوە دەگیرفـانێم نـا، و جۆرج هاتە ژوورێ. من نەمویـست شـوێنەوار و نیـشانەی سـەرکەوتنەکەم لـە رووی خۆمـدا بـشارمەوە. جـۆرجیش دەسـتبەجێ تێگەیـشت و دەیویـست وەك نـارنجۆکێ بتەقێتەوە کە من بەلایدا رەتبووم و لە سەر خۆ گوتم:

"جۆرج نەزاکەت و هەڵسوکەوتی دانیشتنێ... لەبیر نەکەی..."

"ئاخر ئەو پیرەمێردە گەلحۆیە..."

"وس! هەڵسوکەوتی دانیشتنێ..

من هەوڵێکی یەکجار زۆرم دا یەك چرکەش جۆرج و مارکی پێکەوە بە تەنیا جـێ نەهێڵم و تەنانەت مارگریشم هەر لای خۆمان هێشتەوە. چونکە دەمزانی کـە ئەگـەر جۆرج بیشیەوێ دەستێکی تێوەردا لای کچەکەیەوە هیچ شتێکی ناڵێ.

جۆرج و مارگریش چـایان خـواردەوە و ئـەمیلی بەروویـەکی خـۆش و گەشـەوە و بەگەرمی پێشوازی لە هەموان دەکرد.

دەوروبەری خۆراوایە هاتینەوە ماڵێ جۆرجی کە جانتایەکەی منیش هەر لەوێ بوو و هەر کە دەرفەتی بۆ هەڵکەوت جۆرج پرسی:

"چ سات و سەودایەکتان دەگەڵ مارکیدا کرد؟"

"لەوە گەڕێ، چکارت پێیەتی؟"

"لە مارك دەپرسم."

"بپرسە، ئەو بە تەواوی رازییە. منیش پێم ناخۆش نیە بۆ چوونی وی بزانی."

"ئەو لە پیرەمێردێکی گەلحۆ بەولاوە هیچیدیکە نیە. من هەقم بوو نەهێڵم دەست دەکاروباری کۆمپانیاکەو وەردا. دەگەڵ ئەوەشدا ناهێڵم لە خشتە ببرێ."

"واباشترە خۆت تێهەڵنەقورتێنی."

ئایا هەر بەڕاستی چەکێکی هەزار لیرەیی داویەی؟ ئەگەر ئەویش ئەو داستانەی هەموو وەك من دەیزانم بیزانیبایە هەرگیز نەدەهات ئەو گوژمە پارەیەت بداتێ. هێندەش نەزان نیە. هەزار لیرە. ئەوە چ ئەفسوونێکت لێکرد ئەوکارەی بکا."

"باشترە لە خۆی بپرسی."

من لە خۆشیە سەرکەوتنەکەم دەپێستی خۆمدا نەدەحەوامەوە. نانی ئێوارێ(شام) بە دەم قسە وباسی هەمە جۆرەوە خورا و داوام لە جێنی کرد دەگەڵ کچەکاندا سەرێکمان لێبدەن."

جێنی گوتی:

"زۆر حەز دەکەم، هەوڵ دەدەم." بەڵام جۆرج بە تەواوی رکەوە گوتی:

"جێنی و کچەکان لە لەندەن کاتی وەنەوزدانێیان نیە. ئیدی ئێمەش دەبێ کار بکەین تا پارووە نانێکی بخۆین."

"ئەوجا منی بە ئوتومبێل بردە ئێستگە و گوتی:

"لە هەوەڵێن دەرفەتێکیدا دەبێ بچم ومارکی ببینم."

و من گوتم:

"مارك دڵێکی پاکی هەیە."



"گێلە، بەڵام من هۆشی دێنمەوە بەرێ، و ئەگەر تۆزێك پەلە بکەم دەتوانێ حەواڵەکە راگرێ."

"هەرگیز کاری واناکا. مارك ئەمنی زۆر خۆشدەوێ."

لە دواییدا ویستم دڵی جۆرج راگرم و گوتم:

"تۆ لە بۆچوونەکانتدا دەربارەی من و ئەم مەسەلانە زۆر هەڵەی. باس باسی فێڵ و گزی و هەڵخەلەتاندن نیە و پێویستیش ناکا هێندە نارەحەت بی."

"چۆن نارەحەت نەبم؟ سەودای بە بێ کەفیل؟"

"من بەشە بیمەکەی خۆم دەدەمە مارك."

"بای هەزار لیرە دەبێ؟"

"لەوانەیە.."

جۆرج بە ناقایلیەوە سەرێکی بادا. دەو هەنگامەیدا شەمەندەفەر هاتە ناو ئێستگەوە و من ماڵئاواییم لە جۆرج کرد.

"خوات لەگەڵ براله، یەك دنیا سوپاس. هەرکاتێ توانیت سەرێکمان لێبدە."

جۆرج بە روویەکی ترش و تاڵ و تۆڵە ئەستێنەوانەوە سەیری دەکردم. دیار بوو لەو سەرکەوتنەی من تووڕەیە. گوتی:

"باشە ئێمە دەربارەی تۆ چ دەزانین؟ هیچ، لەماوەی بیست ساڵدا بچووکترین سوسەو هەواڵێکمان لە تۆ نەبوو، و ئێستا کە چاوت بریوەتە پارە و پوولی مە، هاتووی خۆت خۆشەویست دەکەی. ئەوە بێسوودە، من هەر ئەمشەو دەچمە لای مارك و دەیبینم."

"زۆر چاکە، کام رێیەك سەختە بیگرە و هەرچییەکت لە دەست دێ بیکە."

شەمەندەفەرەکە جوولا و هێشتا گوڕی نەبەستبۆوە کە ئوتومبێلی براکەمم دیت وەك برووسکە بەرەو رێیەکەی لای سەرەوە گڤڤەی بوو. من لە ناخی دڵەوە بە نەفرەتم کرد. پەنجەرەکەم داخست بەگیانێکی ماندوو و دڵێکی گرانەوە دانیشتم. خۆم بۆ شەوبێداری و نارەحەتیەکی دژوار ئامادە کرد. وای خۆزگە وشکە پارەی کاشی

دەدامێ، ومن پێش چوونە دایەرەم دەمدایە ریزیۆی! بەڵام ئاوا دووسێ رۆژی دەوێ تا لەلایەن بانکەوە لێکۆڵینەوەی تەواو لەسەر حەواڵەکە دەکەن، و دەو ماوەیەشدا جۆرج دەگەڵ مارکدا دەدوێ و خودا بۆخۆی دەزانێ دوایە چۆن دەبێ.

## ۲۹

من دە فارگۆنی شەمەندەفەرێدا بەتەنێ بووم، لەسەر لاتەختەکەی راکشام و بەخۆمم دەگوت دواییەکەی هەموو شتەکان چاك دەبن. دە دڵی خۆشمدا گوتم من ئەو پارەیەم بۆ پرۆژەیەکەو هیچ زیانی مارکیشی تێدانیە. بەتایبەتیش کە من قازانجەکەی بە رێك و پێکی بدەم. و ئەویش ـ ئەوە گریمان من نەمتوانی دەگەڵ ماویسیدا بم و تاکۆتایی دەگەڵیدا بمێنمەوە- لە پارەی بیمە و مووچەکەی خۆم، با کەمێکیش دواکەوێ بدەمەوە. باشە بۆ دەبێ جۆرج دەستی تێوەردا و کارەکەمان وە دوا خات، تا ریزیۆ شاگردیکی دی بگرێ؟ بەراستیش ئەگەر من نەمتوانیبایە دەکات و وەختی خۆیدا پارەکە بدەم، ریزیۆ شاگردێکی دیکەی بە سێ هەزار لیرە دەگرت.

کە لایەك لە شەوێ داشکا، ماندوویەتییەکەم دووهێندە، و باری غەمم چەندان جار قورس و گرانتر بوو. وام دەهاتە بەرچاو و گوێیان کە پێچکەکانی شەمەندەفەرێ بە دەنگێکی یەك شێوەوە هەر ئەو ئاوازەی دووبارە دەکاتەوە و دەیڵێتەوە: لێیگەرێ،لێیگەرێ، لێیگەرێ، شووتی شەمەندەفەرەکە بێدەنگیە مەرگ هێنەکەی شەوی شەق کرد و بە تەکانێکی وای لێکردم کە لەسەر لاتەختەکە هەستمەوە و قیت دانیشم. دەوساتەیدا هەستم کرد کە دەنگی شووتەکە تەواوی ئەوتاریکیەی دڵی دەخۆوە پێچابووم هەمووی وەلا ناو رەواندیەوە. من هەر لەسەر بڕیارەکەی خۆم بووم. دەمزانی بەهەر شێوەیەك بووە ئەو پارەی دەست هەر دەخەم و دەیدەمە ریزیۆی و ئارەزوو و حەزەکەی من دێتە دی. هەرچی دژوارییە ئەو دنیایەیە ناتوانێ پەژیوانم کاتەوە و کۆڵم پێ بدا، تەنانەت خودی ماویسیش نەیدەتوانی لەو رێیەم لادا کە گرتبووم. هێزێکی بەدەر لە هێزی ئادەمیزاد پاڵی پێوە دەنام و هانی دەدام بەرەو پێش بچم.



## ۳۰

سەعات چواری بەیانی گەیشتمەوە لەندەن. هەوا سارد و تاریك و غەماوی بوو و من بەدڵگرانی و گیانێکی گوشراوەوە هاتمەوە ماڵێ. دە ژووری نێو ماڵێدا لەسەر مێزێ، هێندێکی ساندویچ و قەند و چا و کتریەکی ئاوی کوڵاو و چرایەکی ئیسپرتۆی لێبوو، چام لێنا و دە حاڵێکیدا کە خەریکی ساندویچ خواردن و چا خواردنەوێ بووم، بە خەیاڵمدا هات"ئەیوا ژنێکی بێ وێنەیە. ئاگای لە هەموو شتێکە." خۆزگە مارك ئەو شتانەی هەموو لێ دەدیت! واباشە چەند دێرێکان بۆ مارکی بنووسم. سەرەتا زۆری سوپاس بکەم ئەوجا سەری قسان بەلای ئەیوایدا خوارکەمەوە تا مارك واتێبگا کە ئێمە ژن و مێردێکی نموونەیین. خۆهەر نەبێ تا ئەندازەیەك قسە ژەهراوییەکانی جۆرج بە سەرپاشواندا دەخاتەوە و پووچەڵیان دەکاتەوە."

دێرەدا هێندێکم هەست بە ئاسوودەییە کرد. زۆر بە کاوەخۆوە چوومە ژووری نووستنێ. چوومە ناو جێی. ئەیوا بەشێوەیەکی ناشاعیرانەوە نووستبوو.

لای نیوەڕۆیە بوو کە نامەکەی مارکم بردە بانك. سەرۆك بانکم دیت و جێ و رێی برایەکەمم بۆ باس کرد و داواشم لێکرد هەرچی زووە ئەو ئیشەم بۆ راپەڕێنێ. ئەو گفتی دا کە بەبێ دواکەوتن ئەو کارەم بۆ جێبەجێ بکا.

دوایەش دەدەمی نانخواردنی نیوەڕۆیەدا، کاغەزێکی چەور و نەرمم بۆ مارکی نووسی و کاتێ کە دەچوومە دایەرە نامەکەم خستە سندوقی پۆستەوە.

شەوێ بە پەلەپەل و بەوپەڕی تاسەوە، بۆ ئارتیستۆ بەرەو لای ماویس کەوتمە هەلینگدانێ. چاوەڕێم بوو. من هیچم دەربارەی سەفەرەکەی خۆم پێ نەگوتبوو، چونکە نەمدەویست ئەو بزانێ کە من بە دوای پەیدا کردنی پارەکە دا نارەحەتم، ئەگەر بیزانیبایە و لێم چووبایە کەلووکەی فاقێ و بیگوتبایە ئەو مەشق و راهێنانەی ناکەم و وازی لێ هێنابایە، خۆ لە دەستی دەهات. من و ماویس و ئایۆت لەبەردەم سۆبەکەوە دانیشتین. ئۆی خۆ لە بیریشم چوو بڵێم کە پشیلەکەمان ناولێنابوو ئایۆت!

شۆرباوەکەمان ئامادە کرد، نانمان خوارد. ئەو ماوەیەی دیکەشمان بە قسەو پێکەنین و راوتەگبیری ئایندەوە، ئایندەیەکی زێرینەوە، بەسەر برد. ماویس گوتی:

"بەوەی کە تۆ مـن دەدەیـە دەسـت ریزیـۆ و دەگەڵـە ویمـدا دەنێـری و هێنـدەش خۆشحاڵی مرۆڤ وای لێدێ بۆ ئەوە بچێ، وەك بتەوێ لـە کۆڵـە خـۆتم کەیتـەوە و لـە دەستانمت رزگار بێ!"

"دوایەش سەرێکی بادا و ئەوەندەشی گوت:

" تاچەند رۆژی دیکە من دەرۆم.. ئەوەدەمی ئەو ژوورانە چۆڵ دەبـن و ئـەوکات و ساتە خۆشانەی ئێستا هەمووی لە دەستدەچن و نامێنن."

بە پەلە گوتم:

"من نامەوێ بیر لەو شتانە بکەمـەوە، چـونکە نـاتوانم. مـن بـیر لـە ئاینـدە و دوارۆژێکـی درەوشـاوە دەکەمـەوە. بـیر لەوکاتـە دەکەمـەوە کـە حـەز و ئـارەزوو و خەونەکانمان هاتوونە دی."

"وای! خوا بکا وابێ.. بەڵام خۆشەویستەکەی خۆم، ئێمە بۆ هـەر لێـرە، هەرلـەو تاکەژوورە دا پێکەوە نەبین و بە خۆشی و شادی و بەختەوەریەوە نـەژین؟ تـۆ مـن لـە خۆت دوور دەخەیتەوە و ئاگات لێ نیە کە دووری تۆ و ژیانی دوور لە تـۆ بـۆمن زۆر ئەستەم و ناخۆش و دژوارە و بەرگەی ناگرم."

"منیش نامەوێ تۆ لە دووری من ئاسـوودە و دڵخـۆش و شـاد و شـەنگوڵ بـی. بەڵکە حەز دەکەم هەمیشە ئارەزوومەند و تینووی من بـی، هـەوڵ دەی، کاربکـەی، تێبکۆشی، تا هۆی بەیەك گەیشتنەوەمان سەرلە نوێ برەخسێ، و تا کۆتاییش دەگەڵ مندا هەروا بەو وەفاو ئەمەکداریەوە، وەمێنی."

"خۆزگە ئێمە هەردووکمان پێکەوە دەرۆیشتین و وازمـان لـەو نەخـشە و پلانانـە دێنا. من گفتت دەدەمێ تا گیان لە لەشمدایە ئیشت بۆ بکەم، خانوێکی خنجیلانە لە جێیەکی خۆش ئاو و هەوا دەگرین. جێیەکی وا گەلا مێوەکـان بەسـەر پەنجەرەکانیـدا



شۆڕ ببنەوە، و منیش وەك کەنیزەیەکی تۆ کە سوڵتانی من بی دێـم و دەچـم و ئـیش دەکەم و چونکە دەنگی منیشت زۆر پێخۆشە هەمیشە هەر بۆت دەڵێم."

دە باوەشـێم وەرێنـا و جووتـە لێوەکـانیم مـاچ کـردن. ئـەو مـنی لـە خـۆی تەکاندەوە و گوتی:

" پێتوانەبێ من لە ناوجل و بـەرگ و پۆشـاکێکی گرانبـەها و زێـڕ و زەبـەرێکی زۆردا لە ئێستام خۆشتر دەوێی، تەواوی زێڕ و گەوهەری دنیایـە نـاتوانن شـتێك لـەو خۆشەویستیە زیاتر بخەنە سەر ئەو هەموو ئەوین و خۆشەویستیەی من کـە بەرامبـەر بە تۆ هەمە. یا هیچ سفرەیەکی رەنگینی دنیایە رێی ناکەوێ بـەو سـفرەی بـەردەمی مە بێ کە نانی ئێوارەی پێکەوە لەسەر دەخۆین. ئەگەر تۆش دەنگی منت لە عیشقی من و لە لەش و گیانی من و لە هەستەکانی من پێخۆشترە و هێندەی حەز لێدەکەی، ئەوا من ئامادەم کە هەرتەنیا ببمە ئاواز و دەنگ و هیچی دی و ئەوەندەشت بۆ بڵـێم تا دە ئاوازەکانی خۆمتدا نقووم و نغرۆ دەکەم."

"وای ماویس، تۆ دڵی من دەشکێنی!"

"کام دڵ، هەی دڵڕەق، من چۆن دەتوانم ئەو دڵـە بکـشێنم. مـن دەبـێ خـۆم، هەروەك شەپۆلێکی کە لەسەر بەردەکان ورد و خاش دەبێ، ئـاوا لەسـەر دڵـی تـۆ خۆم وردوخاش کەم و خۆم لە ناوبەرم، و هەرکاتێکیش زانـیم ئـەوا ورد و خـاش و تێکشکاو لەناو چووم. هەمدیس لە دوای مردنێش ئەگەر دڵنیابم هەر دەگەڵ منی دووبارە بۆت تێهەڵدەکەمەوە."

بەڵام هیچ شتێك ناتوانێ من لە بریارەکەی خۆم پەژیوان کاتەوە و ئەوە رێگایەکـە کە هەر دەبێ لەسەری بەردەوام بم. چونکە من ئایندەیەکی وا درەوشـاوە و بـەختیارم دەپێش چاودا بوو کە بەسەر هەموو شتێکی کەوتبۆوە.

کاتێ کە ماویس دەیگوت دوای چەند رۆژێکی دی لە من جودا دەبێتەوە و دەگەڵ ریزیۆیدا دەڕوا، من چاوەکانم بێ ئیختیار دەنووقاندن و وەك بمهەوێ ئەو دیمەنەی هـەر نەبینم. بەڵام پێم دەگوت ئێمە هـەر دەبـێ بۆماوەیـەکی کـورت خـۆ لەبـەر رەنـج و

ناخۆشییەکانی جوداییە راگرین. هیچ بەختەوەرییەك هەروا لە خۆوە بە پێی خۆی روو لە ئادەمیزاد ناکات و بۆی نایە. بیرو بۆچوونەکانی دوای رۆینیّ ویم لەکار کەوتبوون و هەر دەگەڵە خۆمدا دەگوتەوە"وازبێنە با ئەو هەنگاوە گەورەش باوێژریّ تا دوایە.." و چونکە بڕیاریشم وابوو کە ریزیۆ بچتە هەر جێیەکی من بە دوایەوە بم، بۆیە هەرکاتیّ کە ماویس دەیگوت سیّ ساڵ لێك دادە برێین، من ئەو پەرەکەی ئەو لێك دابرانەم بە سیّ مانگ دادەنا و هەر بەوەندەشم پێشبینی دەکرد. نوختەی دی باسەکە تەلاقی ئەیوا بوو، چونکە تازە من بە هیچ نرخێك نەمدەتوانی دەگەڵیدا بژیم. بەلام جاریّ پێش هەموو شتێك دەبیّ کارەکەی ماویس تەواو کەم.

دەوبگرە و بەردە و بێنە وبەرەی ئەو بیرو خەیالانەدا، من دەگەڵ ماویسیشدا ئاسوودە نەبووم و کاروپیشەم ببووە راوێچکە و نینۆك کرۆشتن، خەو و خۆراکم لیّ هەڵگیرابوو.

دووشەممە نامەم بۆ مارك نووسی کە هەر دەبوو سیّ شەممە پێی بگا و دەبیّ رۆژی پێنج شەممە کارەکەی منیش لە بانك تەواو ببیّ، و تا ئەو پارەیەش نەهاتبایەتە نێو دەستم دڵم نەدەکەوتە یەك و ئاسوودە نەدەبووم. تا رۆژی پێنج شەممە هیچ هەواڵێك لە مارکەوە نەبوو و من چومە بانك. رەییس دەستبەجیّ بە پیرمەوە هات و گوتی:

"ئاغا دالتۆن، ئێمە تا هێشتا هیچ هەواڵێکی ئەم حەواڵەیەمان پێنەگەیشتووە و هیچمان لە بارەیەوە بۆ نەهاتووە، دوا کەوتنەکە لە لایەن بانکی براکەتانەوەیە.."

"داخوا دەزانی هۆی چیە؟"

"نەخێر. بەڵام زانیاری پێویست کە دەبیّ پێش پارە دانەکە بێت، نەگەیوە."

"دەتەویّ بڵێی کە هێشتا وەڵامی نامەی ئێوەش نەهاتۆتەوە؟!"

"هەر واشە"

"وای! کەواتە دواکەوتووە و شتێکیشی بە پێچەوانەوە هەرنەهاتووە؟"

"بەڵیّ تەنیا هەر دواکەوتنە."

"باشە من برووسکەیەك بۆ برایەکەم دەکەم. چونکە من ئەم پارەیەم پێش تەواو بوونی دەوامی بانکی رۆژی شەممە دەویّ."



"بەم جۆرە دەبیّ زانیاری پێویست تا سبەی بەیانی بگاتە مە."

"هەر ئێستا من بروسکەیەك دەکەم." و هەر ئەوساتە برووسکەیەکم بە داوای وەڵامی خێراوە بەو ناوەرۆکەوە کرد"بۆ پارەکە نەدراوە هۆی چیە؟"

سەعات پێنج برووسکەیەکم بەم ناوەرۆکەوە پێگەیی:"نامەم بنووسیوە"

قسەکانی جۆرجکاری خۆیان کردووە. ئەدی باشە بۆ زووتر نامەی بۆ نەنووسیم تا بەڵکە رێیە چارەیەکی دیم دیبایەوە، گەلحۆی کەودەنی! جۆرج هەقیەتی کە نایەڵیّ دەست بخاتە کاروباری کۆمپانیاکەوە.

چیم لە دەست دەهات؟ ئایا دەمتوانی داوا لە ریزیۆی بکەم پارەکەمان بە قیست لیّ قبووڵ کا؟

وام بە چاك زانی بچمە ئوتێل ساوی و سکرتێرەکەی ببینم. هەر لەوێشەوە بروسکەیەکی دیکە بۆ مارك بکەم. ئەمە دوا تیری کەوان بوو.

بۆیە هەر کە دایەرە هەڵگیرا. بروسکەیەکم بەم ناوەرۆکە لێدا "ئێوە بەڵێنتان بە من دا، دەبیّ بەیانی پارەکە بدریّ."

و هەر لەوێشەوە بەرەو ئوتێل ساوی کەوتمە قاڵدوان، بەبیّ ئارامییەکی تەواوەوە بە ناو خەرمانی گوڵاندا کە ئاشنا و رۆشنا وخۆشەویستانی سنیۆری ناردبوویانن رەتبووم و چووم دەچاوەڕوانییەدا راوەستام و کاتیّ سکرتێرەکە وەژوور کەوت، باسەکەم دەگەڵ هێنایە گۆڕیّ.

برۆیەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:

" ئەوە هەر نابیّ، ئێمە دووشەممە ئینگلتەرە بەجیّ دەهێڵین و ئەگەر مادامیش دەگەڵەمەدا نەیە.."

وەك بڵێی شانی هەڵتەکێنیّ و من پرسیم:

"ئایا شاگردێکی دیکەتان دیار کردووە و هەتانە؟"

"ئەڵبەتە، چەند کەسێك هەن، لەوانەش لاوێکی زۆر جێی سەرنجی دۆشیکینە و دەنگێکی تابڵێی خۆشی هەیە. دۆشی پارەیەکی زۆری داوا کردووە." من بە پەلە گوتم:

"ئەوە جێی مادام کۆترەلە."
"ئەڵبەتە هەروایە."
"ئایا سنیۆر ڕێزیۆ قایل دەبێ پارەکەی بە قیست بدرێتێ؟"
"بە دڵنیاییەوە قایل نابێ، چونکە وەك ئاگام لێیە پارەیەکی تەواوی بۆمادامێ داشکاندووە ئیدی چاوەڕێی چیدیکەی؟"
"زۆر چاکە، تکا دەکەم لە مبارەیەوە هیچ بەکەس نەڵێی، تایەك شەمە هەمووشتێك ڕێك دەبێ!"
"بۆ هیچ پێدەچێ سەرنەگرێ؟"
"دڵنیا بن من هەر لەسەر قسەو بەڵێنی خۆمم."

چەندین سەعاتان وەك شێتان دەکۆڵانانەدا و بەبێ ئامانج هاتم و چووم و بیرم لەوگرێ کوێرە عاسێ بووە نەکراوەیە دەکردەوە. هەرگیز هێندەم ئێرەیی بە خواپێداوان نەبردبوو. هەرگیز نایەکسانی ماف و سەرمایەم هێندە بە لاسەنگی بەبەر چاومەوە نەدیتبوو. جارێکیان ئەیوا بەمەبەستی پیتاك کۆکردنەوە بۆ ڕێکخراوێکی خێرخوازی چووبووە لای خواپێداوێك دەیگوت:

"خانمێکی زۆر دیار و خواپێداو کە تاك وتەنیا دە ئوتێلێکیدا دەژیا و بەردەستەکانی ئوتێلێ هەموو وەك پەروانەی بە دەور و خولیدا دەهاتن و دەچوون. کارەکەرێکی تایبەتی فەرانسەیی و سکرتێرێکی هەبوو، خوێندەواریشی نەبوو. سێ سەگی پەکینی دەژوورەکەیدا بێرو وبەوێیاندا رادەکرد و خانمیش کە هێندە جوانیش نەبوو، بە خەرمانێك قژی زەردی دەستکردەوە، و بە چاوی ڕێژراو، و جل وبەرگی دەسکاری فەرانسەو چەندین ئەنگوستیلەی بەرلیان وگەردانەی مرواریییەوە دانیشتبوو. کاتێ مەبەستی ئەو چوونەمم بۆ ڕوونکردەوە گوتی:"قسەکانتان دڵگرانیان کردم، وێستاش ئامادەم تاکە یەك لیرەتان بدەمێ وبەداخەوە لەوەشم زیاتر لە تواناداا نیە، ناتوانم!!"

کاتێ کە ئەو داستانەی بۆ گێڕامەوە، من بە خوێن ساردییەکی تەواوەوە وەڵامم دایەوە:
"ماڵی خۆ نەخۆری لۆ چەکمە سۆری!"



## ٣١

بەیانی ڕۆژی دوایی نامەیەکم بەم ناوەڕۆکەوە لە مارکەوە پێگەیی:" دوای ڕۆیشتنی تۆ جۆرج هاتە لام، و یەکەمین قسەشی ئەوە بوو کە من چۆن هەزار لیرەم داوە بە تۆ، منیش پێمگوت کە کاری وام نەکردووە، ئێمە هەر خەرجییەکی کە لە پاشەکەوتی کۆمپانیاکە دەکەین بە ئاگاداری هەردوولامان بووە جۆرج هەمیشە گازاندەی دەست بڵاویەم لێدەکا کە زۆر خەرجم، لەوانەشە ڕاست بکا. بۆیە سەیر دەکەی بەلای منەوە چەند سەیر بوو، کاتێ کە دیتم تۆ هەر بە ئەنقەست ئەوت بەهەڵە برد. دەگەڵ قسانیشیدا جۆرج زۆر شتی ناسك و هەستیاریشی بۆ باس کردم کە دڵنیام ئێوە لەبەر کەم وەختی نەتانتوانی مەسەلەکان بە تەواوەتی تاوتوێ بکەن. جۆرج بە منی گوت کە ئەو ژنە دەنك (قل)ی ئێوەیە و ئێوە دەتانەوێ پێکەوە هەڵێن. جۆرج پێیوایە کە مەسەلەی عەشق و ڕاهێنانی دەنگەکەش هەمووی هەر بیانوویە، و ڕاست نیە، و دەڵێ کە ئەیوا بچووکترین ئاگایەکی لەم مەسەلەیە نیە و نازانێ. بۆیە پێش ئەوەی هیچ هەنگاوێك دەربارەی حەواڵەکە بنێم، تکا دەکەم، مەسەلەکەم بۆ ڕوون کەیتەوە و خۆت لەو تۆمەتانە ڕزگار کەی و بەمنیش بسەلمێنی کە دەومەسەلەیەدا هیچ ئازار و زەرەر و زیانێك بە ئەیوا ناگات.

من نامەوێ هاوبەشی کارێك بم ببێتە هۆی سووکایەتی بە ئەیوا. یا ببێتە مایەی ئابڕو چوونی بنەماڵە و خاوخێزان و کەسوکار. جۆرج پێیوایە کە ئەگەر کارێکی ناپاکانە لە تۆوە رووبدا، ئەوە یەکسەر مستێکی گورچووبڕە و وەکۆمپانیای دەکەوێ. کە بۆخۆشت دەزانی مووچە و ژیانی ئێمەش لەسەر ئەو کۆمپانایەیە کە بە خوێنی جگەر گەیوەتە ئێرە.

من لە پشتیوانیە خۆم لەو حەواڵەی پاشگەز نابمەوە، بەمەرجێك دڵنیابم کە گومانم لە ڕاستی و دروستی قسە و داواکارییەکانت نەمێنێ. ڕاستە من دەستورم داوەتە بانك کارەکە ڕاگرن تا تۆ من دڵنیا دەکەیتەوە و چاوەڕێی ئەوەش نەبووم تۆ بە جۆرج بڵێی کە من بێ تێبینی و لێکۆڵینەوە چەکێکی هەزار لیرەییم داوە بە تۆ."

وای کە جۆرج، شەیتانێکی زیرەکە و بە وەستایانەی کارەکەی من خراپ کرد! دەو ساتەوەختەیدا بە بێ کەمترین هەستی بەزەیی و نیگەرانیەکەوە دەمتوانی بیکوژم. بەڵام ئەو بیر و خەیاڵانە بە کەڵك نەدەهاتن و دەو دەمیدا چ سوودێکیان نەبوو. دەبێ دەستبەجێ بارێکی دیکە و رێیەکی دیکەی لێ ببینمەوە، بەڵام چ بارێك و چ رێیەك؟

بیرم کردەوە نیوەی سەرمایەی ماویسی وەرگرم و ئەویدیش لە جێیەکی قەرد کەم، و بەشە بیمەکەمی لە بری کەفالەت لە جێ دانیم، بەڵام کات بەبەریەوە نەمابوو و وەختەکە تەنگ بوو. من تا شەو نەمتوانی ماویس ببینم، و بەیانیش بانك دادەخرا. دەبوو هەر هەنگاوێکی دەینێم دەستوبرد و دەستبەجێ و بەپەلە بێ.

بەیەك دنیا غەم و پەژارەوە چوومە دایەرە. وام هەست دەکرد پارەکەم لەبەر دەستایە! و ناتوانم هەڵیگرم. شەوێ چوومە لای ماویس، ئەو دەو دوا دواییانەدا شۆڕ و هەڵچوونی ئەو دیدارانەی جارانی نیشتبوونەوە، کە نەدەبوو واشبێ، ئەدی حەز و ئارەزووەکانمان لە وەدیهاتنێ نزیك نەبوونەوە؟"

سوێند دەخۆم کە تا ئەو رۆژەی دەدادگایدا رانەوەستام و بارانی پرسیارانم بەسەردا نەباری نەمزانی چیم کردووە.

کاتێ کە زانیم چ هەنگاوێکی ترسناك و بەسامم ناوە و دەستم بۆ چ تاوانکارییەك بردووە و چۆن ئەو بڕیارەم بەسەر تەواوی هێزی ئەقڵیدا زاڵ بووە و چاوی هەست و هۆش و گۆشی بەستووم ترسم لێ نیشت. دەزانم دەستێکی نادیار هانیدام و پاڵی پێوەنام، و سەرەنجامیش یاغیەکی بێ ئابڕوو و تاوانبارێکی دەرکراوی ناو کۆمەڵم لێدەرچوو کە بەو کارە شێتانەیەم ئەوەندە کورتە ژیانەو ئەو عیشقەی خۆم هەموو لە دەست دا. دە زیندانێدا هەموو دەمێ دەو بیروخەیاڵانەدا بووم کە داخوا چ شتێك وای کرد من دەست بۆکارێکی وا بەرم؟ ئەم مەسەلەیەش بۆ من تەواو سەرنج راکێش بوو وەك پزیشکێك یا دەروونناسێك دەمهەویست نەخۆشییەکە دەستنیشان کەم و کێشەکە تاوتوێ کەم، زۆر جاران باسەکەم دەگەڵ پزیشك و قەشەی زیندانێدا باس دەکرد. کە ماوەیەك رابرد، سەرلەنوێ هاتمەوە سەرخۆ،هەمدیس دەدنیای خەیاڵی



خۆمدا ئاشقە دڵسوتاوەکەی ماویسم دەدیت کە بە زوویی، دوای بەرهەڵدابوون لە زیندانێ، دەچوومەوە لای و بە خەیاڵی ئەوەشەوە کە لە پێ و دانگی منەوە، و هەر بە هۆی منیشەوە ئەو دەبێتە گۆرانیبێژێکی بەناوبانگ، دڵم لێواولێو و پڕ دەبوو لە خۆشی و شادی و شەنگوڵی. هەموو ئەو رەنج و ناخۆشییانەی من شانم دانە بەرێ و خۆم لەبەر راگرتن پەیژەیەك بوو ئەوی دەگەیاندە ترۆپکی ناو و ناوبانگ و پێشڤەچوون، و منیش هەر بۆیە بوومە قوربانی تا ئەو بدرەوشێتەوە و تیشکان باوێ. هەر بۆیەش چێژێکی یەکجار خۆشم لەو رەنج و زەحمەت و قوربانییەی وەردەگرت. من زۆر بە پێداگرتن و بڕیارێکی پتەوەوە دە دادگایدا راوەستام تا کاتێ کە دەرکی زیندانێم بەسەردا داخرا. ئەو دەمی زانیم کە من لە ماویس دابڕام، و ئەو تاسێ ساڵ، بێ سەرپەرشت و پارێزگار دەبێ. و منیش دە سووچی زیندانێدا ناتوانم ببینم، یا دەنگی ببیسم. دە دنیای تەنیاییدا، چەند سەعاتان، کە دەستم بە چاوی خۆمەوە دەنا گیانی ماندووم لە کوچەو کۆڵانە تەنگ و باریکەکانی لەندەندا دەخولایەوە و دەچووە ئارتیستۆ، ئەو ماڵەی کە سەردەمانێك ئاشیانەی عیشقی من بوو و چێژی بەختەوەری و خۆشیم تێدا چەشتبوو، و ئەو گیانەم لەوێ سەرگەردان دەبوو.

من ناتوانم بە وردی ئەو چەند رۆژانەی دواییتان بۆ بنووسم. ناتوانم بۆتان باس کەم کە ماویس تا چ ئەندازەیەك غەمبار و گرژو دڵگیر بوو. دەو ئێوارە خۆراوایە هەینییەیدا کارەکانمان هەموو ئەنجامدان. و من بە ترس و لەرزو شڵەژاویەوە دەترسام نەکا لە دوا دوایین دەقیقەدا هێز و توانا و ورەی خۆم لە دەست دەم و نەهێڵم بڕوا. ئەوم هان دەدا کە شتومەك و کەلوپەلەکانی خۆی جوان بپێچێتەوە و بیانبەستێ، و ئەوەی پێویستیەتی دەگەڵە خۆیدا بەرێ و ئەوەی دەشمێنێتەوە لە جێیەکیان دانێین، و بڕیاریشمان دا کە عەسری رۆژی شەممە من ئۆتومبێلێك بگرم و بچینە ئەو گوندەی کە شوێنی لە دایکبوونی وی و سەرزەمینی بەختەوەری و عیشقی دایکی بوو. ماویس دەو سەفەر و گەڕانەیدا دەگەڵ ئەو هەموو غەم و خەفەت و دڵتەنگیەشیدا زۆرشاد و شەنگوڵ دەهاتە بەرچاو. من داوام لە خاوەن ماڵەکە کرد ئەگەر دەکرێ تاوێك دەنێو

خانوو و بەرە و باغیدا بگەڕێین. ژنە جحێڵەکە زۆر بە خۆشەویستی و نەزاکەتی بێ وێنەوە هەموو بەش و نهۆمەکانی پێشاندایین و تەنانەت دوایە چاشی داینێ.

دەگەڕانەوێدا بۆ یەکەمین جار لە ڕێستورانێکی دوور کە ترسی ناسینێمانی نەبوو، نانی ئێوارێمان خوارد و هاتینەوە ئارتیستۆ. ژوورەکە لەبەر هەڵوێژرانێ رووت و قووت و چۆڵ و هۆڵ بوو. هەر دەگەڕانەوێدا، دەڕێیەدا، ماویس قۆڵی دەقۆڵی هەڵێشام و گوتی:

"جان، چەند سەیرە کە دوای ساڵانێك.."

من لە گوتنی وشەی "جان داچڵەکیم، و سەیرم کرد دوای ئەو هەموو ماوەیەی کە پێکەوە بووین، ئەو من هەر بە ناوی جان کاوینەوە دەناسێ. چونکە ئەو ناوە لەسەر ئەوکارتەی نووسرابوو کە من یەکەمینی بەهەڵە دابوومە خوشکی گیانی و هەر بەو ناوەشەوە بە ریزیۆ ناسێنرابووم.

ئەم باسە بارێکی قورسی لەسەرشان لابردم، چونکە هەمان رۆژ بەیانیەکەی پێش هەڵگیرانی دایەرە من هەزار و دووسەد لیرەم لەسندووق دزیبوو، ئای چەند بە سووك و ئاسانیم بەدەستەوە هات. یەکێك پێش دایەرە هەڵگیرانێ ئەو پارەیەی بە ئەسکیناس هێنابوو و منیش لێم وەرگرت و پسوولەی وەرگرتنێم دایە. ئەسکیناسەکانم قەدکردن وخستمنە گیرفانی دواوەی پانتۆڵەکەمەوە. کەس ئاگای لێنەبوو. تا رۆژی دووشەممە مەسەلەکە ئاشکرا نەدەبوو، و تا ئەو دەمیش من لە ئینگلتەرەی دەرچووبووم. ئەو نەخشەو پلانەشم دەچرکەیەکدا، دوای دیتنی پارەکە بەمێشکدا هات. هەر ئەوەندە لە دایەرەی چوومە دەرێ، خێرا چووم بە پارەی فەرەنسیم گۆڕیەوە. بڕیار بوو رۆژی یەك شەممە پارەکەی ریزیۆی بە فرانکی فەرەنسی بدەم. ئەو پەنجا لیرەیەی کە هەشم بوو بوو بۆ خەرجی ومەرجیە، لە بانکم راکێشایەوە. شەوی شەممە کەمێکیشم پارە دایە ماویسی تا هەندێ دیاری لە باتی من بۆخۆی پێ بکڕێ.

بیرەوەری دوایین شەوی ئارتیستۆم باش بیر نەماوە. هەردووکمان گرژ و نارەحەت و تووڕە بووین.من هێندەم قسەو پەندو ئامۆژگاری و راسپاردە هەبوون، کە ئیدی



ماوەی عیشق و ئەوین و دڵداریەمان نەبوو. ماویسیش هەروا بەڕەنگی پەڕیوە و روخسارێکی غەماویەوە بێدەنگ دانیشتبوو. بەڵام کاتێ کە تاوم دایە و بڵندم کرد و بەسینگی خۆمەوەم گوشی وەك بڵێی گیان و وزەو تەڕاییەکم دە دەماران گەڕایەوە. ئەویش هەروا بە فرمێسکو ئاخوناڵە و ماچی گەرموگوڕی ئاگرینەوە تخێڵ بوو.

## ٣٢

رۆژی دوایی یەکترمان دیتەوە و بۆ نانخواردنی نیوەڕۆیە چووینە لای ریزیۆی. پێش ئەوەی ماویسیش ببینم من کارەکانی خۆمم هەموو رێك خستبوو. لەسەر سفرەی نانخواردنێ لە ریزیۆم پرسی دوای جێ هێشتنێ ئیگلتەرەی بەرەو کوێ دەچن؟ گوتی:

"برۆکسل."

من دەربارەی نەخشە و بڕیاری بەوان گەیشتنەوەی خۆم، هیچم تەنانەت بە ماویسیش نەگوت.

کە لە نانخواردنێ بووینەوە، بە ریزیۆم گوت ئەو دوای نیوەڕۆیەی مادام دەگەڵە مندا دەبێ و لە ئێوارێشەوە بە فەرمی دێتەوە لای ئێوە.

دوای لە ئوتێل وەدەرکەوتنێ ماوەیەك بە پێیان رۆیشتین. بچینە کوێ؟ ئارتیستۆ ئیدی جێی تێدا مانەوێ نەبوو. بەڵام وەك بڵێی چارەیەك نەبوو و هەر دەبوو لەو ژوورەساردو سڕو رووتە ماڵئاواییەك هەر بکەین! بۆیە جارێکی دیش لە سەر کوسییە دارگوێزەکان، بەرامبەر پەنجەرە بێ پەردەکان دانیشتینەوە و کەوتینە سەیر کردنی کۆڵانێ.

ئێستا ساتەوەختی لێك دابڕانێ هاتبوو. ئێستاش ئیدی ئەو پارەیەی بۆ ئەو مەبەستەم دزیبوو، هەر پێم بوو و تازەش پەشێمانی وگێڕانەوەی دادی نەدەدا و نەشمدەتوانی دەستبەرداری بم. ئەگەر بشمویستبایە وەك جاران دەست پێبکەمەوە و وابژیم، مەیسەر نەبوو.

کاتێ کە ماویس خۆی بەمنەوە نووساندبوو و بەگەرمی و دژوارییەوە خوداحافیزی دەکرد، سەرم نایە سەر سینگی و وەك منداڵێکی نوور نوور گریام. بەردەوام هەر ئەوەم لێ دووپات دەکردەوە کە دەگەڵمدا بە ئەمەك و بەوەفابێ، تا دەیگەمێ. داوام لێکرد کە بیرەوەری و یادەکانم دە دڵی خۆیدا بپارێزێ و هەڵیانگرێت و بیانهێڵێتەوە. بێدەرەتانیە من ئاوری هەستەکانی وی داگرت و بەوپەڕی کەفوکوڵ و هەڵچوونەوەیەکی بێ وێنەوە هاواری کرد:

"من تەنیا هەر تۆم خۆشدەوێ، دوای تۆ هیچ پیاوێك ناتوانێ و ڕێی ناکەوێ دەستم بۆ بێنێ. من دە عیشق و بێزاریەدا، دەهەر دووکاندا زۆر کوشندەم. ئەگەر دوای تۆ کەسێك هەر تەنیا پەنجەیەکیم بۆ درێژکا دەیکوژم."

دێرەدا روخسارە گرژ و فرمێسکاوییەکەی بەلای مندا وەرگێڕا و بە گەرمی و هەڵچوونێکی واوە کە لە چاوەکانیەوە بڵێسەی دەدا، گوتی:

"کاتێ کە دەڵێم دەیکوژم بۆ لاف و گەزاف لێدانێ وانالێم. ئەوە هەرمنیش بووم کە بەرناردم کوشت. ئەو پیاوە چەپەڵەی کە مێردی من بوو و زۆریی لێدەکردم و دەستدرێژی دەکردمە سەری."

من ئەو قسەیەم بە هەڵچوون و کەفوکوڵی وی دانا و هەوڵم دا هێوری کەمەوە. بەڵام ئەو ئاوای لەسەر ڕۆیی:

"بەڵی من ئەوم کوشت. لەبەر وەی پیاوێکی بێ شەرەفی هەمیشە سەرخۆش بوو و لێیدەدام. و دەیهەویست ناموسی من بفرۆشێ. من ئەوم بە پێخۆر دەرمانخوارد کرد کەم کەمەی ژەهرێکی سڕ کەرم دایە کە هێشتا زانایانیش پەیان پێ نەبردووە. ئادەمیزاد زۆر زوو بەو ژەهرەی رادێت و فێری دەبێت، و ئەو جا کە ماوەیەك بەکارهات، ئەگەر بڕیت و نەتدایە ئەو کەسە، ئەوە مردنی مسۆگەرە. کاتێکیش بەرنارد گەییە ئەو قۆناغە، و بە هۆی خراپ هەرس کردنەوە کەوتە ناوجێی، دەرمانەکەم لێ بڕی و ئەویش مرد. ئێستاش خۆشەویستەکەم، ئەگەر بێجگە لە تۆ هەر پیاوێکی دی دەستێ بەرەو لای منەوە درێژکات، دەیکوژم."



من ئەگەر بێت و بمەوێ کاریگەری دۆزینەوەی ئەو نهێنیەتان بۆ ئاشکراکەم و پێتان بڵێم، ناتوانم، بەسەرسامیەوە گوتم:

"ئەوە درۆیە، هەرگیز شتی وانیە، تۆچۆن دەکرێ تاوانی وابکەی؟"

بەڵام ئەو بە سوور بوون و پێداگرتنەوە گوتی:

"بەڵێ، ئەوە راستیەکە نکوڵی لێناکرێ، دایکم ئەو ژەهرەی دەگەڵە خۆیدا هێنایە پاریس. پێموانیە ئەو هەرگیز بەکاری هێنابێت و سوودی لێ وەرگرتبێ، بەڵام رۆژێکیان کە لەو پەڕی نائومیدی و بێ هیواییدا بوو گوتی:" هەر رۆژێکی کە ئیدی رێگاچارەیەك و ڕێی هەڵاتنێ لەو بەدبەختی و بێ دەرەتانیەی نەما ئەو دەمی بەکاری دێنم، بەڵام حەیف شتێکی کەمم لێ وەدەست کەوتووە. ئەو گوتی هەروا تۆزقالێکی دەقاوەی یائاو یا هەر شەربەتێکی کەی تەواوە. کاریگەریەکەشی ئەوەیە کە دەبێتە هۆی بەرین بوونەوەی رەگ و دەمارە خوێنبەرەکان وخەوهێنیشە. کە ئادەمیزاد خووی پێوەگرت، دەبێ هەر بیخوا، و لەوەش بەولاوە نەیخوا دەمرێ، بە بێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێکیش بە جێ بێڵێ.

من بەردەوام ئەو ژەهرەم دەدایە بەرناردی، تا پێی بنوێ و دەست لە من نەدا، ئەو هەقەمستی مردنێ بوو و مردیش."

"بەڵام، ماویس ئەمە کوشتنە، کوشتنێکی بە ئەنقەست، کە بە نەخشەیەکی پشوو درێژانە و بەکاوە خۆ ئەنجامدراوە.

"ئەو شایانی ژیان نەبوو."

"باشە چی دەکرد؟"

روخسارە رەنگ پەڕیوەکەی ماویس، دەگەڵ چاوە پڕغەمە فرمێسکاوی و ماندووەکانی ویم تا ئەمرۆش هەر دە بیروخەیاڵاندا زیندووە. نهێنیەکی غەم و پڕژانی لە کەلێنەکانی مێشك و دڵ و دەروونیەوە دەرداویشت و ئەوەی پێدەگوتم کە چۆناو چۆن ئەو پیاوە دڕندە و زۆردارە هەمیشە سەرخۆش و بەدمەستە ویستوویەتی سوود لە جوانی و جحێڵیە ژنەکەی ببینێ بۆ کاری خراپە.

"ئەو هەر دەیهەویست من دەگەڵ جحێڵان ئاشنابم و بە ناوی ئەوەی کە ئەوان هاوڕێ و ئاواڵێن، دەستە دەستە دەیهێنانەوە ماڵێ، و بە بیانوویەکیەوە منی بەتەنیا دەگەڵەواندا بە جێ دەهێشت. منیش دەبایە بە هەموو هێز و توانا و ڕێزی خۆمەوە، ئاگام لە خۆم بێت و خۆم بپارێزم، دەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو هەرگیز سەرنەکەوت، بەڵام دەشمزانی کە ئەو دەیهەوێ دوای ئەوەی پارەی بیمەکەی وەرگرتەوە بمباتە فەرەنسا، و بە ناچاری ملکەچی نەخشە و پلانەکەی خۆیم کا. وای ئێوە نازانن چەند دڕندە، و خۆپەرست وبێ شەرەف بوو. ئەو تەنیا هەر شایستەی مردنێ بوو و هیچیدی."

"دەتەوێ بڵێی کە ئەو پیاوە دەیهەویست... دەیهەویست.."

"بەڵێ دەیهەویست بمفرۆشێ."

"بەڵێ. ژن و مێردایەتییەکی کە بە هۆی خەڵکی دییەوە ڕێکخرابوو، ئەو دۆستانەی منیان دایە بەرناردی هەر دەیانەویست من مێردی بکەم، نە ئەوان دەیانزانی و نە من کە ئەو چ دڕندەیەکی چەپەڵە. ئاشنایەکەم زۆر نیگەران بوو و پێیوا بوو کە بەرنارد وەك باوکێك ئاگای لێم دەبێ، هەرچەندە لە ڕاستیشدا ئەو وەکو باوکم بوو، بەڵام وادەرنەچوو."

من بە بیستنی ئەو داستانە هەرچی غەم و خەفەت و نیگەرانییەکە هەمووییم لە بیر چۆوە، دە حاڵێکدا کە ماویسم لە خۆم دەتەکاندەوە گوتم:

"ئەو پیاوە بەدخووە دەیویست بەکارت بێنێ و بتفرۆشێ؟"

"هەر ئا ئاوا."

"ئەدی تۆ..؟"

"بە هەموو هێز و توانایەکیەوە کە هەمبوو. بەرگریم لە خۆم کرد و مەریەمەی پاکیزە هێزی وەبەرنام و یارمەتی دام، و چونکە ملکەچی فەرمانەکانی ویش نەدەبووم، منی بە دژوارترین شێوە تەمبێ دەکرد و بەلیسان وەرمدەگەڕایە و لێیدەدام."

"لە تۆ.. لە تۆی دەدا؟"



"بەڵێ.. منیش ئەو ژەهرە کوشندەیەم بۆ دە ئاوێ دەکرد."

"ئەدی بۆ بە جێت نەهێشت؟"

بەترسێکەوە سەیرێکی ئەوناوەی کرد و گوتی:

"نەمتوانی. غەریب و تەنیا بووم، دەترسام، لە مردووان دەترسام و نەمدەوێرا بەتەنێ و بێ سەرپەرشت، وەکوچەوکۆڵانان کەوم، هەر چۆنێکی بوو لێرە سەربەخۆ بووم.. دەمزانی ئەو دەبێ هەر بڕوا ولە بەین بچێ و نەمێنێ."

"بەڵام تۆ سێ ساڵی دەگەڵدا ژیاوی."

"ڕاستە، بەڵام خۆ ئەو هەر لەسەرەتاوە وانەبوو. دوای ئەوەی کە بار و گوزەرانی ماڵیمان خراپ بوو و ئەو نەیدەتوانی بچێتە دەر و ئێرو ئەوێ و ئێواران لە دەرەوە نان بخوا یاری بکات هات ئەو ڕێیەی گرت." ئالێرەدا بە پەنجە تەزیوە سارد و سڕەکانی دەستی گرتم و گوتی:

"ئەوەی منت پێ ناخۆش بوو؟

من لە جێی خۆمەوە جووڵام. هەستم کرد جومگەکانم ڕەق بووون. قێز و بێزێکی ناخۆشم لەبیستنی ئەم داستانەوە دەخۆمدا هەستدەکرد. دوای سێ ساڵ ژیان دەگەڵ ئەو پیاوەدا، ئاوابێ بەزەییانە کوشتبووی، ئەو بکوژ بوو، ترسناکترین بکوژێکی بە ژەهر کە بە کاوەخۆ و زۆر بەنەرمی و لەسەرخۆییەوە دەکوژن. دوایەش زۆر بێ باکانە، و هەر لەو خانووەشدا، و بێ ترس و لەرز دەژیا. خودایە من ئەوم چەندە بە پاك و بێگەرد و بێگوناه و بەستەزمان دەزانی!

وەك بیری من بخوێنێتەوە، بە دەنگێکی نووساو و مەیلە و بڵەوە گوتی:

" تۆ هەر چۆنێکم تێدەگەی ئارەزووی خۆتە. من ئامادە بووم تا هەتایە ون و بێ ناو ونیشان و هەژار و نەدار تەنیا خۆشبەختانە و کامەران دەگەڵ تۆدا بژیم. کاتێ کە تۆ پێت نایە ناو ژیانی منەوە، و من تۆم خۆشویست گەورەیی و خۆ بەزل زانینم بەلاوە نا. من نەمهێشتبوو بەرنارد بزانێ دەنگم خۆشە دەگەڵ ئەوەشدا کە گەورە ترین حەز و ئارەزووشم ئەوە بوو ببمە بە ناوبانگترین گۆرانیبێژ. ئێستا و ئێستاش

هەر پێم نەگوت. تەنانەت کە لەسەرەتاشەوە دەگەڵمدا نەرمونیان و میهرەبان بوو، چوون لێی دڵنیا نەبووم، دەمزانی کە ئەگەر بێت و بزانێ دەنگێکی واخۆشم هەیە ئۆقرەی لێ هەڵدەگرتم و هەموو ئەورووپا و ئێرەو ئەوێی دەگێڕام، و هەر بۆ ئەوەش بەرِك و گیرفان و چنگی خۆی پڕکا، زۆر بێ بەزەییانە هێز و توانا و وزەی لە بەر دەبڕیم، بەڵێ خۆ ئەگەر خۆشیشم ویستبایە هیچ قوربانی و خۆبەختکردنێك نەدەما لە پێناویا نەیدەم."

"بەڵێ هەمیشە. بەلام نە من و نەدایکم نەماندەزانی وا لە رادە بەدەرە و تێپەڕاندووە."

"تۆ گوتت، ئەفسونگەرە جادووەکە گوتی تۆ پیاوێکت خۆشدەوێ کە دەبیە هۆی بەسەر هێنانی بەلایەکی گەورە بۆی؟"

"بەڵێ، ئەوەشیان وابوو."

لێرەدا سەر لە نوێ دە ئامێزێم گرتەوە و گوتم:

"ئایا ژیان و بەختەوەری مە بە کۆتا نەهاتووە،عیشقی مە تەواو نەبووە؟ من نەدەبوو ئەو داستانە بۆتۆ بگێڕمەوە، لە تەواوی ئەو ماوەیەیدا کەمن و تۆ پێکەوە بووین، من ئەم رازو نهێنیەم پاراست، بەڵام ئێستا کە دەزانم هەموو شتێك تەواو، ئەو نهێنیە تاڵەم بۆ گێڕایتەوە و پێمگوتی و تۆش هەرگیز ناتوانی لە بیر خۆتی بەریەوە."

نەمدەزانی چ بڵێم، دە نێوانی عیشق و پەشێمانی و ترسدا پەلەقاژەم بوو. ئەو خۆی لەباوەشم کردەوە ولە لایەکیەوە راوەستاو بە دەنگێکی کزەڵەوە و بە دوولێوی نیگەران و لەرزۆکەوە گوتی:

"خۆشەویستەکەم، ئازیزە بێ وێنەکەی خۆم، ئابڕووی ژن میحرابی ژیانیەتی، هیچ پیاوێك بۆی نیە پیسی کا، هیچ پیاوێك بۆی نیە گیانی ژنێك تاریك کات، کە وایکرد،ئەو پیاوە شایانی ژیان نیە. تۆ فەرمان بەمن دەکەیت کە بۆت ئەمەکدار وبەوەفابم، هەرواشدەبم، تەنانەت ئەگەر تۆش نەیەیتەوە لام، تەنانەت ئەگەر لە سەر ئەوەی کە بۆشم گێڕایەوە تۆ بێزم لێ بکەیتەوە ولێشم بێزار بیت، تا ئەوکاتەی



زیندووم هەر بە ئەمەك و وەفادار دەبم بۆت، و هەرکاتێ پیاوێکیش دەستێکم بۆ بێنێ بە بێ سڵەمینەوە ئەویش دەکوژم، لە تۆ بەولاوە تازە هیچ پیاوێکی دی دە دنیایەدا نیە بۆ من."

من بێ جووڵە مامەوە و هیچم نەگوت. قۆڵی بە نیشانەی بەزەییەکەوە بەرزکردەوە و گوتی:

"خۆشەویستەکەم، توو ئەو عیشقەی لە نێوانماندا بووە، لەبەر خاتری خۆشی و بەختەوەرییەکی ئەو ژوورەی هەردووکمانی تێدا هاوبەش بووین لەبەر خاتری ئەو بەختەوەریەی کەوتە دڵی هەردووکمانەوە، و بەخاتری ئەو پاشەرۆژ و ئایندەیەی کە رەنگە لە پێشمان بێت و چاوەڕێمان بکا، لەبەر هەموو ئەو ئارەزوو، و هەڵە و بیر و ئەندێشە و گوناهانەمان ببوورە و ئەگەر هەر تەنیا بۆ دەقیقێکیش بێ جاریکی دیکەت خۆش بووێمەوە."

ئەقڵ پێی گوتم." ئەوە ئارتێستە، بێگانەیە، باوەڕی پێ مەکە، دەستی لێ مەدەو لێی دوورکەوەوە.."

دڵ دەیگوت: "ئەوە ماویسە، عیشقە، ژیان و بەختەوەرییە.." دوای لە جێی خۆڕاپەڕینێم دەئامێزێم وەرێنایەوە و ئەویش وەك چرۆیەکی ناسك، نەرموشلك هاتە باوەشێمەوە، بە سەر و قژی ئالۆز و پەرش و بلاو و دوچاوی نووقاوەوە.

بە دەم ئاهونالەوە نوقمی ماچانم کرد و ئەویش بێ بەرگری پێشوازی هەڵچوونەکانمی کرد. چاوە نووقاوەکانی وەك لافاوێیان فرمێسك پێدا هاتنە خوارێ و لێوەکانم تامی ئەو فرمێسکە سوێرانەیان کرد. هەردوای ساتەوەختێك ئومێد و عیشق و حەزو ئارەزوو و بەختەوەرییەکانی من هەمووی تێپەڕین. خۆی لە باوەشێ کێشامەوە و بە دووچاوی پڕ بلێسە و رەنگی پەڕیوەوە لە دەرکێ چووە دەرێ و دەتاریکە شەوێدا ونبوو.

من وەك شێتان بەدوایدا هاوارم کرد:

"ماویس! ماویس!"

بەڵام ئەو ڕۆیشت و لە سوێریە فرمێسکەکانی زیاتر بە لێوەکانمەوە شوێنەوارێکی نەما. دڵم بە ئازارێکی بێ وچانەوە لێیدەدا. دەرگاکەم کردەوە و سەرلەنوێ هاوارم کردەوە:

"ماویس! ماویس!"

بەڵام بێدەنگی هەموو جێییەکی داگرتبوو و تەنیا دەنگی پێیە بچکۆلانە وسووکەڵەکەی وی دەهات، کە هەڵدەهات و لە من دوور دەکەوتەوە.

## ٣٣

گەڕامەوە ناو ژووره سارد و چۆڵ و هۆڵەکە، لەسەر مۆبایلەکە تخێڵ بووم، سەرم بەقۆڵم کرد و بە کوڵ و بەخەستی گریام. فرمێسکەکانم تێکەڵی ئەو فرمێسکانە بوون کە ماویس بەسەر دەموچاویدا باراندبووم. ئەو ڕۆیشت و دڵی منیشی بەو داستانە هەموو شەقار شەقار کرد، بە تایبەتی ئەو بەشەی کوشتنێ برناردی خۆشی لە کەللەیدا نەهێشتم و نەمدەتوانی باوەڕ کەم کە ماویسی خۆشەویست و ئازیز، بەو هەموو پاکی و بێگەردی، و شیرینی و سادە و ساکاری وخۆڕاگری و جوانیەیەوە، کارێکی وا بکات.

لێرەدا بیرم کردەوە کە ماویس بۆیەی دەست بۆ ئەو تاوانە بردووە چونکە بەرنارد ویستوویەتی بۆ پارە پەیدا کردنێ بە کاری بێنێ. ئەو تەنانەت لەوەش ترساوە کە بەرنارد بزانێ دەنگیشی خۆشە نەکا بیقۆزێتەوە. دێرەدا بەیەك دنیا ئاخ و داخەوە ڕووبەڕووی نوختێکی بوومەوە کە خۆشم هەر بەرامبەر هەمان تۆمەت بوومەتەوە. بەڵام هەر خۆم خۆمم دادگایی کرد و دە دڵی خۆمدا گەڕام، و لە بەر خۆمەوە گوتم. ئایا من، منێك کە ئەوم خۆشدەوێ و پێیەوە بەندم، داخوا بوونی وی و هونەری ویم بەکار نەهێناوە؟ نەمتوانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە وخۆمی لێ دەراوێم بەڵام لەوە دڵنیا بووم کە هێندەم ماویس خۆشدەوێ کە تەنانەت ئێستاکێ کە لەو نهێنیە ترسناك و ئەو تاوانەی ویش ئاگادار بوومەتەوە، ئامادە بووم کە خزمەتکار و



کۆیلەشی بم، ئامادە بووم لەبەر خاتری وی هەر بۆقازانجی وی خۆم دە ئاوری باوێم. ڕاستە کە دەمویست (ئەگەر خوابی یکردبایە) بیهێنم، بەڵام ئامادەش بووم هەروا بە کولەمەرگێ دەگەڵێدا بژیم و تا ماوم لەبەر خاتری وی هەدا نەدەم و هەرکارێ بکەم. تەنیا حەز و ئارەزووی من ئەوە بوو کە ئەو ناو دەرکات و سەربڵندانە دە دنیایەدا بدرەوشێتەوە و دەرکەوێ و کەس لەو بەخششی دەنگەی خۆی بێبەش نەکا، و ئەوەی منیش دەمویست تەنیا و تەنیا عیشقە سادە و پاك و بێ ئارایشتەکەی ئەو بوو و هیچیدی.

من وا دە دنیای غەمێدا ڕۆچووبووم ئاگام لە تێپەڕینی دەم و وەختان بڕابوو کاتێ کە بەخۆ هاتمەوە شەو بەنیوە ببوو و هەڵاتنی من لە ئینگلتەرەی بەو شەوەی هەرگیز نەدەکرا. هاتمەوە ئیدی نەمتوانی بچمەوە ماڵێ و ئەیوا و گریسی ببینم. بەڵاو بەدبەختیەکم لەبەر دەمی خۆمدا دەدیت. دەو دەمەیدا هەرچی هێز و توانا و وزە هەیە دەلەشمدا نەمابوو. توانای جووڵەم نەبوو، تەواوی شەوێ دەو ژووره سارد و چۆڵ و هۆڵەیدا کەوتم. دوایيەکەی کەوتمە دنیای بێ ئاگاییەوە ولە دەست ئەو هەموو خەیاڵ و بیرو لێکدانەوانەی ڕزگار کردم.

دەگەڵ کەڕی بەیانیدا هەستام وبڕیارم دا کە پیاوانە قەردی خۆم بەرامبەر ئەو تاوانەی بەرامبەر یاسام کردبوو، بدەمەوە.. بڕیارم دا کە خۆم لە سزا نەدزمەوە و ئەوەی یاسا بۆمی دەبڕێتەوە پێی ملکەچ بم. هاتمە سەر ئەوەش کە خۆم لە عیشق ناگزوور کەم و لێگەڕێم با ماویس بۆخۆی بڕوا.

## ٣٤

کاتێ کە هەوا بەتەواوی ڕووناك بوو و خەڵکی کەوتنەوە جموجووڵ لە ماڵێ وەدەرکەوتم. دوای قاوەڵتی چوومە یەکێك لە بانکەکان و ئەو پەنجا لیرەیەی کە هەموو سامانەکەم بوو بە ناوێکی خوازراوەوە بەوێم سپارد و بەو چەند شلینگەی پێم مابوو بەرەو چارەنووس کەوتمە ڕێ. هەموو ئەو کارانەم وەکو کەسێکی

نووستووی به دەم ڕێوە ئەنجام دان و هەوڵیشم دا بە نزیك ماڵەكەی ئارتیستۆدا نەچم. حەزم لێبوو بچمە وێستگەی شەمەندەفەر و چاوم لە ماویسی بێ كە دەڕوا بەڵام زۆرم لە خۆم كرد و نەچووم.

من بچوكترین كارێكی خۆمم بە چاوی ڕەخنەوە سەیر دەكرد. لە ڕاستیدا خۆم لە خۆم نامۆ بووم و زۆر بەوردی وریای ڕەفتار و كرداری خۆم بووم. هەر ئەوەش بوو كە نەیهێشت خۆم بكوژم و یا وەكو شێتان وەدوای ماویسی كەوم. حەزم لێبوو بچمەوە ئەو كەنیسە بچكۆلانەیەی كە دەگەڵ ماویسیدا چووبووین، ولە لای قەشەی ددان بە هەموو شتێكیدا بنێم و هەمووی بڵێم. چەند جارێكانم واهاتە سەرێ بچمە شارەبانی و خۆم تەسلیم بكەم. بەڵام ئەوەشم هەر نەكرد. چونكە ئەگەر هەروا بۆخۆم چووبامایە ئەوە دەبوو هەرچی هەیە و نیە هەمووی بەبەڵگەوە بێنمەوە و بیڵێم. بۆیە تەواوی ئەو حەزو ئارەزووانەم هەموو دە دڵی خۆمدا كوشتن و ژیانێكی بێ مەبەست و بێ ئامانجانەم گرتە پێش.

نەجێیەكم هەبوو رووی تێكەم، نە كارێك هەبوو بیكەم.

هەموو كارەكانم تەنیا بیر كردنەوە لە ماویس بوو. كە بۆ تەنیا ساتەوەختێكیش لێم جودا نە دەبۆوە. نە ئەو ماویسەی كە سەر بەو داستانە ترسناكە بوو. بەڵكە ماویسی ئازیز و خۆشەویست. ئەو كیژۆڵە جوان و لە بار و میهرەبانەی بەختەوەری كردم و هەر بۆ ویش ڕۆژم بەم ڕۆژە گەیی.

## ٣٥

تا سێ ڕۆژان هەواڵێك نەبوو. ڕۆژنامەكانم بە وردی دەخوێندنەوە. هەروەك مەزەندەشم كردبوو ڕۆژی دووشەممە دەركەوت كە پارەكە دیار نیە و ونبوونی منیش سەلماندی كە هیچ هەڵەیەك رووی نەداوە و من پارەكەم دزیوە و بە دوامدا چووبوونە ماڵێ ( دێرەدا حاڵی ئەیوا و تووڕە بوونەكەیم بەرجەستە كردن.) بەڵام كەس نەیدەزانی لە كوێم. قەد و باڵا و سەروسەكوت و دەموچاویان بە تەواوەتی بڵاو



كردبوونەوە. هەرچی شەمدەفەر هەیە پشكنیبوویانن. منیش بە بێ ئەوەی هەر خۆشم شلوێ كەم سەرم بە هەموو جێیەكیدا دەكرد و دەچوومە هەموو شوێنێكی، شەوی سێ شەممە چوومە لای ئەو نانەوایەی ماویس نانی لێدەكڕی و هەر لەناو ئەو جێیەش نووستم كە ماویسی تێدا دەنووست.

بەكابرای نانەوا و ژنە نەمساوییەكەیم گوت كە دوكانێكی پاك و خاوێنیان هەبوو، كە من كارم نووسەرییە و بۆ خوێندنەوێ هاتوومەتە ئەم ناوە. ئەوانیش بە ڕوویەكی خۆش و میهرەبانیەوە وەریان گرتم وپێشوازییان لێكردم.

ئەو ژوورەی دایانە من تاكە ژوورێك بوو كە بەكرێیان دەدا. كاتێكی كە لەسەر جێیەكەی ڕاكشام و سەرم بەو بالیفەی كرد كە ماویس سەری پێكردبوو، بیرو خەیاڵی ویم هاتنەوە یاد و وەك یەكێكی تازە(تا) بەریدابێ و فێنكایەتیەكی بەلەشیدا بێت، ئاوا تەواوی ئەو ڕەنج و نارەحەتیانەی ئەو دوو ڕۆژانەم لە لەشی دەرچوو و هەستم بە ئارامییەكی تابڵێی ئاسوودە كرد و لەشم سووك بوو.

ئەو شەوە تێر نووستم، و بەیانییەكەی بە گیانێكی خۆشترەوە هەستام و كە خۆشم دەئاوێنەیدا بە كراسی چڵكن و ریشی هاتوو و پێڵاوی بۆیاغ نەكراو و جلوبەرگی تۆزاوییەوە دیت سەرم سوڕما و حەپەسام. قاوەڵتیم خوارد، و دووبارە، بەبێ ئامانج كەوتمەوە كۆڵانان ڕۆژنامەیەكم كڕی، و ئەو پارەیەی پێم مابوو بە وردیم ژمارد. دە دڵی خۆمدا گوتم"هیوادارم پۆلیس هەرچی زووترە كارەكەی خۆی ئەنجام بدا" دە ڕۆژنامەكەدا نووسرابوو كە هێشتا شوێنەوارێكم دیارنیە. ژنەكەم برووسكەی بۆ برایەكانم لێدابوو. بەخەیاڵی ئەوەی ڕەنگە چووبمە وێ. دیارە ئەوەشیان هیچ، و دیاریش بوو كە ئەیوا دەربارەی سەردانەكەی ئەم دواییەی منی هیچ بە پۆلیس نەگوتبوو و تا ئەندازەیەكیش نەیویستبوو لەوە زیاتر هیچیدی بڵێ. هەر بۆ ئەوەی تێوە نەگلێ و بەرپرسیاریەتێكی بە ملدا نەیە و لە هەمووكێشەكان دوورە پەرێز بێ. برایەكانم وەبیر هاتنەوە و ئەوەم هێنایەوە بەرچاوی خۆم كە جۆرج چۆن نیگەران بووە لەوەی كە نەكا ئەو كێشەیە زیان بە كۆمپانیا و ئایندەی كچەكانی بگەیەنێ. لە بەر

چاویشیەتی کە مارك و جۆرج ئەوە تا ئەنجوومەنێکیان پێکهێناوە تا بزانن چ بکەن و چ نەکەن و دوای هەموو شتێکیش بڕیاری یەکجارەکی دەدەن به هیچ جۆرێك هەنگاو نەنێن خۆیانی لێ بخەپێنن. بۆیە پەیوەندییەکەی من بە ریزیۆیەوە هەروا بە نهێنی مایەوە و سەرەنجامیش پۆلیس نازانێ کە من ئەو پارەیەم بۆ چ بووە و چیم لێکردووە، و ناوی ماویسی پێوە پیس و لەکەدار نابێ. ئەو بیر وخەیالانە هێندێکیان ئاسوودە کردمەوە و بۆ یەکەمین جاری دوای ئەو کێشەیە بەتین وتوان و وزە و خۆشییەکی بێ وێنەو گەردەنێکی کێلەوە دەستم بە هەنگاو نانێ کرد.هەر دەو دەمەیدا بوو کە دەستی یاسام گەییە شانی و مەئموورێکی پێ ڕاگەیاندنێ ئاگاداری کردمەوە کە دەگەلێدا بچم.

## ٣٦

ئەوە بوو بەسەر هاتی داستانەکەی من، ڕووداوەکانی دادگاییەکەمت حەتمەن دە ڕۆژنامەیدا خوێندۆتەوە و منت بە گێل لە قەلەم داوە و لە بیر خۆتت بردومەوە. هیچم دەربارەی ڕۆژانی زیندانێ نیە بینووسم( لە بەر ئەوەی کە ئەم بەشەیان هەر تەنیا پەیوەندی بە خۆمەوەیە و باس) باسی وردەکاریەکان و چۆنا و چۆن پۆلیس توانی بمدۆزێتەوە، و پاشان نائومێدی ئەوکاتەی من کە دەرگا ئاسنەکەی زیندانێ بەودەنگە ڕەقە ناخۆشەیەوە کە بەسەر مندا داخرا، شتێکن ناگوترێن و باس ناکرێن.

ئەو ماوەیەی کە من دەزیندانێمدا بۆ ڕۆژی دادگایی کردنێ بەسەر دەبرد، کەسم نەهاتە سەردانێ. تەنیا قەشە و پزیشکی زیندانێ بوون دەهاتنە لام و سەریان لێدەدام: ئەیوا سەری لێنەدام و چ پەیامێکیشی نەنارد. من زۆر چاکم دەزانی کە من تازە بەلای ئەوەوە هەروەك نەبم و نەبووبم وایە. ئەو بە بێ دادگاییکردن منی تاوانبار کردبوو.

برایەکانیشم وشەیەکیان هەر بۆ نەنووسیم. تەنانەت مارکیش کە هەر نەبوایە خۆ دەبوو ویژدانی کەمیك نارەحەت بایە، ئەویش هەر هیچی نەنووسی. دەنێو ئاشنا و



ڕۆشنایانیشدا کەسێك سۆراغێکی نەکردم و لێی نەپێچامەوە، تەنانەت تۆ و یۆیانیش، تۆش کە یەکێکی کە من دەمهەوێ هاوارت تێبەستم و دەستی داوایەت بەرەو لا درێژکەم، تۆش یادێکت هەر لێ نەکردمەوە.

بێدەنگی من لە ڕۆژی دادگایەدا تا بلێی دادوەرەکانی تووڕە کرد، و ئەگەر سەدەیەکی دیکە بایە، بە خراپترین شێوەیان ئازار و شکەنجە دەدام. ئەمە جگە لەوەی کە سەختترین شکەنجەش نەیدەتوانی قسەیەکم پێ بکات.

چۆن دەکرا من قسەیەك بکەم و لە گەورەیی و شکۆی وی کەم کاتەوە؟ من دە بەرابەر ئەوانەدا بە بڕیارێکی پتەوەوە ڕاوەستام و بە گوێی خۆم بیستم کە هەرچی ئابڕوو و شکۆمەندی مەیە هەموویان خستە زەلکاوە و پامالیان کرد، بەلام بڕۆم تێك نەنا. ئەوان ڕۆژانی پڕشنگدار و درەوشاوەی سەردەمی جەنگیان هێنابۆوە ئارا. وای خودایە!

کەسانێکی وەك من گیان دەخەنە سەر لەپی دەستیان، دەسەنگەرێدا و لە ناو نێلەی ئاگری شەڕێدا خەبات دەکەن و قوربانی دەدەن. تا ئەم دەستەیە و سەدانی وەك ئەمانە کە چارەنووسی ئێمەو مانانیان بەدەستە، بتوانن بە مێشکێکی ئاسوودە، و پارێزراو، پال دەنەوە و لەسەر کورسی پلەو پایە و مەقامەکانیان دانیشن. ئەوانە سوکایەتیان پێکردین و گالتەیان پێ هاتین و دواییش فەرمانی سێ سال زیندانیان بۆ بڕینەوە. سێ سال! و بۆماوەی سێ سالان من ماویسم دەئیختیار ریزیۆی نا، و بۆ خۆشم کەوتمە سووچی زنیدانێ. من هێشتا ڕوخسارە فرمێسکاوییەکەی ماویسم هەر لەبەر چاوە.گوێم لە دەنگیەتی کە دەلێ:

"ناموسی ژن میحرابی ژیانیەتی، هەر کەسێکی سووکایەتی پێبکا شایانی مەرگ و مردنە."

## ٣٧

من دە تەواوی سەردەمی ڕۆژانی زیندانێدا نهێنییەکەی خۆمم پاراست و نەمدرکاند، سەرۆکی زیندان و پزیشك زۆر جارانم دەهاتنە سەردانێ، بە

رووخۆشییەکی تەواوەوە دەربارەی کێشەکەی من دەدوان. بەڵام من چاکم دەزانی کە ئەوانە راسپێردراون تا لە بن پەردەی دۆستایەتییەوە پەی بە راز و نهێنییەکانی من بەرن و بزانن کە من ئەو پارەیەم بۆ هەڵگرتووە. بەڵام من بە ورییاییەوە تەنانەت وشەیەکم لێ هەڵنەوەری.

یاسا و رێسای توند و بەند و کارە یەك بابەتییەکانی زیندانێ لە لایەکەوە و وردەکاری و وریاییە دکتۆریش لە لایەکی دییەوە نەیانهێشت هەڵخەڵەتێم و یا هەر جارێکیش بێ ئاگا بم و هۆشم بەلای خۆمەوە نەمێنێ.

باوکی گیانی ـ قەشە ـ زۆر جارانم دەهاتە سەردانێ و بەسەعات پێکەوە دادەنیشتین و قسەمان دەکرد بە قسەکانی ویم هەست بە ئارامییەکی پڕ تام و چێژو خۆش دەکرد دەخۆمدا. ساڵێکی تەواو بەسەر زیندانییەکەمدا تێپەڕیبوو کە من بە فەرمی لە ئاینزای کاسۆلیکان هاتمە دەرێ. ئەوجا داستانی خۆمم وەك ددان پێدانانێك و پاکانەیەك بۆ گێڕایەوە و هەموویم پێگوت.

بەڵام هەرگیز ناوی ماویس نەهێنرا، یانی لە کاتی پێویستدا بە ناوی "ئەو ژنە"م ئاماژە پێدەکرد.

دوایەش بڕیارم دا کە دوای بەرهەڵدا بوونێم لە زیندانێ، داستانەکەی خۆم بێ کەم و زیاد و بێ لابردنی بچووکترین نوختە، بە چاك و خراپەوە بنووسم و دەستمایەیەکی پێ پەیدا کەم.

زۆر بە جەختەوە کار بکەم و دەگەڵ گرانی و خۆگوشین و دژوارییەکانیشدا هەڵکەم و خۆمیان لەبەر ڕاگرم، تا هەر نەبێ هێندێك لە گوناهەکانی خۆم بسڕمەوە و بە چاکە قەرەبوویان بکەمەوە. تا بەڵکە ئێ وردە وردەش بتوانم ئەو پارەیەی دزیبووم بیدەمەوە، تا بەو جۆرە لە ژێر باری ئەو گوناهوسزای دواییەیان رزگارم بێ و بێمە دەرێ."



# ٣٨

بەشی کۆتایی نووسینەکانی داڵتۆنی کەمێك ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵ بوو.وەك بڵێی دەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و تەقەللایەی خۆشیدا دوو دڵ و بەگومان بووبێ،بەڵام ئەوەی راستی بوو و من بە تەواوی دەمتوانی هەستی پێبکەم، ئەوە بوو کە عیشقەکەی بەرامبەر بە ماویس وەك هەمان ئەو رۆژانەی هەوەڵێ، و رۆژانێکی کە بە بەرو باوەشی وییەوە بوو، هەر بە زیندوویی و وەکو خۆی ماوەتەوە.

لەو جێیەی کە نووسیبووی، دەیهەوێ ژیانێکی ئاسوودەو ئارامانە دروست کات، بێ ئیختیار پێکەنیم، بلێسەیەك زمانە بکێشێ و ئاواش سوتێنەر بێ، هەروا بە ئاسانی نامرێتەوە و لە ناوناچێ.

لەوانەیە دامرکێ، بەڵام هەرگیز ناکوژێتەوە، هەر بۆیەش کاتێ کە نووسینەکانی وی تەواو بوون دە دڵی خۆمدا گوتم" داستانی رۆجەر داڵتۆنی لێرەدا تەواو نابێ."

خوێندنەوەی ئەو بەسەرهاتە کارێکی زۆری تێکردم.

بە بێ ئارامیەوە چاوەڕێی دیداری رۆجەر داڵتۆنی بووم، دەگەڵ ئەوەشدا کە دەستی نووسینێم هەیە بەڵام هەمیشە لایەنگری بێدەنگی و ئارام، و زیاتریش حەزم لە گۆشەو کونجی ژوورەکەی خۆمە تا دەگاتە دنیای پڕ هات و هاوار و جەنجاڵی مۆسیقا. بەڵام ئەو رۆژە شتێکم بە خەیاڵداهات، هەموو کەسێك ریزیۆی وەك بەرنارد یا ڤالانتینۆی دەناسێ. من دە رۆژنامەی بەیانیی ئەو رۆژەدا، دە ستوونی مۆسیقادا، کە نەمدەزانی ریزیۆ لە ئیگلتەرەیە یانە نا، بە دوای ناوەکەیدا گەڕام سەیر ئەوە بوو کە دیتم نووسراوە "سنیۆر ریزیۆ شەوی شەممە بۆ یەکەمین جار شاگردەکەی مادام ژانسی لە هۆڵی شاژندا دەناسێنێ و یەکەمین کۆنسێرتی ناوبراو پێشکەش دەکرێ."

بیرم کردەوە بێگومان رۆجەر لەو کۆنسێرتەی ئامادە هەر دەبێ، و ناتوانێ خۆی راگرێت و نەیەت. ئایا دوای ئەو هەموو ماوەیە ئەو چاوپێکەوتنە چ کارێکی تێدەکا؟ کە بەقسەی داڵتۆنی ئەو دەنگە لە رادەبەدەر خۆشەی هەیە. دیارە کارێکی زۆر

دەکاتە سەر گوێگران. ئەدی دەبێ چ لەو دالّتۆنە عاشقە دلّسووتاوەی بکا کە مالّی خۆی خرا کرد و خۆی بۆ کردە قوربانی؟

## ٣٩

من لەبەر وەی کە ماویس کۆترل یەکەمین کونسێرتی خۆی دەگێڕێ و دەیبینم لە خۆشییان وەهەلەکەسەما هاتبووم. ئەو رۆژە دوای نیوەڕۆ چاوم بە یەکێك لە هاوڕێییانی یانەکە کەوت کە بەرێکەوت رەخنەگری مۆسیقا بوو و دەبوو دید و بۆچوونەکانی ئەو شەوەی خۆی بۆ رۆژنامە بنێرێ. ئەوگوتی:

"مادام ژانسی جوانێکی لە ئەندازە بەدەر جوانە و ئادەمیزادی کە للەیی دەکا. ئەلّبەتە دەربارەی دەنگ و ئاوازەکەی هیچی وا نازانم، لەوە زیاتر کە شاگردێکی بەردەستی ریزیۆیە بۆیە هەر دەبێ ئامادەگی و توانایەکی باشی تێدابێ و هەبێ."

"منیش هەروام بیستووە. دەلّێن ئەو هەرگیز جاری لە شاگردێکی زیاتر فێر ناکا."

"هەرواشە. من مادام ژانسیم، شەش مانگ پێش ئێستا لە شەو دانیشتنێکی دەگەلّ رزیۆیدا دیت. وەك بلّێی ریزیۆ خۆی بەو جۆرە شاگردەیەوە بادا. تۆ قەتت ریزیۆ دیوە؟"

"نەء!"

هاوڕێیەکەم شانی هەلّتەکاندن:

"مەبەستت ئەوەیە کە.."

"نا هیچ نیە. ئیدی ئەو هونەرمەندە. یان واباشترە بلّێم بلیمەتە. بەلاّم ناشتوانم بلّێم بێ عەیبە. بەلاّم تۆ بۆ وا بە گەرمییەوە لە ریزیۆی دەپرسی؟ خۆ تۆ هیچ سەر و کارێکت دەگەلّ مۆسیقایدا نیە."

"بەلّێ، نیعمەتێکم لە دەست چووە و دەمهەوێ قەرەبووی کەمەوە، هەر بۆیەش سبەی شەوێ لە هۆلّی شاژنێم."

هاوڕێکەم بە خەیالّەوە گوتی:



"مادام ژانسی هێندە جوانە کە ئیدی پێویست ناکات ئادەمیزاد سەرو ساختی دەگەلّ مۆسیقایدا بێ تا چێژ لەو کۆنسێرتەی بکا."

حەزم لێبوو بمتوانیبایە دالّتۆنی ببینمەوە و پێکەوە بچینە ئەو کۆنسێرتە و هەرکاتێ داستانەکەیم دێنایەوە بەر چاوی خۆم، باش دەمزانی کە مێشکی وی لە ژێر مشتەکۆلّەی عیشق، و زیندان و تەنانەت کێشە ئاینزاییەکاندا وردوخاش بووە. پێموابوو رەنگە ئاریشەیەکی تازە و تۆفانێکی دیشی لە دیتنێ ماویسیدا بۆ پەیدا ببێ. ئیدی زۆر پەست بوو لە تاو دالّتۆنی و تا دەهات زیاترم حەز دەکرد دەگەلّی بامایەو پێکەوە باین. کات زۆر بەکاوەخۆ دەڕۆیی و منیش بۆ چونە کۆنسێرتەکە لەسەر ئاو و ئاگران بووم. تا دوایە دە وەختدا چوومە هۆلّێوە.

ئەوانە کە ریزیۆیان دەناسی، بە بێ ئارامیەوە چاوەڕێی ئەوە بوون بزانن ئەمجارە چ ئەستێرەیەکی پەروەردە کردووە و پێگەیاندووە و بەخەلّکی پێشاندەدا. دەیانگوت ئەو مادام ژانسییە هێشتا لە بەردەمی هیچ خەلّکێکدا، تەنانەت لە پاریس و بڕۆکسل و ڤییەناشدا گۆرانی نەگوتووە."

من زۆر بە وردیەوە دەناو خەلّکیدا بە دوای دالّتۆندا گەڕام، بەلاّم قولاّغێکی نەبوو."

دوایەش رووم لە شانۆیەکە کرد. سەرشانۆیەکە نوقمی گولّ بوو، پیانۆیەکی رازاوەشیان لە گۆشەیەکەوە دانابوو. بەرنامەکەم خوێندەوە. سنیۆر ریزیۆ جارێك و مادام ژانسی سێ جاریان دەوشەوەیدا دەگوت. من ئەوەندەی کە حەزم دەکرد ماویسی ببینم هێندەم گوێ نەدەدایە گۆرانییەکانی. من دەمهەویست ئەو ژنەی ببینم کە شێتانە دالّتۆنی خۆشدەویست."

هۆلّەکە پڕی حەشیمەت بوو و منیش وەکولّ هاتبووم، چونکە پێموابوو هەلّچوون و کەفوکولّێکی تایبەتی بەسەر تەماشاچییەکاندا زالّە بۆیە منیش لەوان بەدەر نەبووم، و زۆر بەوردیم دەقیقەژمێری دەکرد و چاوەڕێ بووم.

تا ئەوجار چاوەڕوانی بەسەر چوو و ئۆرکێستر دەستی بە ژەنین و مۆسیقا لێدانێ کرد و خەلّکەکە بە جۆش و خرۆشەوە کەوتنە چەپلّە لێدانێ. تادەهات تاسەی

خەڵکەکە زیاتر دەبوو، دەو دەمیدا، لاوێك كە شاگردێكی پێشووی ریزیۆ بوو هاتە سەر شانۆ و هەڵیدایە گۆرانی و جا جگە لە دەنگی خۆش ئەو رەفتار و هەڵسوكەوتە بێ وێنەیەی هەیبوو، بەڕاستی شایانی شاگردیە ریزیۆی بوو. ئەوجا ریزیۆی بێ وێنە هات و هەمووانی سەرسامی ئاوازە ئەفسووناوییەکەی خۆی کرد. لە بەراورددا دەگەڵ شاگردەکەی وەك بڵێسەو ترووسكەیەك بوون. كە گۆرانییەکان تەواو بوون خەڵكەکە شێتانە چەپڵەیان لێدا و هاواریان كرد" ریزیۆ.. ریزیۆ..."ریزیۆش لە خۆشی و پێشوازی و ستایشی خەڵکەکە زۆر کەیف خۆش دیار بوو و هەر پێدەکەنی.

دوایەش نۆرەی ماویس ـ عیشقی داڵتۆن، مادام ژانسی هات، لەلایەكی شانۆكەوە پەردەیەكی مەخمەری رەنگ تێر كە زۆر جوان و رازاوە بوو شۆڕ ببۆوە. پەردە لادرا و ریزیۆ بەخۆو بە شاگردەوە هاتنە سەر شانۆ.

ژنێكی بەلەباریكەی ناسكم دیت كە جلێكی سپی زێوی دەبەر و خەرمانێكی قژی زەردی زێڕن كە بەگوڵی سوور رازابۆوە بەسەرەوە بوو، حاڵەتێكی تایبەتی ئەوتۆی بەروخسارو هەڵسوكەتیەوە دیار بوو كە زیاتر بە گوێ پێنەدان دەچوو تا بە شەرم و شەرمێونی.

هەموو شتێكی پێ هیچ بوو. ریزیۆ زۆر شادوشەنگوڵ و لوت بەرز دیار بوو و بەو هەموو بەژن و باڵاو پەیكەرە زل و سوورفلیەیەوە، بەتەك ئەو هەموو جوانی و ناسكی ورەنگە پەرییەی ماویسەوە جووتێكی سەیروسەمەرە دەهاتنە بەرچاو. بەڵام كاتێكی كە بە دووربینێم سەیركرد، رەنگ پەرینەكەی لە ماندوویەتی و بێ تاقەتی و تووورەبییەوە نیە. بەڵكە تەڕ وبڕی و گەشانەوەی لێ دەتكایەوە.

سەرە پەنجە ناسكو بۆیە كراوەكانی خستبووە سەر دەستە زبر و رەنگ تێرەكانی ریزیۆی و بەسێپایی و وقار و بە گەردەنێكی كێل و رۆینێكی نەرم و سەنگینەوە تا ناوەڕاستی شانۆیەكە هات. دەستی لە دەستی ریزیۆی بەردا و بۆ پێشەوەی راداشتن و سەری نەوازشی لە بەرامبەر وەڵامی ئەو هەست و نەست و چەپڵە ریزانەی خەڵكەكەدا نەوی كرد.



ئۆركێستر دەستی بە مۆسیقا ژەنینێ كرد و دەگەڵ ئاوازی فلوتیشدا دەنگی وی بەرزبۆوە.

من ناتوانم ئاوازی گوتنێ وی تاوتۆی كەم. دەنگی وی دەگەڵ مۆسیقایدا باڵ دەگرت و دەفڕی و من كە بەوردیم سەرنج لێدەدا دەمدیت كە بە بێ خۆماندووكردن وخۆجیڕ كردنەوە و خۆزەحمەتدان بەرز و نزمی وكورت و درێژی نۆتەی ئازارەكانی لە سینەیەوە بەئاسانی بەگەروویدا دەهاتنە دەرێ. خۆ ئەگەر جووڵەی دەم و گەرووی نەبانایە واتدەزانی هەر پەیكەرێكە وهیچی دیكە چونكە تەنانەت چمكێكی چرچ و لۆچی كراسەكەشی نەدەجووڵایەوە، بەڕاستی شتێكی لە ئەندازە بەدەربوو.

من كە سەرم لە مۆسیقا دەرناچێ، دڵێم بە راستی ئەفسووناوی بوو، لە رادەبەدەربوو..

كاتێكی كە مۆسیقاكە تەواو بوو. پیاوەكەی لەبەر دەمی من دانیشتبوو لەبەر خۆیەوە بەسپایی گوتی:

"چەند ناسك و لەبەر دڵانە."

من تەماشایەكی ویم كردو دووبارە گەڕامەوە لای ماویس و سەیرم كرد لە بەرامبەر هەست و كەف و كوڵی گەرمی خەڵكەكەوە سەری دانەواند و بێ جووڵە وەستا. دێرەدا ئۆركێسترا نەوایەكی وەك مارشی دەستپێكرد و چاوم لێبوو كە ماویس سەری بەرەو دواوە برد و چاوەكانی بریسكەیاندا و رەنگی سوور هەڵگەرا و لەو گەروەی كە پێش تاوێك ئاوازێكی نەرم و ئارام هێنی لێوە دەهاتەدەرێ، ئێستا ئاوازێكی پڕشۆڕی وای لێوە هەڵدەستێ ترپەی دڵ و هاتوچۆی خوێنی ناو دەمارەكان وەجۆش دێنێ. هەردە و ساتەیدا مەزەندەم كرد كە ئەوە هەمان ئاوازی"سروودی پێش شەڕە" كە داڵتۆنی بیچارە و بێدەرەتان كرد و ئێستاش بەو هەموو جوانیەوە، ئەو ئاوازە ئەوەتا تاك تاكی ژن و پیاوی ناو هۆڵەكە دەگەڵ خۆیدا بۆ گۆڕەپانی شەڕێ دەباتەوە. دووبارە دوای ئەو هەموو هات و هاوارە كەفوكوڵ و هەڵچوونە بێدەنگی زاڵبۆوە، گوێم لێبوو كە ئەوەی تەنیشتمەوە دەیگوت:

"ژنێکی وا دەتوانێ لاوەکانی میللەتێك بەرەو جەنگ بنێرێ."

بێدەنگیەکی قوولّ کە بایەخی خەڵکەکەی پێشاندەدا بە ئاهەنگەکە باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا. سەر لە نوێ ئۆرکێسترا دەستی پێکردەوە و ئەمجارەیان نەوایەکی ئاشقانەی دەستپێکرد.

من دەگەڵ ئەو هەموو نەشارەزاییەی خۆشمدا هێز و تواناو ناسکی ئەو دەنگە ئەفسووناوییە قووڵە و کاریگەرییە ئاوازەکەیم هەست دەکرد. دەمهەویست بگریم. دیمەنی شاعیرانەو خەیاڵاویم لەبەرچاوی بەرجەستە ببوون.من کە دەگەڵ ژنانمدا ئەزمونێك و دە بەرامبەر ئەو توخمە ناسکەیدا وشك و بێ گیان بووم، ئامادە بووم خۆمی باوێمە بەر پێیان. ئەوەی دڵ بیویستیبایە و حەزی لێبیایە دەویدا کۆببۆوە و هەبوو.

ریزیۆ جارێکی دیش لەو دیو پەردەکەوە دەرکەوتەوە و بەو هەموو قەد و قەوارەو پەیکەرە زلەیەوە لەبەر دەمی شاگردەکەی خۆی چەمیەوە و ماویسیش وەڵامی ئەو هەموو ئەدەب و رێزەی وی دایەوە.

خەڵکەکە نەیاندەویست هەر وا زوو وازبێنن. هەموو لە کەوفوکوڵان هەستا بوونە سەر پێ و هاواریان دەکرد. ماویس بەردەوام سوپاسی خەڵکەکەی دکرد. یەکێکیش بەردەوام ویەك بەدوای یەکدا چەپکە گوڵ و تاجە گوڵینەی لەسەر شانۆیەکە دادەنا. دەو دەمەیدا بوو کە من دالتۆنم دیت. لە پێش منەوە، لە نزیك شانۆیەکەوە وەستابوو. چاوم لێبوو بە باڵایەکی بەرز و قژێکی ماشو برنجی خۆڵەمێشیەوە تاجە گوڵینەیەکی گوڵی سووری لەسەر تەختی شانۆیەکە و لە بەر پێی ماویس دانا. نازانم دەنێو ئەو هەموو حەشیمەتەدا ماویس ئەوی دیت یانە نا، بەڵام سەیرەکە لەوەدایە کە لە ناو هەموو ئەو گوڵانەدا ئا ئەوەیانی هەڵگرت و بە باەشیەوە نا، ئەوە من هەر چاوێکم لەوەوەیە، سەیرم کرد زۆر بە تاسەو تاسووقەوە چاوێکی بە ناو خەڵکەکەدا گێڕا. وەك بیەوێ خاوەنی ئەوەیان بدۆزێتەوە.



## ٤٠

ئەو شەوە مادام ژانسی هیچیدیکەی نەگوتەوە. پاشماوەی بەرنامەکە تایبەت بوو بە شاگردەکانی پێشووی ریزیۆوە. کاتێ خەڵکەکە لە جێیەکانی خۆیان دانیشتنەوە، من سەیری لای دالتۆنم کردەوە، کەچی ئەو لەوێ نەمابوو. من بێ ئیختیار لە جێی خۆمەوە هەستام و چاوم بە یەکە یەکەی خەڵکەکەدا خشاند، بەڵام بێهودە بوو، رۆیشتبوو.

چووبووە کوێ؟ ئایا بۆ دیدەنیە خاتو ژانسی کەوتبووە رێ و هەموو بڕیار و بەرنامەکانی خۆی بە لاوە نابوو؟ من ئەوەم چاك دەزانی هەر بڕیارێکی یەکێك لە زیندانێدا بۆقەرەبووی گوناهەکانی بیدا، دەهەوای ئازادیی ژیاندا، هێندەی گوێ ناداتێ و بایەخێکی وای نابێ. چ جای ئەوەی کە دالتۆن ببووە کاسۆلیکیش، خۆ ئەگەر رێشی لەبەردەمدا خۆشبایە، مادامەکی ژنەکەی خۆی زندوو بوو، هەر نەیدەتوانی چاوی دە ماویسەوە بێت و بەتەمای بێ ئایا ئەو هەروەك بەڵێنی دابوو بۆلای من دەهات، یا دیتنێ مادام ژانسی هەموو شتێکی لە بیر بردبۆوە؟ بەڵام هەر بەراستیش دالتۆن لەوانە نەبوو کە بێت و خۆی بەسەر ئەو ژنەدا بڕێ. دەگەڵ ئەوەشدا کە ماویس ژنێکی جوان و هونەرمەند بوو. لە کاتێکدا دالتۆن چاوی لەو بەرسەرهاتەی دوایی پۆشیبوو کە ئەوی پێ تاوانبار کرا. ئەو کەسێکی سادەو ساکار بوو. ئایا هیچ پیاوێك ئەوەی دەکا دەست بۆ دزیە بەرێ، هەر لەبەر ئەوەش تا دڵبەرەکەی خۆی پێ بگەیەنێ؟ لێرەدا بیروباوەڕم شل بۆوە. ماویس کەسێکی ساکار نەبوو، مرۆڤێکی دەگمەن بوو، کە دەکەسێکیدا کۆببۆوە، و بەراستیش دیارییەکەی دالتۆنیش دیارییەکی هەروا کەم نەبوو بە کۆمەڵگا.

رۆژی دوایی، هاتمە سەر ئەوەی بزانم خەڵکی دەربارەی مادام ژانسی چ دەڵێن. رۆژنامەکان هەموو ستایشیان کردبوو، دە جێیەکیدا نووسرابوو کە ریزیۆ شەیدای مادام ژانسییە. مادام هێندەی کارتێکردووە و هێندەی دەسەڵات بەسەریدا دەشکێ بە ئارەزووی خۆی هەڵیدەسووڕێنێ و بۆ هەر جێیەکی بوێ دەیبا. یەکی دی نووسیبووی:

"مادام گوێی لە ستایشی ریزیۆ و هیچ کەسێکی دیش نیە، و هەمیشە گیانی "دەستم لێمەدە" دەپارێزێ، ئەویش بە جۆرێك ئەو خۆ پارێزیەی دەکا کە کەم کەس دەوێرێ شەیدایی و ئەوین و دڵداریە خۆی بۆ دەربڕێ.

جارێکیان بە ئاشکرا سووکایەتی بە شازادێکی دەکات کە ویستوویەتی دە باوەشی گرێ، و یەکی دیکەش ئاوا خۆ هەڵدەخرێنێ و تینێ وەبەر خۆ دەنێت و راست دەباوەشێ خۆی دەگرێ، هەر سەعاتێك دواتر، بە دەست نەناسێکی وا تێلا تڕێن دەکەن تا دەمی مەرگ، ئەگەر کەسێك بیەوێ ئابڕوو و نامووسی خۆی بپارێزێ، نابێ داوای خۆشەویستی و پەیوەندییە ئەوین و دڵدارییە لە مادام ژانسی بکا."

یەکێك لە یانەکە دەیگوت:

"ئەو، لەو ژنانەیە کە ئەگەر پیاوێك سووکایەتییەی پێ بکات بێ دوو دڵی دەیکوژێ، من زۆرم حەز (ئەڵبەتە هەر لە دوورەوە) لەو جۆرە ژنانەیە. بۆ نموونە ئەگەر لە شەودانیشتنێکی جەفەنگێکی بە دڵی نەبێ، لەوانەیە لەبەر دەمی هەمووان، هەر بە باوەشێنەکەی دەستی دەمی پیاوی بشکێنێ. ئەو دەمی چ لە ژنێکی دەکەی؟ دەبێ ئەو سووکایەتییەی قووتدەیەوە و گێلانە پێبکەنی."

من گوتم:

"ئەگەر نموونەی وی زۆرتر دەبوون." (راوەستام تا ئەو قسەکەی تەواو دەکات.)

"ئەگەر نموونەی وی زۆر بانایە بەهای خوو و رەوشتی ژنان زۆر هەڵدەکشا و بەرزتر دەبۆوە و توانای وان چەند بەرابەر دەبوو. ئێستا باری خوو و ڕەوشتی کۆمەڵگای پێشکەوتووی مە یەکجار زۆر تێکچووە. ئەمەش بۆ هەر میللەتێکی نیشانەی خراپییەیە، و من حەز دەکەم و هیواداریشم نموونەی وەك مادام ژانسی زۆر بن."

گوتم:

"کێ دەڵێ کە مادامیش سەربردەیەکی عیشق و دڵداری خۆی نیە؟ ئەو بێوەژنە، وەنا؟ مێردەکەی کێ بووە؟"



"کەسێکی ئینگلیزی، مادام نۆزدە ساڵان، بووە کە مێردەکەی مردووە، دوای ویش هەنگاوی بەرەو دنیای هونەرەوە ناوە."

"رەنگە ئەوی زۆر خۆشویستبێ کە دەو تەمەنەیدا مێردی کردووە و ئێستاش هەروا رێز لە یاد و بیرەوەرییەکانی دەگرێ."

"ڕەنگە!"

"ئەگەر ئێستا یارێکی هەبایە هەمووو دەیانزانی. ئەوە شتێك نەبوو بشاردرێتەوە. هەر یەکەو شتێکی دەگوت و باوەڕیشیان نەبوو ژنێك بەو هەموو جوانی و شۆخییەوە یارێکی نەبێ. پرسیم:

"ئەگەر ژنێك لەسەر نامووسێ پیاوێکی بکوژێ دەڵێی چی؟"

"دەڵێم زۆر بە نامووس و گەورە و بەڕێزە. بەڵام لەم سەردەمانەدا یەکێکی وا پەیدا نابێ تا قەڵەمەکانمانی بە دوادا رادەین. بەڵام سەردەمی زوو ئەگەر یەکێکی وا پەیدا بایە، ئەوا کتێب و شیعرو شانامەیان لەسەر دادەنان و دەنووسین و دەیانکردە نموونە و سەرمەشقی نەوەی ئایندە و هەر لەسەر زمانان بوو.

ئەفسوس کە من کەسێکی وا دەناسم و داستان و بەسەرهاتیشی دەزانم، بەڵام من لە کوێ و نووسینی حاڵ و باڵ و بەسەرهاتی وی لە کوێ..؟ من چۆن دەتوانم هەقی خۆی بدەمێ.

## ٤١

ئاخریەکەی یەکەشەمە هات و سەعاتی دیتنێ داڵتۆنی نزیك بۆوە. من نە تەنیا هەر چاوەڕوانی وی بووم ببینم و گوێ لەداستانەکەی بگرم بەڵکە دەمهەویست دوای ئەوەی باس و خواس و حاڵ و باڵەکەشیم خوێندبۆوە زۆر بە وردی پێیدا بچمەوە و موتاڵای کەمەوە.

جاری پێشوو ئەو بە دوودڵی و دڵەڕاوکێوە هاتبۆوە ماڵێ من، و منیش ئەوم وەك دزێکی تازە بەرهەڵدا لە زیندانێ سەیر دەکرد. بەڵام ئێستا.. ئەو وەك پاڵەوانی

داستانێك دەهاتەوە لای من کە داستانەکەی کەموکورت و ناتەواو بوو و دەبوو پێشهات و ڕووداوەکانی بەکۆتا بگەیەنم و تەواوی کەم. زۆرم حەز دەکرد بزانم ئەو ڕووداوە چ دەبێ.

جگە لە هەموو ئەمانەش هەندێ شتی زۆر و سەرنج ڕاکێشیش هەبوون کە حەزم لێبوو لە سەریان بڕۆین و دەربارەیان بدوێین.

لەبەر پەنجەرەی ڕاوەستابووم چاوەڕێم دەکرد. سەرقاڵی تەماشاکردنی گوڵەکانی نێو باغی بووم.

لەپڕ دیتم هاتە نێو باغی.

خزمەتکارەکە هەواڵی دا:

" ئاغا داڵتۆن تەشریفیان هێناوە."

"وەپێشی کەوە و ڕێی پێشاندە."

جارێکی دیش قەد و باڵا بەرزەکەی و مووە ماش و برنجە خۆڵەمێشیەکەی داڵتۆنی دەنێوان دەرکێدا وەدەرکەوتەوە. وەك شمشێرێکی تازە ساوی مشتومالکراوی بریسکەدارم هاتە بەرچاوان کە دەکالانێدا ون بووبێ.

"وەرە ژووری، ڕۆجەر."

هاتە ژووری و چاوێکی بەسەرتاپایدا خشاندم. دەیویست بزانێ خوێندنەوەی داستانەکە چ کارێکی تێکردووم. من نەمدەتوانی ڕاستەوخۆ سەیری چاوەکانی بکەم و چاوی دەچاوی بڕم. سەیرکردنی کەسێکی کە بێ پەردە و ڕووت و قووت گیانی خۆی پێشاندات کارێکی هەروائاسان و سادە و ساکار نیە.

بە ئاوازێکی نارەحەتەوە پرسی:

"چۆن بوو."

"هیچ...نووسینەکەتم خوێندەوە."

"و منت وەك شتێکی گێل و وێل یا لەوەش خراپتر هاتە بەرچاوان، وەنا."

"هەرگیز. بە پێچەوانەوە، باسی حاڵ و گوزەرانی تۆ کارێکی زۆریان تێکردم."



"چ جۆرە کارێگەریەك، بیروڕات چیە؟"

"ڕۆجەر بەلای منەوە تۆ پاڵەوانێکی زۆر سەرفیراز و گەورەی."

"پاڵەوان، هەر بەڕاستی بیرو باوەڕت وایە؟"

"بەڵێ، بە تەواوەتی."

"تا بڵێی خۆشحاڵم. ئەگەر داستانەکە پەسەند کەی، دەیکڕی؟"

"دەربارەی ئەمەش دەمهەوێ قسەت دەگەڵ بکەم، بەڵام تۆ بۆ دانانیشی و نانی ئێوارێم دەگەڵدا بخۆی، خۆ نانت نەخواردووە؟"

"نانخواردن؟ نا؟ من هەر کاتێك برسی بم شتێکی دەخۆم."

دەیویست بڵێ" نان خواردنی ئێواران بەلای وییەوە بەشێکە لە خۆ بادانێ."

"من زۆرم قسە هەن، دوای نانخواردنێ دەیانکەم."

"زۆر چاکە."

زەنگم لێدا و ڕامسپارد نانەکەی زووتر بێنن. لەلای خزمەتکارەکە ناچار بووین قسان دەربارەی ئێرەو ئەوێ بکەین، و ئەوە تاسەی منی بۆ قسان دووسەد هێندەی دی لێکرد بوو. دەکاتی نانخواردنێدا داڵتۆن بێدەنگ بوو. ئەڵبەتە وەڵامی پرسیارەکانمی زۆر بە ڕووخۆشی و بە پێکەنینەوە دەدانەوە. بەڵام خەیاڵی لە جێیەکی دیکە بوو.

هەر کە نانەکە تەواو بوو لەبەر سۆباکە دانیشتین و شووشە شەرابمان بە تەك خۆمانەوە دانان. من سەری قسانم کردەوە و گوتم:

ڕۆجەر، هەروەك گوتم نووسینەکانتم خوێندەوە، بەڵام نازانم حەزت لێیە چیان لێبکەم؟"

"چیان لێبکەی؟ من چووزانم، بۆ بەکەڵکی چاپکردنێ نایەن؟"

"ئاخر بە زیندوەتیە ئێوە ـ تائێوە بمێنن ـ من ناتوانم سوود لەو کتێبە ببینم."

"بەڵام ئەگەر ناوەکان بگۆڕی؟"

ئەو جا کەمێك وەستا و گوتی:

"ئەوەی کە دەبێ من لە ئینگلتەرەی بڕۆم جێی گومان و هیچ دوودڵییەکی نییە، ئیدی مانەوەی من لێرە مەحاڵە، و تەنیا شتێکیش کە دەتوانم و هەمە بیفرۆشم ئەم داستانەیە و بەس. ئایا هیچ ناکا."

"دڵنیام ڕۆژێك دێ دەبێتە سەرمایە و سامانێکی یەکجار زۆر گەورە."

"باشتر! ڕۆژێك ئەو سەرمایە دەبێتە ئی تۆ. بەڵام من ئێستا هەر تەنیا سەد لیرەم لە تۆ دەوێ."

" من سەد لیرەکەت بە قەرد یا لە سەر حیسابێ دەدەمێ بەڵام سەد لیرەت بەسە؟"

"زیادیشە. من نامەوێ بە هاتوباتەوە سەفەرکەم. هەر بای هێندێ بتوانم کلە ئینگلتەرەی دەرچم و کارێکێ ببینمەوە."

"دەتەوێ بچیە کوێ؟"

"دەچمە موستەعمەرێکی، چ جیاوازییەکی وای نییە، من لەشساغ و بەهێز وتوانام و دەمهەوێ تا ئەوپەڕی سوود لەو لەش و توانایە وەرگرم و ئیش بکەم. ئەوەت لەبیر نەچێ کە من سێ ساڵ زیندانی قورس و گیان پڕووکێنم ڕاکێشاوە و بەسەربردووە."

"حەیف، باشە ڕۆجەر بۆ وات کرد؟"

"چیم کرد؟ کاری گران، جا دەکرێ نەیکەی. ئادەمیزاد ناچارە."

"نا مەبەستم ئەمەیان نەبوو، بۆ پارەت دزی؟ بۆ هەر ئەو دەمی نەهاتیە لای من؟"

"بیرم لە چەند کەسێکان کردەوە و دەنێوەواندا ئەتۆش، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لە تۆم ڕانەدیت هەزار لیرەم بدەیەی، منجریە جۆرج و گێلەتیە مارك و کەم وەختی، وایان لە من کرد و بەزاندمیان. بەر لە هەموانیش کەم وەختی منی بێدەرەتان کرد. ئەگەر ریزیۆ هێندێکی دیکەی مۆڵەت دابام بەڕێیەکی ڕەواترمدا جێبەجێ دەکرد. دوای ئەو هەموو قسانەش، ئێستاش هەر پێموایە چونکە بۆ مەبەستێکی بەرز و پیرۆز بووە، هەرکارێکی چاکم کردووە و هەقیشم بووە بیکەم."



"کارێکمان بەسەر ئەم لایەیانەوە نیە، من توێژەرەوە نیم، هەر چۆنێك بێ تۆ کارێکت کردووە کە دە دڵی مندا جێگیر بووی و من بە دۆستایەتیەت سەربەرزم و ئیرەییشت پێ دەبەم."

دووبارە پێکەنیەوە و گوتی:

"لەو سۆز وخۆشە ویستیەت مەمنونم. هەموو شتێك تەواو بووە، وەك کتێبێکی تەواو کراو و بەستراو بێ. چاو خشاندنەوەش بە ڕابردوودا لای من هیچ نیە."

هەستێکی سەیر و ناخۆش ئازاری دەدام، مەگەر لەسەر و چاویم چ دەخوێندەوە؟ هەر ڕەنج و بەدبەختی و ئێش و ئازار و دەربەدەری. ئەو دەیویست بچێتە هەندەران، بەرەو ژیانێکی پاك، سادە و بێ غەل وغەش. هەروا بە دەم لاق ڕاکێشانێیەوە لەبەر سۆبەکە، تەماشایەکی سەرتاپایم کردەوە و دیتم بەڕاستی ئەو پەیکەرەی وی هیچ کەموکوڕییەکی نیە. بۆخۆشی دەیزانی، و چێژی لەم بابەتە وەردەگرت، دەیزانی کە لەو سەرزەمینە تازەیەدا، کارو چالاکی و ژیانێکی نوێ چاوەڕێیەتی، دەگەڵ ئەوەشدا، دوێ شەوێ کاتێ کە ماویسی دیت، ئەو تاجە گوڵینەیەی کە ئی یاد و بیرەوەرییەکانی خۆشەویستی بوو، چوو لە بەر پێی دانا.

دەنگی وی بیرو خەیاڵی منی بڕی:

"هەموو شتەکان بە کامی دڵی من ڕەخسان، من دوێ شەوێ لەکۆنسێرتەکە بووم، ئەگەر ئەو سەرنەکەوتبایە هەستم دەکرد بە هەڵەچووم و تەواوی هەوڵ و تەقەللایەکەم بە فیڕۆ چووە. بەڵام خۆشبەختانە کۆنسێرتەکەی وی شاکار بوو و ئەم سەرکەوتنەش هەموو شتەکان قەرەبوو دەکاتەوە."

"منیش لەوێ بووم."

"بەڕاست، تۆ ئەوەت دیت؟ پێت چۆنە؟"

"ئەو دەق ئەوەیە کە تۆ لە نووسینەکانتدا هێناوتە."

"نا،نا، ئەو چەندین فرسەخ بەولاوەترەوە چووە کە من باسم کردووە، و ئەو زۆر لەوە زیاتر و پێشکەوتووترە کە من نووسیومە. ئەو تاجی سەرکەوتن و سەربەرزیەی

نایە سەر هەرچی قوربانییەکانە و سەرەنجامیش شتێك لەو سەربەرزییە بەر منیش هەر دەکەوێ."

"حەز ناکەی جارێکی دیشی ببینیەوە؟"

"نەء"

هەوا تاریك ببوو و بڵێسەی ئاگری سۆبەکەش دامردبۆوە. دەمویست داڵتۆنی چاك ببینم.

دەمهەویست بزانم لەبەرامبەر قسەکانی مندا چ دەکا. بۆیە گوتم:

"من دوێ شەوێ تۆم دیت، کە تاجە گوڵینەکەت لەسەر شانۆیەکە دانا، ئەویش چاکی زانی دیارییەکە ئی کێیە و چاوەکانی بە نێو حەشیمەتەکەدا گێڕا.

"بەراست؟ بەڵام من دەستبەجێ لە هۆڵەکە چوومە دەرێ تا نەمبینێ."

"منیش تۆم هەر لێ ونبوو."

هەمدیس بێدەنگی زاڵبۆوە، هەستمدەکرد کە داڵتۆن بە شێوەیەکی توندو ناسروشتیانە پشووی سوار بووە و تێکچووە، هەمدیس گوتم:

"هەندێ قسەم دەربارەی مادام ژانسی بیستن."

"وای! چ قسەیەك؟"

منیش ئەوەی لە هاوڕێیان و لە یانەکەم بیستبوون هەموویم بۆگێڕایەوە.

زەردەیەکی هاتێ و دەحاڵێکدا کە هێواش هێواشی بە دەستی لە دەسکی کورسییەکەی دەدا گوتی:

"هەرگیز پەی بە کەسایەتی ماویسی نابەن؟"

"ئاگات لێیەتی زۆر حەز دەکا بچیەوە لای؟ هەموو ئەو بانگەشەو کۆشش و سەرکەوتنانەی لەبەر خاتری تۆن."

بەنارەحەتیەوە لەسەر کورسییەکەی سووڕاو گوتی:

"بۆ قسەی هەڵلەق و مەڵلەق دەکەی."

"ئایا ئەو دەزانێ تۆ دەو سێ ساڵەیدا لە کوێ بووی؟"



"هیوادارم کە نەزانێ."

"ئەگەر بزانێ زیاتریشت لێ مەمنون دەبێ."

"مەمنون؟ ئەو جۆرە قسانەمان دە نێوانێدا نین، دە دۆستایەتیەدا ئەو قسانە نامێنن."

"بەڵام ئەگەر بزانێ ئەوندەی دیشی زیاتر خۆشدەوێی."

"ئەو قسانە مەکە، تازە من ناچمەوە لای وی."

"بۆ؟"

"لەبەر وەی ( رەنگە باوەڕیش نەکەی) بەڵام من زۆرم باوەڕ بە ئەدەب و بە ئابڕوو و نامووسە، ئیدی من لە کونجێکدا ژنێکم هەیە و ئامادەش نیم ناوی ماویس بزڕێنم. ماویسی ناسکۆڵە، پاکترین بوونەوەری دنیایەیە. من هەر جارێکم قوربانی بۆ داوە، بۆیە دەتوانم هەرکاتێ پێویست بێ دووبارە ئەوکارە بکەمەوە. سەرەڕای ئەوەش ماویس کێیە و من کێم؟ ئێستاش ئیدی هیچ شتێکی هاوبەشمان دە نێوانێدا نیە، من ئەگەر ئەوم خۆشبوێ دەبێ لێی دووربم."

دوایە داڵتۆن چەمیەوە وسەرنجەکانی تێبڕیم و گوتی:"ئەو بێ وێنەیە، لەو ڕۆژەوەی دنیاش دنیایە یەکێکی دیکەی وەك وی لە دایك نەبووە و نەهاتۆتە دنیایە، بەڵام پیاوێك پیاوێکی بەشەرافەت هەرگیز قوربانییەکانی دەگەڵ ژناندا بەش ناکا."

من کە لە قسەکانی وی زۆر نیگەران بووم گوتم:

"باشە رۆجەر ئەگەر ئەو تۆی خۆشبوێ ئەوا ئەویش بە بێ تۆ بوونەوەرێکی ناتەواوە."

"دیسانەوە هەرنابێ، دەزانم کە تۆ حەزت لێیە داستانەکە بەکۆتاییەکی سەرنج راکێش دوایی پێ بێنی، بەڵام بەداخەوە کە من ناتوانم بەگوێرەی حەزی تۆ بکەم."

چەند ساتێك بێدەنگی بوو و ئەوجا من پرسیم:

"کەی بەتەمای بڕۆی؟"

"ئەو پەڕەکەی تاهەفتەیەکی دی، من ئیدی لێرەم کارێك نەماوە، لەوەی زیاتر کەشوێنێکی دەکەشتییەکیدا پەیدا کەم و ئەوەشم بەلاوەچاکترە کە بۆخەرجی ڕێیە دەوێدا ئیشێ بکەم... ئیش... چاکترین دەرمانی دەردانە."

"ئایا جارێکی دیت دەبینمەوە؟"

"بۆ پێویستە؟ خۆ ئێمە جارێکی دیکە لەم باسە نادوێینەوە، وانیە؟ بەلای منەوە کات بە فیڕۆدان ئەنجامێکی نیە. چونکە من بڕیاری خۆمم داوە. سەرەڕای ئەوەش من پارەیەکی خەرج و مانەوێم نیە."

لە پڕ بە گەرمیەکەوە لێی زیاد کرد:

"ئەرێ بەڕاست، بابەتێك هەیە دەبێ بەتۆی هەر بڵێم، باسی ماویس و ئەو پیاوە بێ شەرەفە، کۆترل. بە تۆم گوت کە ئێستا دە چ خانووێکی دام و ژنانی وێ چۆن دێن و دەچن. هەرکاتێ کە دەیانبینم دڵم تێکەڵ دێ و هەزار و یەك بیرو خەیاڵی ترسناکم بەمێشکدا دێت. کاتێکی کەوەبیریشم دێتەوە کە ئەو پیاوە دەیویست ژیانی ماویسی نەهێڵێ، سوپاسی خودای دەکەم و هەقی دەدەمێ کە بوونەوەرێکی چەپەڵی وای لە نێو بردووە. هەر بۆیەشە بەمێشکێکی تەواو ئاسوودەوە دەتوانم بە جێی بێڵم و بڕۆم. چونکە دەزانم کە هیچ کەسێك نیە دەدنیایەدا دەستێکی بۆ درێژکا."

"نابێ پێشبینیەش بکەی، ئەوە ماویس مێردی بەکەسێکی کرد."

"ئەگەر ئەو کەسێکی دیکەی ئاواهێندەی من خۆشویست، مەرجە هەر خۆشی تێنەگەیەنم، هەروەك گوتیشم من دەچمە ئەوپەڕی دنیایە و هەر لەوێش دەمێنمەوە."

"باشە، چۆن حەز دەکەی با وابێ، من هەقم بەسەرەوە نیە. من سەد لیرە بەقەرد دەدەمە تۆ و ئیدی هەقم نیە."

"زۆر سوپاس دۆستی ئازیز."



## ٤٢

پارەکەی دا، دەستی خوداحافیزی گوشیم ولە دەرکێ چووە دەرێ. من لە پەنجەرێوە لەبەر ڕووناکاییە گڵۆپەکانی کۆڵانێمرا چاو لێبوو کە دوور دەکەوتەوە. ئەستێرەکان گرشەگرشیان بوو و بۆنی گوڵە ئاقاقیایەکانیش دەهات. کاتێ کە لە بەرچاوم ونبوو، هەروا لە خۆوە گوتم:" ڕۆجەر پیاوێکی گەورەیە" ئەو لە هەموو کەس و لە هەمووشتێك دابڕاوە وبەرەو ژیانێکەوە دەچێ کە بۆ خۆی بەرجەستەی کردووەو لە بەر چاوی گرتووە و دەچێ و هێندەش بە چاوێکی شاعیرانە و هەستێکی ناسکەوە تێدەڕوانێ کە هێندەی پێوە ماندوو نابێت و ئازاری پێوە ناچێژێ.

مانگێك دوای ڕۆینێ ڕۆجەری بەسەرهاتێکی وا رووی دا لە بیر نەچێتەوە، مادام ژانسی بۆگێڕانی کۆنسێرتێکی چووبووە پاریس و دەشیانگوت بۆجەژنی پاك هەر لە فەرەنسای دەمێنێتەوە و دوای ئەوە بۆ ماوەیەکی کەم دێتەوە لەندەن و ئەوجا بۆ خولە کۆنسێرتێکی لە تەواوی ئەورووپایە دەگەڕێ.

من زۆر بە پەرۆشەوە ئەوەی کە دەربارەی وییان دە ڕۆژنامانەدا دەنووسی دەخوێندەوە. وێنەی یەکجار زۆر جوانیان لێوە چاپ دەکرد. دەشیانگوت کۆنسێرتی دووەمی لەندەنی یەکجار بەرز دەبێ و بە ئامادەبییە خانەوادەی سەڵتەنەتی دەگێڕدرێ و دەکرێ.

هەروەها بابەتێکی دیکەش کە زۆر جێی سەرنج و تێڕامانێ بوو دەربارەی ژیانی تایبەتی وی بوو نووسیبویان. مادام ژانسی، یانی هەمان ئەو ژنە دەست لێنەدراوە، هاورێییەکی گرتووە! من نەمتوانی هەواڵێکی ڕاست و بە متمانە وەدەست بێنم. لێرە و لەوێ، هەروا بە سرتە و ورتە و بە ماناوە ئەوندەم لێ هەڵکڕاند کە ریزیۆ، ئەو هاوڕێەی مادامی ناناسێ، و سوێندیشی خواردووە هەر کاتێ بیبینێ دەستبەجێ و هەر لەوێ بیکوژێ.

و ئەوەی منیش لەلای خۆمەوەم تاوتوێ و سەروبەر کرد ئەوەبوو کە مادام ژانسی دوای کۆنسێرتی ئەو شەوە و هەڵگرتنەوەی تاجە گوڵەکە ماوەیەکی زۆری

دەچاوەڕوانیە دیتنێدا بەسەر بردووە و کاتێ لێی نائومێد و هیوابڕاو بووە، تووڕە بووە و بە پێچەوانەی حەزی خۆیەوە لە ڕکان دەگەڵ یەکێکی دیکەی گرێداوە.

من ئاگام لە رۆجەر نەما و پێموابوو کە لە ئینگلتەرەی رۆیوە، بەڵام نەمدەزانی بە چ کەشتییەك و رووشی لە چ دیار و نەدیارێکی کردووە.

رۆژێکیان بەرەبەری عەسرێ زەنگی تەلەفۆن لێیدا و ئەفسەرێکی پۆلیس پرسیاری لێکردم کە داخوا رۆجەر داڵتۆنی دەناسم یانە نا؟

من بە پارێزەوە وەڵامم دایەوە،. کەمێك." و زۆر بەسەیرەوە دیتم کە قسەکەرەکە داوام لێدەکا هەر چۆنێك بێ تا نەخۆشخانەی سەن جۆرج بچم. بەشڵەژاوییەوە پرسیم:

"چبووە، چ قەوماوە؟"

"رۆجەر داڵتۆن لە وێستگەی ڤیکتۆریا، وەبن شەمەندەفەرێ کەوتووە و مردووە."

بیستنی ئەم هەواڵە بەتەواوی گێژی کردم و زۆر بەزەحمەت توانیم بپرسم چۆن دەزانێ ئەو کەسە رۆجەر داڵتۆنە؟ دەوەڵامدا گوتی:

هەندێ نامەی دە بەرکیدا بووە کە بەناوی ئێوە و بە واژۆ- ئیمزای رۆجەر داڵتۆنەوەیە."

دەتوانن مەزەندە بکەن کە من چۆناو چۆنم خۆ گەیاندۆتە نەخۆشخانەی. شتە وردیلەکانی ئەو رۆژەم بەراست و رەوانی لە بیر نەماوە. دەیانگوت دەستبەجێ کوژراوە، بەڵام لەشی پارچەپارچە نەبوو. لەمنیان پرسی:

"تۆ خوالێخۆشبووت چاك دەناسی؟"

"تەنیا مانگێك لەمەو بەر بوو بۆخوداحافیزیە هاتە لای من، دەیویست بەرەو موستەعمەرات بچێ"

دوایەش منیان بردە سەر تەرمەکە. لەسەر تەختێکیان درێژ کردبوو، چاوەکانی نووقابوون، لە دەموچاوە تاوبردوو و لاوازەکەیەوە، شتێکی تایبەتی پێوە دیار بوو، روخسارێکی ئارام و پاکی هەبوو.



ئەو نامەیەی لە بەرکی وییان دیتبۆوە، دایانە من و داوایان لێکردم بیخوێنمەوە و بزانم داخوا دەتوانم بەڵگەیەك بۆ ئەم رووداوە دڵتەزێنە بدۆزمەوە یانە نا.

نامەکەم کردەوە، مێژووی هەمان ئەو رۆژەی پێوە بوو. نووسیبووی:

"ویویان"ی ئازیز:

من بەکەشتی رانەگەیشتم، بەڵام ئەمڕۆ ئومێدەوارم کە بتوانم بەرەومەبەستی خۆمەوە بچم.چاوەڕێی هەواڵ و داستانێکی دیکە بە لەمنەوە،تۆ هاوڕێیەکی بێ وێنەی و من بچمە هەرجێیەکی تۆ لەبیرناکەم.

"رۆجەر داڵتۆن"

"دێرەدا شتێك کە پەیوەندی بەم رووداوەوە هەبێ نیە. ئەڵبەتە من دەمزانی کە داڵتۆن دەیهەویست بچێتە یەکێك لە موستەعمەرەکان ولە راستیشدا من پێموابو رۆیشتووە چونکە ئەو مانگێك لەمەوپێش کە دیتم خەیاڵی رۆیشتنی هەبوو."

"ئایا کەسێکی وای هەیە کە بۆ لێکۆڵینەوە لە دادگادا ئامادە بێت؟"

"نەخێر، لە من بەولاوە کەس نیە."

من لە دانانی دادگا نارەحەت بووم، و دە دڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە کە دەبێ زۆر وریابم چ دەڵێم، نەوەکو نەزانانە نهێنییەکی بدرکێنم ئەو نەیەوێ ئاشکرای کەم. لێرەدا کەوتەوە بیرم کەمادام ژانسی ناوی راستی رۆجەری نەدەزانی، بۆیە ئەگەر بەرێکەوتیش هەواڵی مردنیی دە رۆژنامانیشدا ببینێ نایناسێتەوە.بەڵام دەربارەی ژن وبرایەکانی نەمدەزانی چ دەبێ.

هەروەك مەزەندەم دەکرد، رۆژی دادگایی، کورتەیەکیان لێوە باسکرد کە خوالێخۆشبوو لەپێشدا فەرمانبەری کۆمپانیای بیمە بووە و لە ئەنجامی دزیەتییە هێندێك پارە زیندانی کراوە و دواییش سێ ساڵەکەی زیندانیی تەواو کردووە کە رزگاریشی بووە بڕیاری داوە لە ئینگلتەرەی بڕوا.

بۆیە پارە لە یەکێ لە هاوڕێیەکانی (یانی خودی من) بۆ سەفەرەکەی وەردەرگرێت بەڵام چونکە وەك لەیادداشتەکەیڕا دیارە بە کەشتی راناگا و دیارە بیری لە هۆیەکی

دیکە کردۆتەوە بۆ رۆیشتنیٚ کە ئەم مەسەلەیە روویداوە. لەوەندە پارەشی زیاتر هیچ شتێکی دیکەی وەك سەنەد یا کاغەزێك و لەو جۆرە شتانە دە بەرکێدا نەبووە. دیاریش نیە داخوا لەو رۆژەوەی بۆ خوداحافیزیە چووە تا ئەو ماوەیە لە کویٚ ژیاوە و هیچ بەڵگەیەکیش نیە بە خەیاڵدا بێت خۆی خۆی کوشتبێت.

دوایـیش دەسـتەی ئـنـسافی دادگا بڕیاری مـەرگی بـە رێکـەوتیان دا و دادگاییەکە تەواو بوو.

رۆژی دوای ددگاییەکە بەستەیەکی پێچراوەم لە رێی پۆستەخانەوە پێگەیی و بە سەرسامیەکی تەواوەوە دیتم خەتی سەر بەستەکە دەست وخەتی داڵتۆنە. لەیەکیٚ لە دامودەزگاکانی سەرووی رۆژهەڵاتی لەندەنەوە دوای مردنی وی پۆست کراوە و نێردراوە. دە دڵی خۆمدا گوتم ئەوە هێندە لەکیٚ دڵنیا بووە کە ئەو کارەی بۆبکا.

مەسەلەی مەرگ و دادگاییەکەی رۆجەری ئێمەی بە تەواوەتی توورە و نارەحەت کردبوو.

وەرگرتنیٚ ئەو بەستەیەی هێندەی دی غەم زیاد کردم. نەمدەتوانی هەر بیشیکەمەوە.

دواییەکەی هەر کردمەوە. دەستەیەك نووسین بە دەست و خەتی رۆجەر خۆی وکاغەزێك کە پاکنووسی ئەسپاردەنامەی وی بوو، دەوێدا بوون.

لەبەر سۆبەکە دانیشتم و دەستم بە خوێندنەویٚ کرد.

## ٤٣

من دەبیٚ جارێکی دیش هەوڵ دەم پاشماوەی حاڵ و باڵ و ژیانەکەی خۆم بنووسم، کاتێکی کە ویویان دەیگوت داستانەکەت ماویەتی و کۆتایی نەهاتووە راستیدەکرد. ئەو هەقی بوو. بەڵام کاتێکی کە ئەو قسەی کرد، من پێموابوو ساڵانێکی زۆر دەخایەنیٚ تا داستانەکە بەکۆتادێت و تەواو دەبیٚ، بەڵام وەك پێدەچوو و دیار بوو دەبایە سبەینیٚ هەموو شتێك تەواو بێت.



تا دووسبەی من دەبیٚ هەموو نووسینەکان تەواوکەم، مادام ئارینتز ئێوارەی رۆژی چوارشەممە بیخاتە پۆستەوە و پێنج شەممەش بە دەستی ویویان بگات و وەریگریٚ.

من دەتوانم مەزەندەی ئەوە بکەم کە ویویان بەبیستنی ئەم هەواڵە چەند خۆشحاڵ دەبیٚ. و بە چ نارەحەتیەکیشەوە ئەو لاپەڕانە دەخوێنێتەوە، بەڵام ئەو هەر دەیگوت ئەگەر بکریٚ ئەوانە چاپ بکرێن ئای کە بەنرخن.

ئومێدەوارم چاپ ببیٚ، ئەڵبەتە دەبیٚ ئاگاداربی ماویس نەناسریٚ. بەڵام ویویان نووسەرێکی کارامە و لێهاتووە و دەتوانیٚ کەسایەتی ماویسی وەشێریٚ، دوایین ئارەزووشم ئەوەیە کە ویویان سودێکی زۆر بەو داستانەی ببینیٚ، تا بەڵکە بتوانیٚ قەردەکەی من بداتەوە بەکۆمپانیای بیمە.

من ئەسپارەدەنامەیەکم بەو مەبەستەوە رێك خستووە.

شەوی یەك شەممەی چوار هەفتە لە مەوپێش، کاتیٚ کە من لای ویویان وەدەرکەوتم بڕیارم وابوو بەرەو موستەعمەراتان بچم و لە هەر جێیەکی بیٚ بتوانم ئیش بکەم و ژیانی خۆم دابین کەم. بەڵام دەگەڵ ئەوەشدا کە حەزم نەدەکرد ئەوە بڵێم، ئەوقسانەی کە دەگەڵ ویویانم کردبوون لە بڕیارەکەی خۆمیان سارد کردمەوە. ئەو هانی دەدام کە جارێکی دیش ماویس ببینمەوە، دەیگوت ئەگەر ئەو تۆی خۆش بویٚ ئەوە ژیانی بە بیٚ تۆ ناتەواوە. بەکورتیەکەی ویویان ئەو قسانەی کردنی من لەدڵەوە لە خوام دەویست یەکێك بیانکا.

ئەو هەوڵی دا من خاترجەم کا کە هەقی خۆمە بچمەوە لای ماویس، و خۆمی لیٚ ئاشکرا کەمەوە، و خۆ ئەگەر وانەکەم ئەوە گوناهێکی گەورەم کردووە.

رەنگە ئەو نەزانیٚ کە من تا چ ئەندازەیەك بەتاسەی دیداری خۆشەویستەکەمەوە بووم. ویویان لەو جۆەر کەسانەیە کە ناتوانیٚ وەکو من دڵداریە بکا. و خۆ ئەگەر هەڵبژاردنی خووخدەش هەریەکەو بە دەستە خۆی بیٚ، ئەوا من دووبارە جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە چۆنم هەروابم و شانازی عیشقم پیٚ ببڕێتەوە. ئەگەر چی ئێستا دەشزانم کە لای منەوە هەموو شتێك تەواو بووە و دوایی هاتووە، دەگەڵ

ئەوەشدا ئامادە نیم ژیانی خۆم بەو یا بە هەرکەسێکی دیکە بگۆڕمەوە. ئیدی ژیان قوماره، رووداو و بەسەرهاتە، مرۆڤ یا دەیباتەوە یا دەیدۆڕێنیٚ" ژیان جەنگێکە کۆتایی نایە. هەر کاتیٚ دەنگی یەکێك وردە وردە کز و بێدەنگ و خامۆش بوو دەنگێکی تازە و نورتو نوێتر و بە گوڕ و تینتر هەودا و سەرە داوەکانی داستانەکە هەڵدەکاتەوە و درێژەی پێدەدا.

گەرچی من ـ رۆجەر دالٚتۆن ـ بوونەوەرێکی کە ئەم لاپەڕانە دەنووسیٚ، بەم زووانە نامێنم. و لە یاد و بیرەوەرییەکی لاوازو کەم بەولاوە هیچی دیکەم لە دڵ و دەروونی چەند کەسانێکدا نەبیٚ هیچیدیم نامێنی، بەڵام ئەم باسو خواسانەی حاڵ وباڵی خۆم هەر دەمێننەوە، ئەو هەودایانەی کە لە دەستە ساردو بیٚ گیانەکەی منیش بەر هەڵدا دەبن، بە پەنجەی کەسانی دیکە تانوپۆیان دەچنرێنەوە.ویویان و ماویسیش پێکەوە هاوبەشی ئەوکارەی دەبن.

ئەوە پێشنیاری ویویانی بوو کە ویستی منی سارد کردەوە. کاتیٚ کە ویویانم بە جیٚ هێشت لە دلّی خۆمدا گوتم" ئایا من شێت نیم کە جارێکی دیکە دیتنەوەی وی لە خۆم حەرام دەکەم؟ ئایا هەقی ویویانی نیە کە دەڵیٚ" ئەرکی تۆ نیە کە جارێکی دیکەشی ببینیەوە؟"هاوڕیٚ، لەو دەقیقەیەوە کە گوێم لە ئاواز و دەنگی وی بوو و پەرچەکاری خەڵکەکەشم ئاوا بەرامبەر وی دیت، تێگەیشتم کە هەرچی کردوومە بەجیٚ بووە و لە جێی خۆی. و ماویسی ئەوەی دەهێنا.

دەزانن من هەرگیز ماویسم وەکو:ژنێك"سەیر نەکردووە، ئەو شتێکی زۆر لەوانە گەورتر بوو. ئەو زۆر لە کەسێکی جوان و لەش ولار ناسك ولەبەر دڵان باڵاتر بوو. ئەو تواناو لێهاتوویی بوو. لەش ولاری وی هەر تەنیاماڵی کەسێك نەبوو بەتەنیٚ، ئەو بەو گەورەیی و شکۆمەندییەوە ماڵی هەموو دنیا بوو.

دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، من ئەو و خودی ئەو و جوانیە لەش ولاری ئەوم تا سنووری توانا خوشدەویست. ئۆقرەی لیٚ بڕیبووم. بە بیٚ ئامانج و بیٚ مەبەست بە کوچەوکۆڵانەکانی لەندەندا دەخولامەوە، بەو هیوایەی هەر جارێکی دیکەی ببینمەوە



و دووقسانی دەگەڵدا بکەم، بیٚ ئارام و هەڵوەدای کردبووم. هەر تەنیا یەك دوو قسە و هیچیدی، بۆ وەی بزانم ئەو بەو وەزعەی رازییە یانەنا. تەنیا وشەیەکیش بۆ وەی بزانم داخوا جارجارێکیش منی وەبیر دێتەوە، دەنا هیچیدی.

لە دەوروبەری ئەو ئوتێلەی لێی دابەزیبوو بەسەعات دەهاتم و دەچووم و دەپەنجەرە بیٚ ئەژمارەکانیەوە رادەمام و سەیرم دەکردن. دە دڵی خۆمدا دەمگوت دەبیٚ کامەیان پەنجەرەی ژوورەکەی وی بیٚ؟"

لە پڕ ئەو شەوەی سەرەتای یەکتر ناسینمانم وەبیر هاتەوە کە بە توورەییەوە دەرگاکەم پێك دادا و بەخۆمم گوت جارێکی دی سەر بەو ماڵەیدا ناکەمەوە و لێمدا رۆیشتم، بەڵام سەعاتێکی نەبرد کە گەڕامەوە و سەیرم کرد هەموو شتێك ئامادەیەوە ئەوە چاوەڕێی هاتنەوەێمە و دەڵیٚ:" من دڵنیا بووم کە هەر دێیتەوە، چونکە سوێندت خوارد کە ئیدی نایەیتەوە."

ئێستا، جارێکی دیش دەمهەویست ئەو سۆز و سوێندو پەیمانەی خۆم بشکێنمەوە و دووبارە بچمەوە دیدەنیەی. ئایا ئەو دەیزانی کە من دەمهەویٚ بیبینمەوە؟ ئایا چاوەڕێم بوو؟ ئایا هەموو شتێکی رێك و پێك و ئامادە کردبوو؟

بەڵام من، منێکی بیٚ خانومان کە جگە لە چوار دیواری پیس وپۆخڵی کریٚ، لە بەدناوترین گەڕەکەکانی شاری، چ جێیەکی دیکەم پیٚ نەدەزانی و شارەزا نەبووم، و دۆست و ئاواڵ و ئاشنایەك لە ویویان بەولاوە نەبوو، ویویانێك کە بای دەکەوڵی کردبووم و هانی دەدام. ئەوەی مابۆوە هەر ئەو دڵە گەرموگوڕەی ناو سینەم بوو، دەنا چاوەڕێی چ بووم؟

هاتنەوەی من بۆ ئەو گەڕەکە و خولانەوە و سوڕانەوەم بە دەوروبەری ئەو ئوتێلە و سەیرکردنی پەنجەرەکانی جگە لە وەڵامی بانگەوازی دڵەخوتەیەك بەوەلاوە چیتر بوو؟ بەڵام هەموو ئەمانەش هەر بۆمەبەستێك بوون، ئەویش دیتنی ماویس بوو.

ئەو شەوە، دووسەعات دوای بە جیٚ هێشتنیٚ ویویانی، هەموو نەخشەو پلان و بڕیارەکانم پووچەڵ بوونەوە و بە فیڕۆ چوون.

چوومە ئوتێلێ و پرسیارم کرد ئاخۆ دەتوانم مادام ژانسی ببینم؟ گوتیشم پێویست ناکات ناوەکەم بڵێم، ئەو بۆخۆی دەزانێ، کێ هاتۆتە دیدەنی و سەردانێی.

دەستبەجێ وەڵام هاتەوە کە بابفەرمووێ، من بە دوای بەردەستەکەدا ملم لە ڕاڕەوەکە ناو گەیمە ژوورەکەی. منیان بردەوە ئەو ژوورەی کە چەند ساڵێك لەمەوبەر پێکەوە لەوێمان چاوەڕیی سکرتێرەکەی ریزیۆی دەکرد.

ئەو گوڵانەی شەوی کۆنسێرتەکەش پێشکەشی کرابوو، ژوورەکەی پڕ کردبوو، بەڵام هیچ شوێنەوارێکی تاجەگوڵە سوورەکەی من نەبوو.دە دڵی خۆمدا گوتم ماویس ئەوی بردۆتە ژوورە تایبەتیەکەی خۆیەوە و بەو پێش بینیەیشم دڵ زۆر خۆش بوو.

بە بێ ئارامیەوە چاوەڕێ بووم، ئەڵبەتە ئەگەر ئەو نەیویستبایە پێشوازیم بکا هەر نەشدەگەیشتمە ژووری چاوەڕوانیەش. چەند دەقیقەیەکی دیکەش چوو و بێ ئارامیە من گەیبە سنووری شێتیە. هاوارێك لە ناخەوە پێی گوتم کە هەق نیە لێرە بم، خۆهەر تەنیا دووسەعات لەمەوپێش بوو کە من لە نەخشەو بڕیار و سوێند و پەیمانەوە دەدوام و دەمگوت دیتن و نوێ کردنەوەی سۆز و پەیمان و بەڵێن دەگەڵ ماویسدا و بەستنەوەی هەر جۆرە پەیوەندیەك دەگەڵ ویدا گوناهێکی رووتە و کەچی وائێستاش چاوەڕێیم.

لە پڕ دەرکە کرایەوە و مادام ژانسی دەرکەوت، من نەمدەتوانی بڵێم ئەم بوونەوەرە ماویسە. کچە کرێکارێکی گەڕەکی ئارتستۆ ئێرە و ئەو شوێنەیان نەگوتووە، وردە وردە و بەسپاییەکەوە هێندێك هاتە پێشێ. هەڵسوکەوتی بێ کەموکورتی بوو. ریزیۆی مامۆستا بوو و دەرەنجامی مەشق و راهێنانەکانی تا بڵێی بەرز و گەیبوونە ترۆپکی کامڵیە. دەرکەکەی بە سپایی داخست و بێدەنگ و بێ هەست و چرپە بەرامبەرم راوەستا.

من بەو رەفتارەی خۆمم لێ ونبوو، من بە تەمای ئەوەی بووم کە بەڕاکە راکەوە بێت و خۆیم دە باوەشێ باوێ.

تا بڵێی جوان بوو. بەڵام ناتوانم جوانیە خاتو ژانسی گۆرانیبێژتان بۆ تاوتوێ کەم، کەچی دەتوانم چەند کتێبانتان لەسەر خۆشەویستیە و جوانیە ماویسی بۆ بنووسم. من



ئیکلامم بۆ ئەو ژنەی کێشا و چاوەڕێ وەستام و نەمزانی چۆنا وچۆن ولە کوێوە دەستپێکەم.

تا لە دوایە دەنگی وی ئەو بێدەنگیەی تێك شکاند و گوتی:

"ئاغا، ئێوە حەزتان دەکرد من ببینن؟"

نەمدەزانی چ وەڵامێکی بدەمەوە، ئەوە ماویس نەبوو، نا، نا، ئەو بە هەموو مانایەکەوە غەریبەیەك بوو، وەك بڵێی ئەویش نەیدەتوانی قسێکی بکا، بێدەنگی زاڵبۆوە و دە حاڵێکدا کە درێژاییە ژوورەکەمان نێوان بوو، چاوەڕێ راوەستام، بۆ ئەوەی بێدەنگییەکەش بشکێنم، بیرم لە زۆرشتان کردەوە کە بیانڵێم، بەڵام دەنگم دەرنەدەهات.

دواییەکەی گوتی:" ئاغا ئێوە کەسێکمان دێننەوە بیر کە ساڵانێکی بەر لە ئێستا دەمناسی"

من دە دڵی خۆمدا گوتم:" مەبەستی چیە؟ ئایا نامناسێتەوە، باشە من هێندە گۆڕاوم کە ئەو نەمناسێتەوە؟ راستە سێ ساڵ زیندان مرۆڤ دەگۆڕێ، بەڵام ویویان کە ساڵیانێکیش بوو منی نەدیتبوو کە چی دەستەجێش ناسیمیەوە." وەك بڵێی ئاگای لەسەرسامی و حەپەساوییەکەی من بێ، بۆیە گوتی:" ئەو کەسە لای من زۆر ئازیز بوو، و زۆریش دڵشاد و بەختەوەر دەبم ئەگەر جارێکی دیکە ببینمەوە."

من بە دەنگێکی کە بە گوێی خۆشم نامۆ بوو کوتم:"ئایا ئەگەر ئەوکەسەی ببینیەوە دەیناسیەوە.؟

"ئەڵبەتە"

من بە هەموو توانایەکمەوە هاتم چاوم دەچاوەکانیەوە بڕی و لە کاتێکدا کە زۆر بەکاوەخۆوە سەیری دەکردم گوتی:

"ئاغا، ئەو پیاوەی کە گوتم بەر لە سێ ساڵە رۆیوە و تەنانەت بە وشەکاغەزێك یا پەیامێك هەواڵێکی نەداومێ. تەنانەت هەر بە وشەیەك، لە کاتێکدا کە ئەو گفتی دا..."

"خانم ئەو دوێ شەوێ تۆی دیت و تاجەگوڵیی سووریشی پێشکەش کردی."

"راستە، بەڵام هەمدیس بە بێ یەك وشە چاك و چۆنی."

باشە گوڵەکان بەس نەبوون؟"

"نەء"

دووبارە بێدەنگ بوومەوە، کەمێك هاتە پێشێ و گوتی:

"ئاغا ئەو گفتی دا بە جێم نەهێڵێ و بچمە هەر جێیەکی بە دوامەوە بێ. بەڵام بۆ سێ ساڵان دەچێ بچووکترین هەواڵێکی نەدامێ. هەموو پیاوێکیش دەتوانێ گوڵ بۆمن بێنێ. ئەوە دەبێ."

"ئایا ونبوونی وی ئێوەی ناراحەت کرد؟"

تۆزێکی شانەکانی هەڵتەکاندن و هیچی نەگوت. من دووبارە گوتم:

"بەڵکە هۆیەکی پتەو و بەڵگەیەکی راست بۆ ئەو بێدەنگی و ونبوون و دیارنەمانەی هەبێت:"

"کام بەڵگە؟ خۆزگە دەمزانی چ بەڵگەیەکە. ئەو منی دە وەختێکی دژوار و سەخت و ناسکدا بە جێ هێشت، دەوەختێکیدا کە من نەمدەویست هەنگاوێ هەڵێنمەوە وکەچی ئەو وای لە من کرد گوێ نەدەمێ، و ئادەو وەختەیدا بە جێی هێشتم. ئەو گفتی دا کە ئەگەر من پێشنیارەکەی وی قبوڵ کەم، ئەویش لە هەر هەتەر، و خۆشی و ناخۆشی و دژواریە ئەو رێیەیدا هاوبەشم بێ، بەڵام لە بەروەی من لە ساتەوەختێکی زۆر ناخۆشدا باسێکم بۆ وی درکاند. ئەو بە جێی هێشتم."

ئالێرەدا ئۆقرە و ئارامم لێبڕا و یەك بەخۆم هاوار کرد:

"ماویس ئەمەیان درۆیە."

هەرگیز ئەوەم بە خەیاڵدا نەدەهات وابیر بکاتەوە ویا ئەو باسە هێندەی ئازار بدا. دەتەواوی ئەو ماوە دوور و درێژەی ساڵانی مەشق و راهێنانە سەخت و دژوارانەیدا و دەگەڵ ئەو هەموو ناخۆشیانەشیدا هەر پێیوا بووە کە درکاندنی ئەو باسە بۆتە هۆی ئەو بە جێ هێشتن و لێك دابڕانە و هەمیشە ئازاری داوە و بۆی بۆتە



مایەی ناخۆشی. تازە تێدەگەم کە بۆ، کاتی هاتنە ناو ژووری چاوەڕوانییەکە هێندە سارد و سڕ و لاڵ بوو. سەر لە نوێ بە گەرمییەکەوە گوتم:

"تۆ چاك دەزانی کە ئەمە تۆمەتێکی رووتە، درۆیە، من هەرگیز وازم لە تۆ نەهێناوە و تۆم جێ نەهێشتووە، بە سەرهات و پێشهاتەکان وایانکرد و نەیانهێشت بە دواتەوە بم و لێت دانەبڕێم. من تا ئێستا نەمتوانیوە بێمەلات."

"لەبەروەی لەوەم زیاتر نەتوانی لە دووریت خۆڕاگرم، خواش ئاگادارە هەوڵم هەر داوە بەڵام.."

"وای لەو هەوڵەی داوتە!"

"ماویس تۆهەر ئەوەندەت قبوڵ بێ بەسمە، کە دەڵێم نەمتوانیوە بێم، یانی نەمتوانیوەو باوەڕکە کە نەمتوانیوە" دەنا من بۆ ساتێکیشم تۆ لە بیر نەچۆتەوە، و تۆزقاڵێکیش نەگۆڕاوم، ئەو بوونەوەرەی کە من دەو ماڵە کۆن و دێرینەیدا ناسیم و پێکەوە دەگەڵیدا بەختەوەر بووم. تەنیا کچێکی کە دەتەواوی تەمەنمدا خۆشم ویستبێ و خۆشم بوێ و هەر خۆشیشم دەوێ و هەمیشە هەروا دەبم."

"بەڵام ئەو کچەی جاران نەماوە."

"بۆ، چۆن؟ مەگەر تۆ واحەزکەی."

بێدەنگ بووم ئایا مەبەستی ئەوە بوو کە ئیدی هەموو شتێکمان دەنێوانێدا تەواو بووە و ئیدی من هیوا و ئومێدێکم بۆ نەماوەتەوە؟ ئەو جا گوتم:

"راستیەکەی من شێت بووم کە ئەمشەو هاتمە ئێرە."

"ئەدی بۆ هاتی؟"

تا تۆ ببینم، من پێم گوتی کە لەوە زیاتر خۆم پێ ناگیرێ لە تۆوە دووربم، ناچار بووم بێم، بەسەعات دەکۆڵانێدا سووڕاومەتەوە و دە پەنجەرانم هەڵڕوانیوە و نەمزانیوە کێهەیان ئی تۆیە."

"ئەگەر بتویستبایە، دەتزانی کێهەیان ئی منە."

"خانم، من داوای لێبوردن لەو هاتنەم دەکەم، من نەدەبوو بێمەوە لای تۆ. هەر بە قسەی خۆتان من ئەوەندەتان لێ دابڕاوم بێ کەلك بووە و ئەوەندە ژیانەی ماویشە هیچی وانیە. بەڵام من بۆیە نەهاتبووم خاتو ژانسییە ببینم، من هاتووم ئەو کەسەی دەمناسی، خۆشم دەویست، ئەو کەسەی بیرو باوەڕی پێم بوو ئەوی ببینم."

"ماویس.."

"بەڵێ ماویس.."

"بۆ حەزت لێیە بیبینیەوە و بگەڕێیەوە سەردەمی جاران؟ جارانی خۆم و خۆت؟

"وای بەڵێ، بەڵێ!"

کەمێك دوودڵ ما و ئەوجا ڕۆخساری سوور هەڵگەڕا و گوتی:

"ئایا ئێوە مادام ئارینتزی نانکەر دەناسن؟ ئەوەی کە ماویس نانی لێدەکڕی؟"

"بەڵێ چاکی دەناسم، دوای ڕۆشتنێ ماویسی من چوومەوە ئەوێ."

"بەیانی سەعات چواری ئێوارێ دەتوانی لێرە بی؟"

"ئەودەمی.."

"ئەودەمی لەوانەیە، ماویس، ئەوکچەی کە دەڵێی خۆشتان دەوێت بێتە لاتان."

دێرەدا دەستی بەرەولای منەوە راداشت و منیش وەکو هەموو ئەوکەسانەی کە بۆیان هەیە دەستی هونەمەندێکی ماچ کەن، سەری پەنجەکانیم ماچکرد. ئەو لەسەر من رانەوەستا تا دەڕۆم، بۆخۆی بەرەولای دەرکێوە چوو. من لە جێی خۆمەوە راپەڕیم دەرگاکەی بۆبکەمەوە. ئەو بەهەمان ئەو بزاوت و لڤینانەی فێری ببوو و مەشقی لەسەر کردبوون، بەگەردنی کێلەوە، بە تەکمدا تێپەڕی. چاو پێك کەوتنەکەم دەگەڵ خاتو ژانسیدا تەواو بوو، چ چاوپێکەوتنێك؟ لەوانەیە هەزار جۆر چاوپێککەوتنی ژانسیم لە لا بەرجەستە بووبێتەوە، بەڵام هەرگیز پێموانەبوو وابێ، بەڵام دوایەش ئەمە هەر ماویس نەبوو کە من دیتم، ئەوە مادام ژانسی جوان بوو.

دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کاتێ کە لە ئوتێلەکە هاتمە دەرێ لە خۆشیان دەلەرزیم ئەو وادەی دیتنی بە من دابۆوە کە لە نانەواخانەکەی خاتو ئارینتز، نزیکی



ئارتیستۆی بیبینمەوە، ئەویش بە بێ لەوێبوون و ئاگاداریە مادام ژانسی گۆرانیبێژ، بەڵکە بە شێوەی ماویسی شیرین و خۆشەویست بێتەوە ژوانێم. داخوا دەبوو جارێکی دیکەشم وەك جارانی پێشوو دە باوەش گرتبایەوە؟

ئیدی من دە بیری ئەوەیدا نەمام دەستبەجێ بچم و جێیەکی دەکەشتیەکیدا پەیداکەم و بەرەو موستەعمەرەکان و سەرزەمینی کارو چالاکیەکانەوە بچم. بەڵکە هەر لەبەر خۆمەوە دەمگوت:" ئەگەر ماویس ئامادەبێ دووبارە بگەڕێتەوە لام، دەبێ من شێت بم ئەگەر بچمە ئەوپەڕی دنیایە."

ئەڵبەتە من بە خەیاڵی ئەوەوە نەبووم بە تەواوەتی و بە یەکجارەکی واز لە نەخشەکەی خۆم بێنم. من دەمهەویست لە ئیگلتەرەی بڕۆم و ژیانێکی نوێ بۆ خۆم دامەزرێنم و دەست پێ بکەم و هەرگیزیش دەخەیاڵی ئەوەیدا نەبووم شارەوشاریش بەدوای مادام ژانسی کەوم.

من جێیەکم دەژیانی ویدا بۆ نەمابۆوە، ریزیۆ هەموو کارەکانی وی ئەنجام دەدان، من نەمدەویست ماویس ببینمەوە و دوای ئەوەندە ساڵانە سەر لە نوێ پێدابێمەوە. دوایەش درەنگ یا زوو ئەو هەر ناچار دەبوو بڕوا و ئەو دەمیش هەر دەبوو لێی جودا ببمەوە، کێ چووزانێ، بەڵکە دە نێوان ئەو هەموو گەڕان و هاتوچۆو لێك دابڕانانەشدا ڕۆژ و ساتەوەختی پێك گەیشتنەوەیان تێکەوێت و تێدابێت.

## ٤٤

بە گەرموگوڕی و تاسەی هەرزەکارێکەوە چوومە جێ ژوانێ. مادام ئارینتز دەستبەجێ ناسیمیەوە. ئەڵبەتە من زۆر زوو گەیشتمە وێ. دەدڵی خۆمدا دەمگوت:" ئایا دەستور، یا هەواڵ و پەیامێکی دابوویە یانە نا؟" و مادام دەستبەجێ گوتی:

"خانم حەزی لێیە لە"ژووریان" چاوەڕێ بن."

"زۆر سوپاس."

مەبەستی مادامیٚ لە" ژوورەکە" مەتبەخە پاك و خاوێنەکەی پشت موغازەکە بوو. مادام هەمیشە بۆخۆی هەر لە موغازەکە بوو و مسیۆ ئارینتزیش جێیەکی دیکەی هەبوو.

ئیدی من چوومە"ژوورەکە" و دیتم روومێزێکی زەردباوی پاك وخاوێن و ناسك بەسەر مێزەکە دادراوە و قاپی پڕ لە کێك و نانەشەکرەی لەسەر ریزکراوە.

لە پڕ شتێکم بە خەیاڵدا هات و پرسیم:

"خاتوون، ئایا کەس دەژوورەکەی سەریٚ دایە؟"

"نا، ئاغا"

"لەوانەیە هەر بۆ خۆم بیگرم.

" زۆر چاکە ئاغا."

ژنە دڵنەرمە نەمساوییەکە زەردەیەکی هاتیٚ. من بیرم لەوە کردەوە کە ئەگەر دەگەڵ ماویسیم بڕیارێك دا واچاکترە لە شوێنەکەی ئێستام بگوێزمەوە و بێمە ئێرە. بە بیٚ ئارامی و کەفوکوڵ و تاسەوە دەقیقە ژمێریە چاوەڕوانییەکەم دەکرد. دەنگی ئەو کڕیارانەی یەك بە دوای یەکدا دەهاتن و دەگەڵ مادامێیان قسە دەکرد و دەڕۆیشتن، دەهاتە بەر گویٚ. دەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر لە سەرهەستبووم، کەچی ئاگام لە هاتنە ژوورەوەی ماویسی نەبوو. لەپڕ دەرگای نێوان هەردوو ژووران بە بیٚ دەنگ کەوتە سەرپشتیٚ ماویس هاتە ژووریٚ و یەکسەر دەگاکەی داخستەوە. وای، ئەمەیان ماویس بوو، خۆی بوو، بە جل و بەرگێکی ڕەشی سادەو کڵاوێکی بچکۆلانەی هەمان رەنگەوە، بە بیٚ هیچ زێڕ و زەبەر وخۆڕازاندنەوەوە. ماوەیەك هەروا بە پێکەنینەوە لە پشت دەرکیٚ راوەستا. دەستەکانم بەرەولای وی راداشتن و گوتم:

"ماویس!"

وەك بڵێی لەیەك سانیەیدا تەواوی ساڵەکانی جودایی و لێك دابڕانیٚ تێپەڕین. دە یەك ساتەوەختیدا چوومەوە دنیای ئەو ڕۆژە هەرگیز لەیاد نەچوو و ئازیزانەی گەڕەکی



ئارتیستۆی کە هەموو جاریٚ بە هەڵەداوان بەرەولای وییەوە باڵم دەگرتن.وەك بررووسکە بەرەولامەوە هات و دەستەکانی نایە نێو دەستەکانمەوە و ئەوەندەی گوت:

"تۆ؟"

من بە تاسەوە روخساریم ماچ باران کرد و وەك تینووەکی تینوو کە بگاتە ئاوی حەیاتیٚ کەوتمە لێوە کوتەی لێوەکانی.

خۆی رانەگرت و بچووکترین نیشانەی ساردی و بیٚ متمانەییشی پێشان نەدا. هەر هەمان ئەوکچە خۆشەویست و شیرین و ئازیزە بوو کە ناسیبووم و دەمناسی. تەنانەت ئەوەشی نەپرسی کە من دەو سیٚ ساڵەیدا لە کویٚ بووم. تەنیا بەوەندەی قنیات دەهات کە دەگەڵ منە. دوای ماوەیەك گوتم:

"دویٚ شەویٚ تۆ بەو رەفتارە سەیر و سەمەرانەت منت شێت کرد و منت ترساند."

قاقایەکی لێدا و گوتی:

"وای,وای؟ کەواتە وادیارە ئێستاکە من ئیدی زۆر شتان فێربووم." وەك ئەو خودی مادام ژانسی هەر نەبیٚ. بەڵکە کەسێکی غەریبە بیٚ. دەستی کرد بە هاوار و گاڵتەجاڕیە:

"سەیرکە، ئەوە مادام ژانسییە."

و سەری کەمێك خوار کردەوە و زۆر بەوردیش ئەژنۆیەکی نوشتاندەوە.

"ریزیۆ هەمیشە دەڵیٚ ئیکلامیٚ مەکێشە.ئەوە ئیشی پیاوانە. خۆ ئەگەر پیرو کەنەفت و کەلەلا بووی ونەتتوانی ئەژنۆت بنووشتێنیەوە ئەودەمی دەست بە سینگەوە بنیٚ و ئیکلامیٚ بکێشە. کیژۆڵەیەکی بەلەباریکەی هەرزەکار ئەو کارە ناکا.وای لەبەر ریزیۆی کە هونەرمەندە ئەو جاری وایە کارێکم چەندین جار و بەڵکە سەدان جار پیٚ دووپات دەکاتەوە مەشق و راهێنانی لەسەر بکەم تا دڵی دەیگریٚ و پەسەندی دەکا."

"تۆ هەموو کارەکان بەو پەڕی چاکیەوە ئەنجام دەدەی."

پێکەنی و زۆری کەیف بەو قسەی من هات.

مادام ئارنیتز دوای ئەوەی چەند جارێکانی بەسەری پەنجەی بە توندی لەدەرگای دا. بە خۆ و بەسینیە قاوەوە هاتە ژورێ. ماویس بە زمانی هەندەرانی شتێك پێگوت و مادام ئارنیتزیش زەردەخەنەیەکی لە دڵان خۆشی کرد. دەحاڵێکیدا کە دەستی دە کەلەکێ نابوو، ماوەیەك هەروا بەدەم پێکەنینەوە قسەیان کردن و مادام بەسەرنج و ئاماژە بە منەوە، لەدەرکێ چووە دەرێ. ماویس قاوەکەی تێکرد و قاشە کێکێکی هەڵگرت و داپیاچی. من سەیری جێ ددانە وردیلەکانی ویم لەسەر کێکەکە دەکرد. بە پێکەنینەوە پرسی:

"ئەوە بۆ، کێکی ناخۆی؟"

"نا جگەرەیەکی بکێشم چاکترە."

کێکەکەی تەواو کرد و قاپەکەی پاڵ پێوەنایە دواوە و دەستەکانی لەسەر مێزەکە لەسەر یەك دانان و پرسی:

"ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە؟"

"لە تۆ، کە ئێستا گۆرانیبێژێکی گەورە و جوان و خۆشەویستی، چۆنم پێشبینی دەکرد وادەرچووی ئایا هەقی من نەبوو کە دەمهەویست بتنێرمە بەردەستی ریزیۆی؟ ئەو دەمی تۆ رازی نەبووی، ئەدی ئێستا؟"

هێندێکی برۆ تێك بادان وگوتی:

"نازانم.. نازانم."

یانی چی، ئێستا ژیانت چاکتر نیە؟"

"لە هەندێ لایەنەوە، با، بەلام خۆ مرۆڤ هەر لەسەر بارێکی نابێ و هەروا نامێنێتەوە.؟

من گۆڕاوم، بۆ نموونە من کە ئێستا دەگەڵ تۆدام، هەولدەدەم رابردوو بە ئێستاوە بگونجێنم.

یاکاتێ کە خەریکی گوتنی گۆرانییەکم هەوڵدەدەم کە ورەیەکی پێویست لە خۆمدا دەرخەم، دەزانی دەڵێم چی و مەبەستیشم لە ورە چیە؟ ئێستا دەگەڵە تۆشدا



هەوڵدەدەم ورەو گیانێکی تازە پەیدا کەم، ورەی رابوردوو و ئەو رۆژانەی کە لە ئارتیستۆ بەیەکەوە بووین."

لە قسەکانی دلگران بووم. چونکە سەیرم کرد بەو قسانەی دەیهەوێ ئەو شتەی کە من خۆم تا ئەندازەیەك دەمزانی پێم بلێتەوە. پێم بلێتەوە کە ئەو گۆڕاوە و ماویسەکەی جاران نیە.

شتێکی دیکەیە ئەو رۆڵەکەی خۆی دەگێڕا و زۆر بە چاکیش بەلام هەرچی بوو هەر"رۆڵ بوو" گوتی:

"ئایا هەر بەڕاستی وا هەستدەکەی؟ پێتوایە کە دەبێ شتێکی لە دەست چوو دەست خەینەوە؟"

هەمدیس شانەکانی هەڵتەکاندنەوە، برۆیەکانی تێکنان و شێوەیەکی راشکاوانەی بەخۆوە گرت. هەرچەندە دیاریش بوو قووڵ دەبیرەوە چووە بە مینگەیەکەوە گوتی:

"نازانم."

"بەلام ماویس، تۆ حەز دەکەی وەك جاران بییەوە.نا؟"

"بەڵێ، ئەگەر وانەبوایە ئەورۆ نەدەهاتم."

"ئەوەش هەر بۆ خۆی دەرفەتێکە."

"بەلام.. چ؟

"خۆشەویستە ئازیزەکەم، ئەوە سێ ساڵ بەسەر ئەو دەمیدا تێدەپەڕێ. سێ ساڵ ماوەیەکی زۆرە. سەرەڕای ئەوەش من دەوماوەیەیدا.. چۆنی تێگەیەنم. پەروەردە کراوم. مەشقم کردووە و فێر بووم. ریزیۆ دەڵێ من دەبێ هەموو رۆڵێکی هەست بکەم تا بتوانم چاکی بخوێنمەوە تا کار لە خەڵکی دی بکا. بەلام پێتوابێ ئەگەر کاتێ نەتوانم هەست بکەم."

"مەبەستت چیە؟ ئایا تۆ بە لانی منەوە هەمان هەست و نەستەکانی جارانت نیە؟"

"هەمان هەست و نەست؟ لە پێشداگوتم کە مرۆڤ لەوانە نیە دوای سێ ساڵان هەروەکو خۆی بێت و هەست و نەستەکانی نەگۆڕێ. بە تایبەتیش ئەگەر دەو ماوەیەیدا لە ژێر کاریگەرییە جۆرە پەروەردە و مەشق و ڕاهێنانێکیشدا بێت."

"ئایا دەتهەوێ بڵێی کە ئیدی هیچ جۆرە هەست و نەستێکت بەلای منەوە نیە؟"

جارێکی دیش چاوە شین و جوانەکانی کە وەك دەریای بێ کەناری پڕ خەون بوون لە منەوە بڕین و دەستی خستە سەر لای چەپی سینگیەوە و گوتی:

"با.. لێرەدان بەڵام من هێندەم ئەو هەستە لێرەدا پاراستووە و هێندەشم بەر لێ گرتووە کە ئێستا ناکرێ لە پڕ بەرهەڵدای کەی. دەزانی چ دەڵێم؟ ئەو عیشقەی کە ئەوەندە ڕاستەقینە و پڕ کەفوکوڵ و توندبوو، ئەوەندەی شتی درۆ و فێڵاوی و ساختەو ناڕەوا پێوە لکا هەر مەپرسە."

دەستم خستە سەر دەستی و گوتم:

" دەبێ دووبارە زیندووی کەیەوە. من هیچ کاتێ هێندەم تا ئەو ئەندازەیە پێویست بە عیشق و خۆشەویستی تۆ نەبووە."

سەرنجێکی نەوازش گەرانەی دامێ و هیچی نەگوت.

"ماویس، تۆ منت هەر خۆشدەوێ، وەنا؟"

"بەڵێ ئازیزم."

"وەك جاران."

"نەء"

"ئەدی چۆن؟"

"نازانم."

دەستیکەی دە دەستی مندا بوو کێشایەوە و بە پەنجە ناسکە بۆیە کراوەکانی دەستی منی توند گرت و گوتی:

"تۆ پێت خۆشە کە من، ئەو ڕێیەی خۆم درێژە پێ بدەم؟ گۆرانی بڵێم، و هەر مادام ژانسی بم؟"



"بەڵێ."

"هیچ ئومێدێکیش نیە پێکەوە ببینە هاوسەری یەکتری؟"

"ژنەکەم ماوە و زیندووە."

چاوە پڕ غەمەکانی دە چاومەوە بڕین و گوتی:

"باشە ئێستا ئیدی لەلای من دەمێنیەوە؟"

ئەو نەخشە و پلانەی کە دامنابوو و بە ویویانم گوتبوو هاتەوە بیرم. من بۆیەم پارە لەو وەرگرتبوو تا بڕۆم و ژیانێکی تازە دەست پێ بکەمەوە.

سەرەڕای ئەمانەش من نابێ ئەوەم لە بیر بچێ کە تازە لە زیندانێ هاتوومە دەرێ و ژنێکیشم هەیە. باشە بەو حاڵەوە من دەژیانی ماویسیدا چ بووم؟ من تەنانەت ئەوەندە پارەیەم نەبوو کە هەر خۆمی پێ بژیەنم. کێ دەڵێ ئیشم دەستدەکەوێ؟

ماویسیش خۆ هەر لە جێیەکی نامێنێتەوە.. هەر ڕەنگە لە بنەڕەتیشدا لاواز و ترسنۆکیش بم، دەنا دانەدەنیشتم ئەو بیر و خەیاڵانە بکەمەوە. ئەگەر من بێباك و جحێڵێك بوومایە هەرگیز حیسابێکم بۆ ئەمانە نەدەکرد.

لەپڕ بێدەنگییەکەی منی تێکشکاند و گوتی:

"خۆشەویستە ئازیزەکەم. چۆن بوو دووبارە هاتیەوە لام.؟"

"چونکە هیچپیدیم بەرگەی دووریت نەدەگرت."

"ئەدی ئەو سێ ساڵەت چۆن توانی؟"

"ئەو لە دەست مندا نەبوو، بەناچاری."

"دەگەڵ ئەوەشدا سێ ساڵانت خۆ لێ ون کردم، و تەنانەت نەتویست هەر پێشم بڵێی لە کوێش بووی. تۆ هەست و نەستەکانی منت هەموو سڕ کرد. ئێستا چۆن چاوەڕێی ئەوەی کە دەیەك چرکەی ساتەوەختێکدا چرۆ و غونچەی گوڵی حەزەکانت بپشکوونەوە؟ چاوەڕوانییەکی سەیرە. تۆ ئەویندارییم دەگەڵدا دەکەی، و هەردەو دەمیشدا دەستم پێوە دەنێی. ماوەی سێ ساڵان بێ باس وخواس و هەواڵێك بە جێم دەهێڵی. ئەو جا دێیەوە و دەڵێی منت خۆش بوێتەوە و باهەموو شتەکانیش وەك جارانیان لێ بێتەوە!"

بەدنیایەك غەمو ئاخ وداخەوە گوتم:

"ئەمانە هەمووی راستن. بەلاّم خۆ من نەگۆڕاوم. لـە تـۆش بەولاوەکەسـم خـۆش نەویستووە و ئەوین و خۆشەویستیەکەم هەر ماوە و لە جێی خۆیەتی."

"بەراسـت، بـەلاّم ئـەدی نـەدەبوو بـزانم ئـەو هـەموو ماوەیـە لـە کـوێ بووی؟"یەکجاریش وا؟"

"وای ماویس!"

بەلای مندا چەمیەوە و گوتی:

"تۆ هەمیشە هەر قسەی خۆت دەسەلمێنی، ئێستاش هەروا بەلاّم وەرەسوێندێ بخۆ یا ئیدی لێم جودا نەبیەوە، یا ئەوەتا لەوڕۆ بەدواوە هیچ کـاتێ یـەکتر نەبینینـەوە."

من بێ ئیختیار هاوارم کرد:

"ئەوە پێشنیارێکی سەخت و دژوارە."

"ئەدی ئەوەی تۆ بە سەرمنتدا سەپاند سەخت و دژوار نەبوو؟"

"ماویس. تۆ تێناگەی، تۆ ئێستاخاوەنی هـەموو شـتێکی چـاکی، ئێـستا هـەر هونەرەکەت بارتەقای هەموو شتێکیە."

"وای، تۆ هەمیشە هەر هونەرەکەمت لە پێش خۆمدا ویستووە! دەنگی منت لـە پێش خۆمدا پەسەند کردووە. ئەدی من لەبەر چاوی تۆ هەر جوان نیم، من لای تۆ ژن نیم، لێوەکانم گەرم نین. تۆ تەنیا هەر دەتەوێ مـن بـە پلەوپایـەی بـەرزەوە ببـینی و لەوپەڕی بەرزییەوە گۆرانی بۆ خەلّك بلّێم، کەچی لە جیاتی ئەوە دەتوانی بۆ تاهەتایە من لەبەروباوەش و ئامێزی تۆدابم."

"وای خودای خۆم!"

"تۆ بەفەرمی من لە خۆت دوور دەخەیتەوە. ئەوە کام ژنێك دەتوانێ بەرگەی بگرێ؟

بۆ من ئێستاش دەزانم لە بەرچی سـێ سـالأنت بـە تـەنیا بـە جـێ هێـشتم؟ تـۆ نەتتوانی بەرگەی نهێنیەکی بگری کە بۆم ئاشکرا کردی، من شێت و گێل بـووم دەنـا نەدەبوو شتێکی وات بۆ بدرکێنم و پێت بلّێم."



"ماویس، لەبەر ئەوە نەبوو.."

"سوێند دەخۆی؟"

"دەسوێند بخۆ"

"مـاویس، کـاتێ کـە تـۆ بـە منـت گـوت کـە مێردەکـەت دەیهەویـست تـۆ بەکاربێنێ.."

"تۆ ئەو کاتە رکت لێبووەوە."

"نا، گوێ بگرە، من ئەوەم بە خەیالّداهات کە ئەگـەر منـیش، تـۆ.. ئـەوە لـەو چاکتر نیم"

"وەی، دەتەوێ چۆنم قایل کەی؟ من نەدەبوو ئەو راز و نهێنیەم بە تۆ گوتبایە، تۆ بەوە لە من سلّەمیتەوە. دەمێشکی خۆتدا خـۆت هێنایـەوە ریـزی پیـاوانی دیکـە و هەروەها ئەوەت هێنایە بەر چاوی خۆت کە من چۆنم ئەو ژەهـرە دەقـاوەی بـەرناردی کردووە و دە دلّی خۆتدا گوتت"وای.. وای ئـەو ژنـە گوناهکـارێکی ترسـناکە و مـن وازی لێ دێنم، ئێستاش کە لەلایەنی هەبوونێوە دارایە و هەیەتی و ئاسوودەیە" بەلاّم بە بێ وشەیەکی روونکردنەوە و بێ هیچ هەوالّێك بەرهەلّدات کردم."

هەناسەیەکی قوولّم لە سینەی هاتە دەرێ، نازانم بۆ هێندەم هەست بە ماندووەتیە دەکرد و بۆ حەوسەلّە و توانای بەرگریەم نەبوو. نەیدەتوانی باوەڕ بە قـسەکانم بکـات. مەگەر ئەوەی کە هەموو شتێکم پێ گوتبایە و کە ئەوەش نەدەکرا و هەرگیز نەدەبوو. پێموابێ وەك لەرەنج و ئێش و ئازارەکانم گەیشتبێ، تووڕەییەکەی نیشتەوە و بە لێـوە لەرزەوە گوتی:

"تۆ ویژدان وبەزەییت تێدانیە، من دەوسێ سالّەیدا خەیانەتم لە تۆ نەکردووە. تـۆ هەمیشە خۆشەویست و سەروەری من بووی خەلّکی ناویان نابووم ژانسی سـارد و بـێ گیان، دەگفت و بەلّێن بدەوە کە جارێکی دیکەم بە تەنێ بە جێ ناهێلّی."

بیرێکم هاتەبەر چاوی. دەستەکانیم دە دەستی خۆم گرت و گوتم:

"گوێ بگرە. بیر لە سبەینێ مەکەرەوە. ئەورۆ ئێمەیە.دەبا بۆ ئەورۆ و ئێستاکەی بژین."

"من بەرامبەری تۆ توانایەکم نیە، با ئەورۆ هی ئێمە بێ."

## ٤٥

لەو دەقیقەی بە دواوە وەك دوو منداڵان کە هیچ غەمێکی سبەینێیان نییە دەژوورەکەی ئارینتزیدا هەر گوتمان و پێکەنین. سەعات شەش ماویس دەبو بڕوا. دەوەختی خوداحافیزیەدا من پەنجە کانیم ماچ نەکردن. بەڵام دەو دەمەشدا کە لێوەکانم بەسەر لێوەکانیەوە بوو دەمزانی کە ئیدی بەختیاری و خۆشی وشادییەکە بۆمە نیە و هەموو شتێك تەواو.

ئەو تێدەکۆشا ماویس بێ بەڵام هەر ژانسی بوو و دە دنیای ژانسی لۆکس ورازاوەشدا جێی منێکی ( ) تێدا نەدەبۆوە. گوڵە سوورەکانی ماویس سیس و ژاکاو و بلێسەکانی ئەو هەمووی دامردبوونەوە و راستیەکەی دەبوو هەر هەمان دەقیقەی ئەو شەوە بڕویشتبام، دوور کەوتبامایەوە. دەکاتی خوداحافیزیەدا گوتی:

"بەیانی هەر ئەم کاتە." کاتێ کە دوودڵیەکەی منی دیت گوتی:

"یەك هەفتەی دی ئێمە دەچینە پاریس" دوایەش بە پێشنیارەکەی وی رازی بووم و دە دڵی خۆمدا گوتم:" تا هەفتەیەکی دی هەموو شتێك تەواو دەبێ. باشە دەی دەبا ئەم چەند رۆژانە بۆ من بێت"... تا ئێرە هەقی خۆم بوو.

ئەگەر من هەر ئەو دەمی رۆیشتبام، ئەویش هەوڵی دەدا شتەکان لەبیر خۆی بەرێتەوە و مادام ژانسی سارد و بێ بەزەییش بە دوای کاری خۆیدا دەچوو. بەڵام من نەڕۆیشتم و ئەوەندە کەل وپەلەی لە ماری لبون هەمبوو هێنامە ژوورەکەی مادام ئارنیتز. مادام بەو هاتنەی من زۆر خۆشحاڵ بوو ئەڵبەتە ئەو پێی وانە بوو ئەو خانمەی کە دێتە دیدەنیە من خاوەنی پلەوپایە و جێ ورێیەك بێ، ئەو ئەوی بە ناوی



کۆترێلەوە دەناسی و دوایەشم زانی کە ماویس گوتوویەتی کە لە یەکێ لە موغازە گەورەکاندا ئیش دەکا.

لەبەروەی کە من لەوێ ـ لەومالەـ ی بووم هەولم دەدا نەچمە سەر شەقامە قەڵەباڵغەکان نەکا کەسێك بمناسێ.

ئیدی مادام ژانسی لە لەندەن گۆرانی نەدەگوتەوە و ریزیۆش هەر لەبەر ئەنجامدانی هێندێك ئیش وکاران مابۆوە، رەنگە لەبەر دیتنەوە و هەڵبژاردنی شاگردێکی تازەش مابووبێتەوە. بڕیار بوو بەیانی رۆژی شەممە بەرەو پاریس بجووڵێن تا شەوی دووشەممە کۆنسێرتەکەی ژانسی دەست پێکرێ.دوایەش دەهاتنەە لەندەن و دوای ئەمەش پێکەوە بۆ کۆنسێرتی دی لە تەواوی ئەوروپا تۆ بڵێ بە دەوری هەموو دنیایەدا دەگەڕان. خۆ من چوار رۆژی دیش دەگەڵ ماویسی بووم.

رۆژی سێ شەممە هەر لەوێ ـ لە ژوورەکە ـ یەکترمان دیتەوە، وەك بڵێی بڕیاری دابێ کە ئیدی باس وخواس و پرسیاران هەموو بەلاوە بنێین و لە خۆمان بەولاوە بیر لە هیچ شتێکی دیکە نەکەینەوە. ئەو هەوڵی دەدا ئەوەندە سەعاتانەی پێکەوەین پڕ تام و چێژ و بە نرخ و تەواو خۆشی بێ وهەرچی هەست و نەستە نووستووەکانمە هەمووی وە ئاگا بێنێتەوە.

منیش لەوە زیاتر کە هەر لە چاوەڕوانیدا دانیشم دەنا هەقم بەسەرهیچەوە نەبێ و دوای ئەوەش سوود لە تەواوی ئەو دەقیقانە وەرگرم و تام و چێژی بکەم و دوای رۆینێشی دەیادی ئەو ساتەوەختانە دا نقوم بم.

چاکم دەزانی کە من دەبوو دەبیری دۆزینەوە و گرتنی جێیەکی دابم دەکەشتییەکیدا کە کاروبارەکانم رێك خەم تا هەر بە رۆینێ ماویسی منیش ئینگلتەرەی بە جێ بێڵم.بەڵام من هەوڵم دەدا کە ئەو ماوە کورتە بە بێ چەند و چوون تێپەڕێنم و بیری جودایی و خەیاڵی لێك دابڕانێ لەسەر دەرکەم.

عیشق هەرگیز ناگەڕێتەوە. دوای ماوەیەك دابڕان و جودایی، ژن و مێردیش دەگۆڕێن.

من و ماویس دەو ماوەی جوداییەیدا رووبەڕووی تاقیکردنەوەی زۆر سەخت و ناهەموار بووینەوە. پلەو پایەی وی رۆژ بە رۆژ بەرەوسەر و ژیانی منیش بەرەو ژێر دادەگەڕا. بەڵام ئەو دەمەی دەباوەشێم وەردێنا و هەستم بەگەرمی هەناسەی دەکرد، لە خۆشیان و لە کەفوکوڵی هەڵچوونێ ئەو هەست و نەستە و ئەو زیندەخەونانە، ئەوەم لە بیر دەچۆوە کە ئەو ژانسی بێ وێنە و گۆرانیبێژی خۆشەویست و ئازیزە و منیش کەسێکی زیندان دیتووی بێ رێ و جێم. بەڵام هەزار جار بە داخەوە کە دوای رۆیشتنی بە تەنیایی و بێکاریەدا هەموو ئەمانەم وەبیر دەهاتنەوە و وەك کوتکی لە مێشکی دەدام.

پاشان لە دوایین رۆژدا کە بە خۆمم دەگوت رۆژی جودایی مەیە پێی گوتم کە ریزیۆ زانیویەتی کە ماویس هاوڕێی هەیە. من بە قسەکانی پێکەنیم و چونکە "هاوڕێ"یەکەشی من بووم کەیفم پێدەهات و چێژم لێوەردەگرت. بەڵام هەر کە رۆیشت ئیدی یەك دنیا نارەحەتی و پەشێمانی رووی تێکردم. بەراستی من هەر ئەو رۆرژە بڕیارم دابوو دوایین ماڵئاوایی و خوداحافیزی لێبکەم، بەڵام ئەو هات و دەحاڵێکیدا کە قاوەی دروستدەکرد( لەسەر ئەوەی رژدبوو کە هەر بۆخۆی قاوەکە دروستکا) گوتی:

"خۆشەویستە ئازیزەکەم، ئێمە بەیانی بەرەو پاریس دەچین."

"دەزانم، لەبیرم نەچۆتەوە."

"هەر بۆ دە رۆژان."

من سەرێکم باداو دە دڵی خۆمدا گوتم:"بڵێ بۆتاهەتایە."

"زۆر چاکە.(دەستبەجێ هەستم کرد کە دەستبەردار نیە و واز ناهێنێ) کەواتە ئێمەش ئەمشەو دەیکەینە جەژن"من و تۆ" ریزیۆ ئەمشەو دەگەڵ هاوڕێکانیدا نان دەخوا ئازادم و تۆش بۆ نانخواردنی ئێوارێ دێیە ئوتێلێ، باشە؟"

"من ناتوانم، جلم نیە."

"جا قەیدی چیە، خۆکەس نایەتە ژوورەکەی من وکەسیشی لێ نیە، دێی یانەنا؟"

"بەلای منەوە نەیەم چاکترە."



"دێی یانە نا"

"نا ئازیزەکەم، وازبێنە باهەرلێرە بین."

"بۆ دە رۆژان دەچمە پاریس، و کەچی تۆ دوایین داوای من رەتدەکەیتەوە کە هەر وەك جاران دە ژوورەکەی مندا میوانم بی."

هەر چەندەم شێر وڕێوی هێنانەوە ولێی پاڕامەوە نەچووە گوێی و نەیسەلماند.

"تاگفتم نەدەیەی کە دێی لێرە ناڕۆم ئەمشەو تا بەیانی هەرلێرە دەمێنمەوە. هەرچەندە ریزیۆش شێت و هار و تووڕە دەبێ، هەر دەمێنمەوە."

"ماویس!"

"گوناهی تۆیە. تۆ من وا لێدەکەی. بەڵێن بدە دەنا ئەو کارەی هەر دەکەم."

"وای زۆر چاکە، من دژایەتیە تۆم پێناکرێ، با ئارەزووی تۆ بێ."

"بۆ ناتەوێ بێی؟ بڵێ، تۆ دەڵێی خۆشمدەوێی، نا."

کاتێ ئاوا بەو ئاوازەوە دەدوا هێندەی دی تەڕ وبڕو خۆشەویستتر ولە بەر دڵانتر بوو، دەستیم گرت و گوتم:

"ماویس، باوەڕکە، زۆرم حەزلێیە بێم، بەڵام نەهاتنەکەم چاکترە."

"بۆ، باشە بۆ؟"

"ریزیۆ.."

"وەی، من هەر فاتیحاش لەسەر ریزیۆی ناخوێنم، و بەهیچیشی نازانم، خۆ تازە ئێستاش هەرشاگردی وی نیم، من هەر خۆم رێم داوەتێ سەرپەرشتی کارەکانم بکات و بڕایەوە!"

"ماویس ئەدی کاتێك ئەو قەرەجە مەجارستانییە دەربارەی دەنگی تۆ و خۆشەویستەکەی تۆ پێشبینی کرد نەیگوت جارێکی دیکە تۆ عیشقەکەت نابینیەوە؟"

من لە بەردەمی وی دانیشتبووم، چەمیەوە و سەرمی بە سینگی خۆیەوە گوشی و گوتی:

"ئەو دەیگوت بەو سەرەی تۆ کە خۆشەویستی منی بەلایەك هەر دەبارێ، هێشتا هیچ نەبووە، باجارێ بەدبەختیەکت بە سەربێ ئەو دەمی بە نەمانی تۆ با عیشقەکەی منیش سەری تێدا بچێ و نەمێنێ.

"جا باشە تۆ چووزانی کە من تووشی بەدبەختیان نەبووم و بەلام بەسەر نەهاتووە.؟"

"نا، خوانەکا. هیوادارم هەمیشە لە بەلایان بە دوور بی."

بۆ نانخوادنێ چوومە میوانخانەکە و بە دەستوری مادام ژانسیش منیان بردە ژوورەکەی. چوومە ژوورێکیەوە کە لە هەموو ئەو ژوورانە بچووکتر بوو کە لە پێشدا دیبوومن، مێزێکی دووکەسی زۆر بەسەلیقەوە ئامادە و رازێنرابۆوە. گوڵدانێکیان گوڵی سوور لە ناوەڕاستی مێزەکە دانابوو و بە چوار دەوریشیدا مۆم دە شەمعداناندا دەسووتان، و پەردەی پەنجەرەکان دادرابوونەوە. رووناکایی ژوورەکە هەر ئی مۆمەکان بوو.

مۆمەکان بە بلێسەی بێ لەرە و ئەفسوناویانەوە دەسووتان. زۆر بەجوانی دیار بوو کە ئەم دیمەنە بە نەخشە و ڕاو تەگبیرەوە رێك خرابوو، وەك کەسێك چاوەڕێی ئەستێرەیەکی سینەمایی بێ. کەوتمە چاوەڕوانیەی. دەوساتەیدا بوو کە دەرکە کرایەوە و ژانسی پەیدا بوو.

جلە زێوین و جوانە هۆشبەرەکەی دەبەرابەر رووناکیە مۆمەکاندا جیلوەیەکی تایبەتی هەبوو. ساتێك دە نێو دەرکێدا راوەستا وەك بیەوێ کاریگەرییە جوانیەکەی خۆی بەسەر مندا تاقیکاتەوە، گوتم:

"وای ژانسی بێ هاوتا، ئەو خەڵکەی کە دەڵێن تۆ بێ وێنەی و هاوتات نییە هەقیانە."

هەر ئەوەندەی ئەو قسانەم لە زاری هاتنە دەرێ، پەشێمان بوومەوە، چونکە روخسارە چاوەڕێیەکەی کە وەك منداڵێکی بەتاسەوە چاوەڕێی ئەنجام و کاریگەریە خۆ نواندنەکەی خۆی بوو، تێك چرژا، هەموو شتەکان منداڵانە بوون، مۆم و گوڵە سوور و



جلەنوییەکان و هەر هەموویان،چونکە من دڵنیا بووم کە ئەو جلانە بەتایبەتی بۆ ئەو شەوە کڕابوون، کەچی ئەو هێندەی پارەی زیاد نەبوو بۆ دەستە جلێکی ئاوا، ئەو تازەی کۆنسێرتەکەی خۆی گێڕا بوو، هەر بۆیەش نارەحەت بووم و هەستم کرد ئاوازی دەنگەکەم کە گوتم"ژانسی بێ هاوتا" کەمێ گاڵتەجاڕیانە بوو. باشە چۆن دەبوو من ئەو باوەشەی خۆم کە بۆ ماویسی دەکردەوە بۆ ئەویشی بکەمەوە. ئاخر ئەو جلانە بۆ دە باوەش وەرێنانێ دروست نەکرابوون. بەدەنگێکی غەمناکەوە گوتی:"

"بە ژانسیم بانگ مەکە."

"راستە، داوای لێبوودن دەکەم. بەڵام تۆ یەکجار جوان و بەرچاو بوویت."

"هەر بوویە مانگ!"

ئەو تاسەو پەیوەندییەی دەبوو دەدەنگی مندا هەبێ نەبوو، هەر چەندە تەواوی ئەو جوانکاری و رازاندنەوانەی بۆ پێشوازی و میوانداریی من کرابوون تا سەرنجم راکێشن و دڵیان پێخۆش کەم، کەچی زیاتریان نارەحەت دەکردم و دەمدیت کە جیاوازییەکی زۆرمان کەوتۆتە نێوانێوە و هەر چەندەشم هەوڵ و تەقەللا دەدا زیاتر بگەینەوە یەك بێ سوود بوو. بەو حاڵەشەوە نەمدەتوانی بەغەمباری و رووی گرژ ومرچ و مۆنەوەی ببینم.. بۆیە هەوڵم دا منیش رۆڵی خۆم بگێڕم. ئەمەیان کارێکی دژوار نەبوو شەرابی بۆتێدەکردم و خواردنی دێنامە پێش و بەگەمە و گاڵتە وپێکەنینەوە سەرقاڵی دەکردم، ئەو بۆ میوانداریە من زۆر شتی منداڵانەی کردبوو. بێئاگا لەوەی کەمن دە عیشق و ئەوین و خۆشەویستیە ویدا گەشەم کردووە و پیر بووم.

پێتان وانەبێ کە دە رەفتار و هەڵس و کەوتەکانیدا دەگەڵ من راست و دروست نەبووبێ، نا، نا، ئەو هەرچی دەیکرد لە ناخی ناخیەوە و لە کرۆکی دڵیەوە بوو بەرامبەر بە من، بەڵام گیانی هونەرمەندایەتییەکەی کە چەندین ساڵ بوو دەگیانیدا گەڕابوو، کەم کەمەی تێکەڵاو خوێنی ببوو.

دوای نانخواردنێ لەسەر مۆبیلەکان بە تەنیشت سۆبەکەوە دانیشتین، مۆمەکانی سەر مێزەکە چوونە سەرەوەی قەپاغی سۆبەکە. ماویسیش بە جلە زێوینەکانیەوە دە

نێو کورسیەکەدا بە ماتییەکەوە دانیشت. شارای گوڵە سورەکان دەسۆبەکەیدا وەك ئاگری دەچوون. هەر چەندە تینوو و ئارەزوومەندی ماویسێکی بێ ریا و بێ کەش و فش بووم، بەڵام ئەمەیان ژانسی بوو کە بە هونەرمەندییەکی شاعیرانە، و هیوا و ئاوات و خەون و ئارەزووەکانەوە سەرگەرمی دەکردم. لە پڕ هەودای بیروخەیاڵەکانمی پساند و گوتی:

"بڵێ بزانم بیر لە چی دەکەیتەوە؟"

من کە بەرەوپشت پاڵم دابۆوە. دەستێکم بەرەولای وییەوە درێژ کرد، ئەو دەستبەجێ دەستی خۆی دەدەستی نام:

"پێموانیە، هەستدەکەم، ئێمە لە ئارتیستۆ یەکجار زۆر کامەران و بەختەوەر بووین."

"یانی ئێستا، لێرە وانیت؟"

"زۆر جیاوازە."

بە نارەحەتیەوە وەرسووڕا و گوتی:

"چ شتێکت پێ ناخۆشە و حەزی لێ ناکەی؟"

"هەموو شتێکم پێخۆشە و حەزم لێیەتی."

"نا. شتێك هەر دەبێ هەبێ. بۆخۆت بیلێ، من نازانم."

سەرنجم تێبڕی. لە پڕ دەستی بۆ تاجە گوڵێکی برد کە قژەکانی رازاندبۆوە و لێی کردەوە و هاوێستیە بە رپێی من.

"ئەوە بوو؟ ئەوە بوو کە چاوت پێی هەڵنەدەهات؟"(دووبارە دەیویست رازیم کاتەوە) گوتم:

" من هەمیشە قژەکانی تۆم خۆش ویستووە."

"وای؟ بەڵام تۆ هەمیشە منت بە سادەییەوە خۆشدەوێ؟" راپەڕی و هاواری کرد:

"تۆ خۆت چەندین جارت گوڵی سوور داومێ. منیش ئەمشەو لەبەر خاتری تۆم ئەوانە داناون. بەڵام تۆ پێت ناخۆشە و حەزیان لێناکەی، لێمگەڕێ با فڕێیاندەم."



و پێش ئەوەی بتوانم پێشی پێ بگرم و نەهێڵم، تەنانەت پێش ئەوەش کە بزانم دەیەوێ چبکا، هەموو گوڵەکانی تێکڕا لە گوڵدانەکان وسەرەوەی سۆبەکە تێکەوە لولدا و هەمووی بە تێکەڵ و پێکەڵێەوە هاویشتنە بەر پێی من.

"هەموو، هەر هەمووان فڕێ دەدەم. من بەیەك دنیا خۆشحاڵیەوە ئەوانم کڕین، لەبەر تۆ، چونکە لە رۆژانی رابردوودا، بەر لە هەر شتێك، تۆ ئەو گوڵانەت دایە من، و یەکەم شەوی کۆنسێرتەکەشم، هەر گوڵی سوورت هێنا، من ئەوانەم خۆش دەویستن، بەڵام ئێستا لە هەمووان بێزارم."

"ماویس، ئازیزەکەم نەکەی، منیش حەزم لەوانەیە، گوێ بگرە بزانە دەڵێم چی."

بەڵام ئەو گوێی لە قسەی من نەبوو. دەستی لە دەستم کردەوە و بەڕەنگی پەڕیوە و چاوانی پڕگڕ و، وبسکە زیڕینەکانیەوە کە بەولاولایاندا شۆڕ ببوونەوە گوتی:

"نا، نا، من هیچم ناوێن، هیچ، هیچ."

نەمتوانی پێشی پێ بگرم. بە زەوییەوە داکوترا بووم.

دوایە قەیتانی سەر شانی کراسە سیمدارەکەی پساند، بە جۆرێکی وای تێنووسا هەموو سیمەکەی بە گۆڕێ وەربوو. ئەو دەمی، بە جوولەیەك، مۆمە داگیرساوەکانی سەر قەپاغی سۆبەکەی هاویشتنە سەر گوڵەکان. مۆمەکان کوژانەوە و دەتاریکیەدا بەڕاکە ڕاکە خۆی گەیاندە من. بە ناڵە ناڵەوە خۆی دەباوەشێ هاویشتم.

"وای ئازیزەکەم، خۆشەویستەکەم، گیانەکەم، هیوای ژیانم."

## ٤٦

نازانم ئیدی چیت بۆ بنووسم؟ نەمدە توانی لەوی جودا ببمەوە وهەڵێم. بەیانی ئەو شەوە بەرەو پاریس چوون. منیش هەر چووم، ئەڵبەتە نە لەگەڵەواندا، بەڵام ئەو دەیزانی کە دەهەمان شەمەندەفەردام.

دووبارە داستانی مادام ژانسی و هاوڕێیەکەی کەوتەوە سەرزار و زمانان. من شارەزای پاریس نەبووم، بەڵام ئەو هەموو کون و وقوژبنێکی پێدەزانی و شارەزا

بوو. هەموو جێیەکی پێ نیشاندام. رۆژانە نزیکی سەعات یازدە یەکتریمان دەدیت و سەعات چوار یا پێنج دەهاتینەوە. شەوانە ژانسی بوو و دەبوو گۆرانی بڵێ. هەموو پاریس ببوونە هەوادار و لایەنگری وی، هەفتەیەك بەس بوو تا وەك بت بیپەرستن. من هەموو شەوێ ئامادەی کۆنسێرتەکانی دەبووم و بە تاسەو شەوق و زەوقێکی زۆرەوە بچووکترین جووڵەکانیم دەخستە ژێر چاودێریەوە و دوایین لەرەی دەنگەکەیم دەقۆستەوە.

چاکم دەزانی کە ریزیۆ لە ونبوونێ ماویسی توورەیە. جارێکیان لێم پرسی ئەرێ چ وەڵامی ریزیۆی دەدەیەوە؟ قاقایەکی کێشا و گوتی:

"ریزیۆ هەمیشە دەستور و فەرمانی جۆراوجۆر بە من دەدات: لە خەو، لەخۆراك، لە تەندروستی، و وەرزش و شتی ترەوە، و هەمیشە دەڵێ:" ئەمەیان بۆ گۆرانی گوتن، ئەوەیان بۆ دەنگ پێویستە."

دەمێشکی خۆمدا وام لێك دایەوە کە لە راستیدا من" بزوێنەری هونەری ئەوم."

دەرۆژان لە فەرەنسا بووین و دوایەش هاتینەوە لەندەن. من سەرلە نوێ چوومەوە لای مادام ئارینتز و لەوێ دابەزیمەوە. ئەو ژنە میهرەبانە دووبارە چاوی بە دیتنێم روون بوونەوە و زۆری کەیف بە هاتنەوێم هات.

یەکەم شەوی گەڕانەوێ، ئەنجوومەن و کۆڕێکی راشکاوانەم دەگەڵە خۆمدا گرت و دەگەڵخۆمدا کەوتمە حەوت و هەشتان.

من یەکەم رۆژ بە سەد لیرەوە، ئەو سەد لیرەیەی کە بۆ نیازێکی تایبەتیم قەرد کردبوو هاتبوومە ئێرە، و ئێستاش تەنیا کەمێکی کەمی لێ ماوەتەوە. پاریس شارێکی پڕ خەرجە و لە هەمووشی خراپتر دەو سەفەرەیدا جل بوو. کەسێکی کە دەگەڵ مادام ژانسی، لە پایتەختی فەرەنسای، نانی شەو و رۆژان بخوا، نابێ هەر تاکە یەك دەست جل لەبەرکا. هێندێکی بە گوڵ کرینێ درابوو. و ئەوە تائێستاش بەو چەند لیرەی ماوەتەوە، هەمدیس هاتوومەوە تاکە ژوورە نابووتەکەی نانکەری.



سوێندم خوارد  کە دەستبەجێ بچم و خەرجی خۆم لە ئیش کردنێ سەرکەشتیان دابین کەم. بەڵام کارەکەش هەروا ئاسان نەبوو، دەچوومە سەر هەر کەشتییەکی، دەمبیست کە هەزارانی لاوتر و زرینگ و  لە تۆ وریاتر چاوەڕێی ئیشن. سەرەڕای ئەوەش دەچوومە هەر جێیەکی لە رابردووی منیان دەپرسی، لە کوێ بووم. چیم کردووە، بۆ دەمهەوێ بڕۆم. ئا لەو بابەتە پرسیارانە.. تەنانەت یەکێك پرسی دەڵێی دەتهەوێ لە دەست پۆلیس هەڵێی؟ و یەکیکی دیکە گوتی" ئەرێ برالە دەڵێی تازە لە زیندانێ هاتوویە دەرێ؟"

ئەو قسانە لە هەموو شتێکیان زیاتر نائومێد وبێ هیوا و ناڕەحەت دەکردم. گوناهیشیان نەبوو، تووشی زۆر کەسی گومانلێکراو دەبوون. دەکرا بچمە یەکێك لە بەندەرە نزیکەکانی لیسبۆن، پالْما، یا جێیەکی دیکە! تا ئەگەر بەخت یار بوو، دوایی لەوێوە بچمە جێیەکی دوورتر، بەڵام ئەم نەخشەیەش هەر سەری نەگرت. من بە تەواوەتی بە تەڵەوە بوو بووم.

ئایا دەکرا کارێکی لە ناو لەندەن بدۆزمەوە و دوایەش ماویس بۆکۆنسێرتەکانی لێدا و بڕوا.

ئەگەر من کارێکم دۆزیبایەوە دەبوو دوای رویشتنی وی من هەر لەوێ لە جێی خۆم بمێنمەوە. بەڵام بە دوای کاردا گەڕانیش لە جێیەکی کە خەڵکەکەی دەیانناسیم ئەستەم بوو. من شتێکم بە دواوە بوو و بۆیە هەرگیز ئیش و کارێکی گونجاوم دەست نەدەکەوت.

لەسەر لێوی قەرەوێڵەکەی. دەو ژوورە بچکۆلەکەدا(کە ئێستا ئەوە خەریکی شت نووسینێم ) لە ژوورەکەی مادام ئارنیتز دانیشتووم و وەك خنکاوێکی دە دەریای نارەحەتیاندا پەلەقاژەمە.

کەوتمەوە بیری قەشەی کەنیسەی" فیلیپی پیرۆز" دەستبەجێ وازم لەویش هێنا. قەشە چی لە دەست دێ؟ گوێ لە پاکانەی من بگرێ؟ ئامۆژگاری و پەندم دادات و بڵێ" سەرێکیش لێرە هەڵێنە؟"

لەوانەیە سەبرکەم باشترە تا ماویس بۆ کونسێرتەکانی ئەورووپا و هەموو دنیایە وەرێ دەکەوێ.

من دەمزانی ماویس لەو سەفەرەی ناگەڕێتەوە و ئەوەی دەشگەڕێتەوە ژانسییە. لە جێی خۆم هەستام و هەولّم دا بیر و خەیالان نەکەمەوە. هەر چۆنێکی بوو من هێشتا چەند لیرەیەکم پێ مابوو. ژانسی، ماویس، یا چۆنتان حەز لێیە بانگی کەن و ناوی لێ بنێن، زۆر دەگەڵە مندا رووخۆش و بە سۆز وناسك و میهرەبان بوو، و ئەڵبەتە بچووکترین و کەمترین ئاگایەکی لەوەی نەبوو کە بە مێشکی مندا دەهات.

هەموو رۆژێ دوای نیوەڕۆیان دەهاتە مالێ مادام ئارنیتزی تا من ببینێ(چونکە من دەگەڵێدا نەدەچوومە پیاسە وگەڕانی ناو کوچە وکۆلانەکانی لەندەن) و دەو ژوورەیدا قسەمان دەکردن و قاوەمان دەخواردنەوە، و جگەرەمان دەکێشان، و هەولیشمان دەدا دەهەموو شتێکیدا هاوکار و هاوبیرو ڕا وهاوقسە بین، بەلام جاری وابوو لە پڕ لە ناوەڕاستی قساندا بێدەنگ دەبوو و برۆی تێك دەنان و بەوردی تێمەوە رادەما و سەیری دەکردم. وەك بڵێی لێم خاترجەم و دڵنیا نەبێ. بڕیاری من ئەوە بوو کە بە هەر شێوەیەکە بڕۆم. بێگمان ماویس هەر دەڕۆیشت و منیشی لە بیردەچۆوە، ئەو بەرەوپێش و بەرەو لوتکە. بەرەو سەر و سەرووتر، و رۆژ بەرۆژ بەناوبانگتر و گەورەتر دەبوو و ئیدی من لە لای ویم جێ نەدەبۆوە. پێویستیشی نەدەکرد من دەگەڵەویدا بم. داخوا چەند کەسی نائومێد، بەخەیالی پڕ و پووچەوە رۆژانە هەروا بەهیواو ئاواتی سبەینێوە بە ژیانەوە نووساون!

بەلام بۆ من ئیدی ئەو جۆرە شانسە نەبوو. باوەڕتان بێ و بزانن من هەمووشتێکم بە هەموو بارێکیدا لەبەر چاوگرتبوو و خوێندبوومەوە بەلام هیچ تروسکەیەکی ئومێدێم لێوە بە دی نەدەکرد و هیچ رێیەکی وام بۆ نەمابۆوە جێی سەرنج و تێڕوانینێم بێ. لەوانە بوو وەك بڕیارم دابوو بڕۆیشتمایە و دوایەش وەك داستانی پەرییان بە دەستی پڕ و سامانێکی زۆرەوە هاتبامایەوە ماویسم دەست کەوتبایە، و کۆتاییەکی جوانیش بۆ داستانەکەی ویویان دەرەخسا!



ئیدی ژیان زۆرانبازییە و هەر تەنیا بە خۆزگە و بریایانیش بە مەبەست ناگەی. دەژیاندا هەلێکم بۆ رەخسا و لە جیاتی ئەوەی سوودی لێوەرگرم، بە ماویسم بەخشی. لەو کارەش پەشیمان نیم. وەك بلێی بوونی خۆمم بۆ کامل کردنی بوونی وی تەرخان کردبێ. چێژم لەو کارە دەکرد. بەلام بەدبەختییەکە دێرەدا بوو، کە ئەوەندەی شەیدا و پەرێشانی ماویس بووم و دەمپەرست، نەمدەتوانی ژانسیم ئاوا خۆشبوێ. ئەڵبەتە ئەو هونەرمەندێکی بێ وێنە بوو، من رێزم لێ دەنا، بەلام هەندێ پیاو دە ژیاندا هەر تەنیا ژنێکیان خۆشدەوێ و ماویس و ژانسیش زۆر لێك جودا بوون. من سەردەمانێك لە ئارتیستۆی، لەو جێ هەژار و نەدارە و ئەوشوێنە سادە و بێ ئارایشتەدا، بەختەوەرترین بوونەوەرێك بووم و هەرگیز دڵە خورپەیەکم دەگیان و لەشیدا نەبوو.

لەوانە بوو ژانسی لەسەرەتاوە بەو جیاوازییانە نارەحەت بێ، بەلام هێدمەی نەدەگرت.

ژیانی وی هەر بەڕاستی وەکو پێویست و بە دڵخوازی هەموان بوو و وەك ئەوەی ئەم هەموو بگرە و بەردە و کێشمەکێش و بێنە وبەرەیە هەموو هەر بۆ وی بووبێ.

وای! نەمدەزانی دوای رۆیشتنی وی چدەکەم؟ دنیای بێ وی دنیایەکی چۆڵ و هۆڵ و بێدەنگی من بوو.

ژیان بە بێ وی بێ نرخ بوو، لێرە لە ئینگلتەرەی. روو لە هەر جێیەکی دەکەم لەبەر بەدناویەکەی پێشووم هیچ جێیەکی بە خۆم ناگرم. ئیدی گوڵی سوور و مۆمی سوور دە ژیانی مندا مانایەکیان نەما وسڕانەوە، دەبوو لە مەودوا بە دوای مۆمی بەرزی سپی و تاجە گوڵی بە قردێلەی رەشەوە بم.

بەلام ئەوەم لە بیر نەبوو کە کەس تاجە گوڵ لەسەر گۆڕی دزێك دانانێ. خەڵکی منیان بەدز و پیاو خراپ و تاوانبار دەزانی،وکەچی من پێموابوو کارێکی چاك دەکەم، و بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش گوێم لێ نە بوو داخوا پیاو خراپ دەبم، دەسووتێم، یا لەناو دەچم.

خەڵکی بەس لە تەنگانە و نائومێدی وترس و لەرز و نا ئومیدیە دا مردنیان وەبیر دێتەوە، کەچی هەموو دەمێ و لە هەموو جێیەکی وەك تارماییە بە دوامانەوەیە و

لە چەند هەنگاوێکمان زیاتر لێوە دوور نییە، هێندە بەسە ئادەمیزاد هەر ئاورێکی بداتەوەو ببینێ و بیناسێتەوە، هێندە بەسە مرۆڤ هەنگاوێ شل کاتەوە ئەو پێشتکەوێ. من دەتوانم بە کۆڵانە شارەزایەکاندا بڕۆم، دەشزانم کە ئەوم هەر بە دواوەیە، ئەو دەمی.... یەك هەنگاوی لەسەر خۆ.... و کار تەواوە.

## ٤٧

ویویان تۆ پیاوێکی شەریفی و من بچمە هەر جێییەکی تۆم هەر لەبیرە. ئەوە چەند نامەیەکانت بۆ دەنووسم و دە بەرگی خۆمیان دەنێم تا بە هۆی وانەوە تۆ بدۆزنەوە. دەمەوی هەموو کارەکان بە تۆ بسپێرم، هەر چەندە بۆ تۆش زەحمەتە، بەڵام چبکەم؟ هەروەك گوتیشت، هیواردام ئەو داستانە وابێ قەرەبووی هەموو ڕەنج و ماندوو بوونەکانت بکاتەوە.

نازانم چ لەو شتانەی ئێرەم بکەم؟ جل وبەرگێکی زۆرم هەن. ئەوانەشم هەموو بۆیە بووە تالە دانیشتنێ گەڵ ژانسیدا ئابڕوومەند و لێوەشاوە بم،

ئێمە جووتێکی بەرچاو بووین و ئەویش لە جێی لۆکس و پلەیەکەکاندا دەگەڵ مندا هەمیشە شاد و شەنگوڵ و رازی و دیار بوو. ویویان زۆرم حەز دەکرد بیهێنم، بەڵام" ئەیوا"م چ لێکردبایە کە زرپ و زیندوو بوو؟

پێم خۆشە پێی بڵێی، یا هەر یەکێکی دیکە پێی بڵێ کە لە دەست ئەو مێردە هیچەی رزگاری بووە و ئیدی با بە ئارەزووی خۆی مێردێکی دی بکاتەوە.

ویویان ئێستا ئیدی زۆر حەز دەکەم ماویس بزانێ کە من وازم لەو نەهێناوە، چونکە ئەو پێیوایە وایە. خۆ تۆ خۆت پێتدەگوت، پێشی بڵێ کە هەر گۆرانی بڵێ،بڵێ کە من لە قۆڵایی گۆڕەوە دەنگی دەبیسم و هەمیشە گوێم لێیەتی، پێشی بڵێ کە ئەگەر ویستیشی مۆم و گوڵی سووریش بنێری قەیناکا با بینێرێ، بەڵام دەبێ هەمیشە هەر بۆم بڵێ.



پێی بڵێ دەبێ پردێك لە ئاواز لە نێوان من و خۆیدا هەڵنێ. پردێك لە شیعر و خەونە سەوزەکان.. بەمجۆرە دڵنیام بەختەوەری بە باڵە بەهێزەکانی خۆیەوە بەسەر گۆڕەکەمەوە باڵەفڕکێ دەکا. جلەکانم بەو پیاوەی خوار کۆڵانەکە دەفرۆشم و پارەکەشی دەدەمەوە مادام ئارینتز و داواشی لێدەکەم کە ئەو نامەیەت بۆ پۆست کات و بۆت بنێری. بێگومان وای بۆ دەچێ کەمن دەگەڵ دۆستەکەمدا رۆیوم. بەڵام ئیدی هەرگیز نامان بینێتەوە. بەڕاستی وەسیەتنامەکە! سەیرە چۆنم وەبیر هاتەوە، دیارە هێشتاش خوو وخدەو نەریت و شێوازێکم هەر تێداماوە.

ویویان دەیگوت لەوانەیە ئەم داستانە یەکجار بە نرخ و بەها بێت، من ئەوەم بە سەدلیرە بەوی فرۆشت. راستیەکەی لێم قەرز کرد. بەڵام نووسینەکە لای ئەوە، ئەوەی بە ویم فرۆشت بەسەرهاتی ژیانی من بوو و ئەوەی دەشمەوێ بۆی بنێرم داستانی مەرگی منە.

رۆجەر دالٽۆن لە دایکبووی ساڵی ١٨٨٢.ژیانی وی تەنیا لە ساڵی ١٩٢٣ وە دەستی پێکردو لە ١٩٢٦ دا مرد. کابرایەکی بێزراوی دەرکراو.... لەوە زیاتر چی؟

پێشینەی کاری جەنگیم تا بڵێی بەرز و دیار و گەورە بوو و هەمیشە لەناخەوە شانازیم بە خۆمەوە دەکرد و خۆم پێ هەڵدەنا تا ئەو رۆژەی کە قازی ئەوکارانەی دە دادگایدا وەك پەڕۆی بێ نوێژیە بە چاوی دادامەوە:

"لە سەردەمی شەڕێدا قارەمانێکی ئازا
دەسەر دەمی ئاشتەواییەشدا تاوانبارێکی گێلەکە!"

ویویان نامەهەوێ دەست لەنووسینێ هەڵگرم، چونکە هەر دەستم هەڵگرم هەموو شتێك تەواوە. ویویان ئەگەر شانسم هەبێ لاشەکەم ساغ بێ و هەپڕوون بە هەپڕوون نەبێ ئەوە یانی مردنێکی هەروا بەرێکەوتە و نە خۆکوشتن!

ئەمشەو من بادەی ئەو شانسە هەڵدەدەم. ئەمشەو دەگەڵ ماویسدا، یا ژانسی نانی ئێوارە دەخۆم و هەرکە پێکەکەشم بەرز کردەوە ئەو وادەزانێ بەسەلامەتی و لە چاوی ئەوە. لە بیرت نەچێ کە حەز دەکەم بزانێتەوە کە وازم لێ نەهێناوە و بە جێم

نەهێشتووە، ئیدی دەی ئەگەر گەڵایەکی سەوزیش بێ لە سەر گۆڕەکەمی هەر دانێن. من لە بەر ئەوەی کە خەونەکانم ئاوا تەواو بوون زۆر پەستم. لە بیرم ناچێتەوە کە تۆ کۆتاییەکی جوانکیلەی جوانت بۆ داستانەکەی من دەویست. چبکەم کە بە حەز و ئارەزووی تۆ نەهاتەوە و نەبوو. رەنگە ئەگەر کاتێکی کە دووبارە پێکگەیشتینەوە، قەرەبووی کەینەوە، مەگەر لەوێش جیاوازی بخەنەوە ناو چین و توێژ و کەسەکانەوە. ئێمە دە شەڕێدا پێکەوە بووین، و تۆ چاك دەزانی من دەڵێم چی. باروودۆخی ئێستای من وەك ئەو دەمانەیە کە دەمزانی دەبێ دەفلانە سەعاتدا هێرش بەرین. لە بیرتە ئەو کاتانەی دڵمان توند دەبوو و مێشکمان خەریك بوو بتەقێ، کەچی لە بەر چاو و لە بەر خاتری ئەوانیدی دەستمان دەکرد بە فشقیات و قسەی قۆڕ و جەفەنگان؟ یاد و بیرەوەرییەکانی مەکەنە دەکرا بە کەسیان بڵێین سەریان هەڵدەدایەوە؟

حەز وئارەزوو، و غەم و نیگەرانی،و کۆمەك و پشتیوانی و جارجارەش وێنەی ژنێکی،ژنێکی نەدیتوو و نەناسیاو، ژنێك کە لە جێیەکیمان دیبوو و سەرنجی راکێشابووین، دە مێشکمان دەچەقی، من ئێستا دە هەمان ئەو حاڵەتەیدام. بەڵام ئەمجارەیان وێنەکە وێنەی ژنێکی غەوارە نیە، وێنەی ماویسە.."

لەدوا لاپەڕەکاندا وەك بڵێی رستەکان تێك نەکەنەوە، ئەوەی بە مێشکیدا هاتبوو نووسیبووی. کاتێ کە دوایین رستەم خوێندەوە گوتم"ئای بێدەرەتان" بەڵام لە دڵەوە ستایشی مرۆڤایەتی و بوێری و ئازایەتی ویم دەکرد.

## ٤٨

بۆکفن و دفن و بەخاك سپاردنێی پارێزەرێکم ناردە لای ئەیوا داڵتۆنی خێزانی، چوو بوو کچەکەی دیبو و دوای بیستنی باس و هەواڵەکە گوتبووی کە دایکم نەساغە و ناتوانێ بتبینێ. سەرەڕای ئەوەش کە باوکم ساڵانێکە و بە جێی هێشتووە،و گوتبووی کە ئەوان ئەمە بە ئەرکی سەرشانی خۆیان نازانن بێن و لەو رێ و رەسمە بەشداری بکەن و هیچ هەقێکیان بەسەرەوە نیە.



ئەو جا بە هاریکاری پارێزەرەکەی کاروبارەکانمان بەرێکوپێکی بەرێوەبرد و هەرچی پێویست بوو کردمان و تاجەگوڵیشمان لەسەر گۆڕەکەی دانا. ئەرکەکەی دیکەم ئەمە بوو کە بچم و مادام ژانسی ببینم و مەسەلەکانی هەموو بۆ بگێڕمەوە. ئەو دیدەنی و چاوپێکەوتنەم لە هەموو شتێکی پێ ناخۆشتر بوو. نازانم هۆی چی بوو کە من تا رادەییەك ماویسیشم بە گوناهبار دەزانی.

پێش رۆیشتنێم جارێکی دیشم نووسینەکانی داڵتۆنی خوێندنەوە تا بە دڵنیاییەوە بزانم چ بە ماویسی بڵێم، و بۆ جاری دووەم هەستم کرد کە داڵتۆن ئەوەی دە دڵی دابوو بێ پەردە وراست و رەوان هەمووی بۆمن هەڵڕشتووە. من بەرێزەوە سەیری ئەو هەموو گەورەییەی ئەوم دەکرد.

من هەمیشە لایەنگری رۆجەر بووم، بەڵام ئێستا هەستم دەکرد کە ئەگەر زیندوو بایە، وەك برایەکم خۆشدەویست، و ئافەرینی جوامێریەکانیم دەکرد.

بۆ دەبێ پیاوێکی واتێك بشکێ و بکەوێ، بۆ دەبێ قارەمانێکی وا لە کۆتاییدا وا لاواز و کەلەلا بێ؟ لە پڕ یادداشتە بە قەڵەم نووسراوەکانیم لە گۆشەیەکیەوە چاو کردنەوە کە لەمەوپێش نەمدیتبوون و ئاگام لێ نەمابوون. دە یەکێکیاندا نووسیبووی:

"لە مردنێ بەولاوە هیچ رێیەکی دیم لە پێش نیە، بەم شێوەیە جێیەك دە دنیایەدا بۆ من و وی نیە، من ناتوانم لەوی دوور کەومەوە و تا زیندووم هەر دەبێ بیبینم و ئەو سەردان و دیدەنیانەش لەقە لە شکۆمەندی وی دەدەن و لە پلەو پایەی کەم دەکەنەوە، و من بۆ ئەوەش ئەو بەو جێیە بگەیەنم پارەیەکی کەلانم داوە و ئێستاش بۆ ئەوەی ئەو تووشی هیچ نەبێت و هەروا لەسەر پێی خۆی بوەستێ دەبێ وازی لێبێنم و بڕۆم. لە راستیشدا من دەچم لەبەر وی دەمرم."

دیسانەوە لە جێیەیەکی دیکەی نووسیبوو:

" ئەگەر دەمتوانی بیهێنم؟"

و لە چێیەکی دیش:

"من ئەگەر زیندووش بم نەك هەر پشت بەخۆبەستن، بەڵكە ژیانی ویش تاریك و لێڵ دەكەم و دەیشێوێنم. كەواتە مردن هەزار جار لەو كارەی چاكترە بۆ من."

و دیسان نووسیبووی:

"ویویان، كاتێك كە ئەو لە من دوور بێت، ژنێكی چاكە، فریشتەیە."

لەوەی بەولاوە چ ڕێیەكی دیم نەبوو كە بچم و ماویسی ببینم، ڕۆجەر وای حەز دەكرد ومنیش هێندەی كەوتبوومە ژێر كارگەریە وی و بارودۆخی حاڵ و باڵی ژیانەكەیەوە كە وام هەستدەكرد ئەوە بۆ خۆی لە ژوورێیە. وەك ئەوەی بە چاوی خۆی بیبینێ داخوا دوایین راسپاردەی حەز و ئارەزووەكانیم بە جێ گەیاندووە یانە نا. بەڵام پەڕەكاغەزەكانم هەموو خستنە چاوی مێزەكەوە و گاڵەم دا و دێرێكم لەسەر كارتی ناوەكەی خۆم نووسی و بەرەولای دیتنێ مادام ژانسیەوە كەوتمە ڕێ. دە ڕێیەمدا وەبیر هاتەوە كە ئەو كۆنسێرتە گەورەیەی ئەوشۆ لە بەرامبەر خانەدانی سەڵتەنەتی و بە ئامادەبیە وان دەگێڕدرێ، هەروا لە خۆوە دوودڵ بووم كە ئەگەر ئەو هەواڵەی دە و جۆرەكاتانەدا بۆ ببەم دەبێ چبكا و چۆن بێ، ئایا كاریگەرییەكی خراپی نابێ و گۆڕانێك دەبەرنامەكەیدا ناكا؟ بەڵام من هەر ناچار بووم بچم چونكە بەیانی ئەو شەوە ئەو ئینگلتەرەی بەجێ دەهێشت و داڵتۆنیش نووسیبووی "پێی بڵێ." كە گەیمە ئوتێلەكە هەواڵی سكرتێرەكەم پرسی، بردیانمە ژوورێكیەوە. دوای چەند چركەیەك سكرتێرەكە هاتە ژوورێ و گوتی:

"فەرمایشتێكتان هەبوو؟"

"دەمهەوێ مادام ژانسیە ببینم! هەواڵ و پەیامێكی تایبەتیم بۆ هێناوە."

تاوێك ڕاوەستا و گوتی:

"هەواڵێكی خۆشە؟ چونكە مادام ژانسی تا بڵێی پەشێوە و توورە و شێواوە.. وەك بڵێی چاوەڕێی هەواڵێك بكا و ئەگەر هەواڵەكەی ئێوەش.. دەزانی كە ئەوشۆ كۆنسێرتێكی گەورەمان دەگێڕدرێ. هەر دوو ئالیاحەزرەت لەوێن. لە ڕاستیدا شەوی پیرۆزی و سەركەوتنی ژانسیە و مادامیش بە پێچەوانەوە مانی گرتووە. ئەو دەزانێ



كە هەموو ئەو ڕێ و ڕەسمە بە قازانجی ئەوە بەڵام قسەی كەسی ناچێتە گوێ و بە قسەی كەس ناكا و دەڵێ هەرگیز ناچمە سەر شانۆ و گۆرانیش ناڵێم.

نەمدەزانی چ بڵێم. دوودڵ مام. دەمدیت كە سكرتێرەكەش ئەوەتا بەتەواوی پەشۆكاوی و شێواویەوە سەیری من دەكا. ژانسی دیارە هەر لەبەر نادیاریە داڵتۆنی نارەحەت بووە و نەشیدەزانی چۆتە كوێ. لەوانەیە وای بە خەیاڵدا هاتبێت كە دووبارە وازی لێ هێنابێتەوە. چونكە بۆ دیدەنیە وی ئەو هەر چۆتەوە لای مادام ئارینتز و سەرێكی هەر لێداوەتەوە. بەسكرتێرەكەم گوت:

"من بۆ خۆم مادامی ناناسم، بەڵام پەیامێكی مەیلەو گرینگم بۆ وی پێیە، هۆی ناراحەتیە مادامیش دەزانم و پێشموایە كە دوای بیستنی ئەم هەواڵە ئیدی مان لە گوتنی ناگرێ. من گفت و بەڵێنی ئەوەش دەدەم زۆر بەسیاسەت و وریاییەوە هەواڵەكەی بدەمێ."

"ئێوە ناناسێ."

"نەخێر، پێموانیە تەنانەت هەر ناویشی بیستبم. بەیارمەتی خۆتان ئەم كارتەی بدەنێ، پێموایە دەمبینێ و پێشوازیشم لێدەكا."

"من كارتەكەی دەدەمێ و چاوەڕێی هیممەتی تۆشم، مادام تابلێی جینگەنە و بێ گوێیە.

ئێمە هیچمان لە دەست نایە و چمان پێناكرێ. سنیۆر ریزیۆش هێندەی كەوتۆتە ژێر كاریگەرییە كە هەركاتێ مادام توورە دەبێ، سینۆر حەجمینی نامێنێ و هێندە نارەحەت دەبێ كە ئیدی لە توانای مەشدا نامێنێ هیچمان پێبكرێ و دەستەوستان و بێدەرەتان دەبین"

"هەر چۆنێكی بێ من پێموانیە كارەكەی لەوەی خراپتر كەم."

"ڕاستە.بەڵام ئەوەش بزانە كە لەوانەیە مادام هەر ئاوڕیش لە كارتەكەت نەداتەوە تەماشای كا."

"چاره نیه. ئەگەر وابوو ئێوه کارتەکەی بە دەنگێکی بڵند بۆ بخوێننەوە دڵنیام کاری خۆی دەکا."

سکرتێرەکە چاویلکەکەی خۆی لەسەر چاوی توند و بەند کردەوە و ئەو دێڕەی کە لە بن ناو و نیشانەکەی خۆمم نووسیبوو بە بەرزی خوێندیەوە:

"ئارتیستۆ، مادام ئارینتز، دەگەڵ هەواڵێکی گرینگ."

"زۆر چاکە، بزانین چۆن دەبێ."

دوای یەك دەقیقە بە هەڵە داوان هاتەوە و گوتی:

"فەرموون"منیش کەوتمە دوای، منی بردە ژوورێکی کە یەکسەر وام مەزەندە کرد کە دەبێ داڵتۆن دەو ژوورەیدا نانی ئێوارێی خواردبێ. لە دوو وێنەی گەورەی هونەرمەند بەولاوە ژوورەکە چ گوڵ و بابەتی جوانکارییەی دیکەی لێنەبوو. هەر بە چوونە ژوورەوەی من، دەرگایەکی دی کە دەکەوتە نێوان دووژووران کرایەوە و ژانسی بە خۆو رۆبێکی دۆشامبەری برنجۆکیەوە کە کارتەکەی منی دە دەستیدا گرمۆڵە کردبوو هاتە ژوورێ، بە رووخسارێکی واوە هات کە ئەوپەڕی پەرێشانی و شێواوی و نارەحەتی پێوە دیار بوو بەرامبەر من راوەستا و گوتی:

"ئاغا، مەبەستەکانتان زوو بڵێن."

"مادام، بە یارمەتی خۆتان ئاوام وەرمەگرن و واشم پێشوازی لێ مەکەن."

لەو رستە بوێرانەی منەوە شلی کردەوە و بەئاوازێکی گونجاوتر گوتی:

"ئێوە چەند رستەیەکتان لەسەر کارتەکە نووسیوە کەمنیان یەکجار نارەحەت کردووە، بە یارمەتی خۆتان بفەرموون بڵێن چ شتێك ئێوەی گەیاندۆتە ئێرە؟"

نەمدەزانی چۆناوچۆن بابەتەکە دەست پێ بکەم. سەرەتا کە بەو تووڕەییەوە دواندمی، دەمتوانی بەبێ هیچ گوێدانەکیە وی هەر چی هەیە پێی بڵێم. بەڵام ئێستا کە بەو هەموو رێزو ویقار وجوانیەیەوە بەرامبەر من راوەستابوو و پەشێوی و پەریشانی و ژاکاویی لەسەر و چاوان دەباری کارەکەی لە من تێکدا.



ئاخیریەکەی لەو بێدەنگییەی من وەتەنگ هات و گوتی:

"ئاغا، توخوا چبووە؟ ئێوە دەمکوژن."

"مادام، هەواڵێکی ناخۆشم بۆ هێناون."

هەواڵی ناخۆش؟ لە.."

"دێرەدا وەبیرم هاتەوە کە ئەو ناوی راستەقینەی رۆجەری نازانێ."

"بەڵێ مادام، لەو پیاوەوەی کە ئێوەیان زۆرخۆشدەویست."

"من نازانم ئەو لە کوێیە و چی بەسەر هاتووە، بە منیشی نەگوتبوو کە دەچێتەوە لای مادام ئارینتز.

من دوێنێ لەوێ بووم. مادام ئارینتز بە سەرسامیەوە گوتی کە رۆیوە. پێیوابوو ئێمە پێکەوە رۆشتووین. ئاغا ئەو خۆشەویسترین کەسی منە. دەتوانم سوێندی ئەوەش بخۆم کە ئەویش زۆری خۆشدەوێم. بەڵام نازانم چ نهێنییەك لە ئارادابوو کە نەیدەویست پێم بڵێ. ئەوە یەکەمین جار نیە. جارێکی دیشی ئاوا بە جێ هێشتووم و رۆیوە. من ئیدی بەرگە ناگرم.

"ئەو واز لە تۆ بێنێت؟ هەرگیز."

"بەڵێ سێ ساڵانی بە جێ هێشتم، بەڵام دوایە هاتەوە."

"مادام ئەو هەرگیز تۆی بە جێ نەهێشتووە و وازی لێ نەهێناوی، ئەو سێ ساڵەی کە تۆ دەڵێی دەزینداندا بوو."

لە پڕ قریشکاندی:

"زیندان؟ گوتت زیندان؟"

"بەڵێ مادام، زیندان، ئەویش لە پێناو ئێوەدا."

"تێناگەم مەبەستتان چیە؟"

"مادام، ئەو پارەی کە دەبوو بۆ مەشق و راهێنان و فێرکردنی دەنگی تۆ بیداتە ریزیۆی نەیبوو، رووی لە هەر لایەکی کرد بە نائومێدی و بەدەستی بە تاڵەوە هاتەوە.

ناچار بۆ ئەوەی تۆش بکاتە گۆرانیبێژێکی بەناوبانگ و دەرکەتوو هات دزی کرد و سێ ساڵیش چووە زیندانێ."

ڕەنگی وەك گەچێ سپی هەڵگەڕا. هەموو ڕەنگوڕواژای دەموچاوی سەرنجەکانی گۆڕان و بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی:

"ئەدی ئێستا، دووبارە گیراوەتەوە؟"

"نەء...ئەو مرد" وەك کەسێکی کە خۆی پێ ڕانەگیرێ ڕەتێکی برد، خۆم گەیاندێ و قۆڵم گرت و ڕامتەکاند و گوتم:

"ئەو منی ناردۆتە لای تۆ کە پێتان بڵێم ئەو هەرگیز بە ئارەزووی خۆی تۆی جێ نەهێشتووە، هەرگیز، هەرگیز، تەنانەت ئێستاش، بەمردنیش لە تۆ جودا نەبۆتەوە، ئەو منی ناردووە تا پێتان بڵێم ئێوەی بۆ هەتا هەتایە و تەنانەت دە دنیای ئەولاشدا هەر خۆشدەوێت."

چاوە ئاڵۆزەکانی دەمنەوە بڕیبوون. لێوەکانی جوولانەوە، بەزەحمەتم گوێ لێبوو کە دەیگوت:

"مرد، مرد، دەڵێی مرد."

"ئەو لە پێناو ئێوەدا مرد، گوێ بگرە و داستانەکەت بەڕاستی گوێ لێبێ.

ئەو داوای لە من کردووە پێتان بڵێم کە باوەڕی تەواوی بە ئێوە هەبووە و هەشیەتی، ئێوەش دەبێ داوایەکانی وی ڕەت نەکەنەوە و قبوڵیان کەن. ئێوە دەبێ بەرامبەر وی بە وەفاو بە ئەمەك بن. ئەو لە پێناو ئێوەدا چووە زیندانێ، و هەر لە پێناو ئێوەشدا مرد. ئێوە دەبێ ئەو لێبوردەییەو ئەو خۆبەختکردنەی وی بپارێزن."

هەموو لەشی وەلەرزە هات و قۆڵی لە دەستی من تەکاندەوە. لەسەر کورسییەکی دانیشت و گوتی:

"هەموو شتێکم پێ بڵێ."

من هەروا بە پێوە هەموو داستانەکەم بۆ گێڕایەوە و ئەوەندەشم گوت وەك چۆن چاوەڕوانی ئەوەیە کە پردە ئاوازێك لە نێوان ئێوەدا دروست ببێ هەرواش چاوەڕێیە کە



بەڵێن و سۆز و پەیمان و یەکبوونتان هەروا وەك خۆی دە نیوانێدا بە زیندوویی و بە نەمری بمێنێتەوە.

هەروا بێ جووڵە دانیشتبوو، هێندەی سەری خۆی بەر دابۆوە دەموچاویم نەدەدیت.

من بێ تێبینی و بێبەزەییانە هەموو شتێکم گوت. جارێکیشم ئەو سەرزەنشت کرد و گوتم ئەو پارەیەی کە دەیویست ژیانێکی تازەی پێ دروست بکاتەوە ئەویشی بە جل و بەرگ و گوڵی سووردا تا تۆی پێ شاد کا. ئەو تەنیا سەرمایەیەك کە نووسینەکانی بوو لە لای منی جێهێشتن بەو هیوایەی کە فرۆشران پارەی کۆمپانیای بیمەکەی پێ بداتەوە. چونکە ئەو بیرەوەرییە سووك و ڕیسواییانەی کە بە ملی داهاتبوون ئازاری دەدا و تای نەدەکرد. نەفسی ئەوەندە بەرز بوو کە تەنانەت دەگەڵ ئێوەشیدا نەدەتوانی وەك جاران بێ، چونکە دەترسا ئەو شوورەیی و نەنگیە داوێنی ئێوەش بگرێت و بە ئێوەشەوە بنووسێ.

سەری شۆڕتر کردەوە و لەسەر دەستەکانی دانا.

"دەزیندانێدا، و ئێستاش مردووە.."

لەمەبەستەکەی نەگەیشتم بە توندییەکەوە گوتم:

"قەیدی چیە، زۆر لە گەورە پیاو و مرۆڤە پیرۆزەکانیش چوونەتە زیندانێ و چەندین کەسانێکیش لە پێناو بیرو باوەڕەکانیاندا گیانیان بەخت کردووە و مردوون!"

ڕاستە... ئێستا ئێوە بە تەمان چبکەن، ئایا نائومێد و ناکامی دەکەن؟"

وەڵامی نەدایەوە. وەك بڵێی ڕوحی پێ نەمابوو و هەرچی هێز و وزەو توانا و تاقەتە لەبەری چووەبووە دەرێ.

" ئاهەنگی ئەوشۆ چۆن دەگێڕن؟ ئایا هەروەك چۆن کە ئەو دەخوازێ گۆرانی دەڵێن و بەڵێن و سۆزو پەیمانەکانی خۆتانی دەگەڵدا بە جێ دێنن یانە نا؟"

بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی:

" پێتوایە لەوەی ئەو دەیەوێ زیاتر هیچ شتێکی دیکە بکەم؟"

"نا ئەڵبەتە کە نا، ئەو ئێوەی خۆشدەویست و باوەڕی پێتان بوو. بەڕاستی ئێوەش شایانی ئەو عیشق و خۆشەویستیەن. بەڵام ئایا دەتوانن ئەوشۆ ئەو بەڵێن و پەیمانەی بەوتان دابوو بیهێننە دی؟ و.."

"مەیلێ و لەسەری مەڕۆ. ئەوە باسێکە لە نێوان من و ویدایە."

"زۆر چاکە."

لە جێی خۆی هەستا، بە مندالێکی رەنگ پەڕیوە دەچوو. زۆرم زگ پێی سووتا.

"ئایا ئێوە جارێکی دیش دێنەوە لام و ئەوەی هەیە و ماوە هەموویم پێ بڵێن؟"

"ئیدی هیچ نەماوە پێت بڵێم، ئێوە کەی دەڕۆن؟"

"سبەینێ بەیانی."

"باشتر."

بەوەی کە دوای بیست و چوار سەعاتی دی لە ئێنگلتەرەی دەچنە دەرێ لە دڵەوە خۆشحاڵ بووم.

کەمێك وەستا و خودا حافیزی و ماڵئاوایی لە من کرد و لە ژوورە کە چووە دەرێ.

ئەو چاوپێکەوتنەی کە زۆری لێ دەترسام تەواو بوو. هیوادار بووم ئەنجامێکی چاکی ببێ. کاتێ کە گەیمە دالانەکە سکرتێرەکە چاوەڕێی دەکردم و لەوێ دانیشتبوو. هەر کە چاوی پێم کەوت لە جێی خۆی راپەڕی و بە پەلە پرووزێوە پرسی:

"چۆن بوو؟"

"نارەحەت مەبن، مادام نائومێدتان ناکات."

"ئەمشەوە.. داخوا دەیانڵێ؟"

"بە دڵنیاییەوە و پێموایە لە جارانیش چاکتر."

لە پڕ شتێکم وەبەر چاوان هات و پرسیم:

"بیستوومە هەموو بلیتەکان فرۆشراون، دەتوانن جێیەکم بۆ پەیدا کەن؟"

"بـــۆ ئەمـــشەو؟ رەنگـــە.. راوەســـتە بـــابزانم."

هەر دوای چەند چرکەیەك هاتەوە وتیلمە کاغەزێکی دادەستم.



"لە جیاتی بلیت دەتوانی بەکاری بێنیت."

"هیوادارم جێی یەکێکی دیکە نەگرم."

"هەواڵنێرێکی رۆژنامەوانی بۆی هەیە، ئەم جۆرە کەسانە بە هەرشێوەیەك بێ جێی خۆیان دەکەنەوە."

## ٩٤

چوونی ئەو شەوەی من بۆکۆنسێرتەکە تەنیا لەبەر هێندێ بوو تا بزانم ماویس چ بۆ حەسرەت و حەز و ئارەزووەکانی دالتۆنی دەکا. لە دڵەوە بەوەی زۆر نارەحەت بووم کە بێ پەردە و بێ بەزەییانە قوربانییەکانی دالتۆنم بە چاوی دادابوۆوە، گێرانی ئەو کۆنسێرتەی ئەو شەوە دوای بیستنی هەواڵی مەرگی رۆجەری (ئەگەر ئەوی بەڕاستی خۆشدەویست کارێکی گران بوو.)

کاتێکی لە ناو هۆڵەکە دانیشتم گوێی خۆم بۆ هەر هەواڵێکی گەورە و بچووك و بۆ هەر قسێکی هەڵخست. لەو پەیامنێرە جحێڵۆکەی تەنیشت خۆمەوەم پرسی:

"مادام ژانسی ئەمشەو گۆرانی دەڵێ یانە نا؟"

کوڕەتیو کە هەر بە دوای وتارێکدا دەگەڕا دەستبەجێ پرسی:

"بۆ نەیڵێ؟ دیارە شتێکت بیستووە و هەواڵێکت پێیە؟"

"هەرگیز."

"ئەدی بۆ ئەو پرسیارەت کرد؟.."

"هەروا، تەنیا خەیاڵم بۆ ئەوە چوو ئەگەر هەرجارێکی ئەستێرەی سەرشانۆ دەرنەکەوێ خەڵکەکە هەموو نارەحەت دەبن."

دەو دەمەیدا خانەدانی سەڵتەنەتی هاتنە ژوورێ و بەسروودی میللی بەرنامەکە دەستی پێکرد. سەرەتا ریزێ پارچە مۆسیقایەکی لێدا. هێندەی بە چوست و چالاکی و تواناوە لێدا پێوەی دیار بوو کە چەندە بەکەیف و بە دەماغە.

خەڵکەکە بە بێ ئارامیەوە چاوەڕێی ژانسی بوون. دەو ماوەیەیدا و لە مانگێك کەمتریش ناو و ناوبانگ و خۆشەویستیەکەی گەییبە ئەوپەڕی. هەروەك شەوی یەکەم کۆنسێرتی هەوەڵێ ریزیۆ دەستی گرت و هێنایە سەر شانۆو ناساندی. ژانسی جلێکی برنجۆکی سپی و سادەی دەبەردابوو، و ئەوسادەییەشی ئەوی هێندەی دی زیاتر جوان کردبوو. بچووکترین چاوێکی بەڕووی ئامادەبوواندا هەڵنەهێنا. دەستەکانی لێك گرێ دابوون و چاوی دەعەردیەوە چەقاندبوون. بەشی یەکەمی بەدەنگێکی ساف و زەنگدارەوە، بەڵام سارد و سڕو بێ گیان پێشکەش کرد. کە لێبۆوە خەڵکەکە هەروا لە رووی ئەدەبەوە چەپڵەیەکیان لێدا، بەڵام فسکە فسك و چرپ وچۆپان هۆڵەکەی پڕ کرد، هەریەکەو شتێکی دەگوت خەڵکەکە چاوەڕێی ئەو دەنگ و ئاوازە بێ گیان و ساردو سڕە نەبوون.

پەیامنێرەکەی تەنیشتمەوە پرسی:

"ئەوە چبووە؟ بۆ وای دەڵێ؟ دیارە ئێوە شتێکی هەر دەزانن دەنا نەتدەپرسی داخوا گۆرانی دەڵێ یانە نا."

"جا من چووزانم."

"ئاخر من لە پێشەوە ئاواز و گوتنی ویم گوێ لێبووە. مرۆڤی هەڵدەتەکاند و دەیهەژاند. ئێوەش دەبێ گوێتان لێ بووبێ. تا بزانن دەڵێم چی."

"ئێستاش دەنگەکەی نایاب بوو."

"بەڵێ، بەڵام بێ گیان وساردو سڕ بوو. دیارە شتێك هەر هەیە. دەڵێن زۆر دڵ ناسك و تووڕە و لەسەرە. وەك بڵێی راست بکەن وایە.

"ئەو جارەش دەیلێتەوە؟"

"بەڵێ، دوو گۆرانی دیش، گۆرانییەکی عاشقانە و لایلایەیەك. ریزیۆ دەیهەوێ ئەوشۆ هونەر و توانای ژانسی دەرخا. بەڵام مادام غەمێکی هەیە، لەوانەیە شەڕیان بووبێ؟"

نیگەران ببووم و بیرم کردەوە خۆزگە والە ناکاو نەدەچوومە لای. راسپاردەکەی داڵتۆنم بە جێ نەهێنابایە چاکتر بوو. بەڵام هەر چۆنێك بێ. لەسەر قسەی



سکرتێرەکە، ئەو مانی لەگوتنێ گرتبوو. حەزم دەکرد پەیامی دەمێ و هانی بدەم و شتی وەبیر بێنمەوە. بەڵام ئیدی توانا و لێهاتوویی ئەوەم نەبوو سەرلەنوێ و جارێکی دیش دەست دەوکارەی وەردەمەوە. گوێم نەدایە بەشەکانی دیکەی بەرنامەکە. تا دووبارە ژانسی هاتەوە. ئەمجارەیان، بەتەنیا بەڕەنگێکی پەڕیوەوە، بەلەش و لارێکی باریکەڵەوە، لە لایەکی پەردە مەخمەریەکەوە، دەرکەوت. ئەو ئاوازەی کە دەبوو بیلێ هەمان ئەو ئاوازە بوو کە سالانی پێشوو بۆ داڵتۆن و دوایەش لە یەکەمین کۆنسێرتەکەی خۆیدا گوتبووی. لەبەر وەی ئەو پارچە هەرگیز لە بیر نەچووەش ریزیۆ هەڵیبژاردبوو، زۆرم زگ بە ماویسی سووتا.

لەو جێیەی کە دەبوو دەنگی دەگەڵ مۆسیقاکەدا رێکبێتەوە، نەهاتەوە، نەشاز بوو. وەك پەیکەرێکی بێ جووڵە، لە غەمان ملی لار ببۆوە. دەخەیالانەوە چووبوو. رابەری ئورکێسترەکە ئاوازەکەی دووبارە کردەوە، دیار بوو دەیهەویست سەرنجی گۆرانیبێژەکە راکێشێتەوە. خەڵکەکە بەفسکەفسك کەوتنەوە ودەستیان بە جووڵە جووڵێ کرد. من بە پێشدا چەمیمەوە، و بە نارەحەتیەوە چاوەڕێی دوایە بووم. دووبارە مۆسیقا گەیشتەوە جێیەکی کە دەبوو گۆیندە دەگەڵی تێهەلکا، بەڵام گۆیندە وەك لەبەردی داتاشرابێ، نارەحەتیەکەی من گەییە ئەو پەڕی.

لەپڕ دەنگی بەرز بۆوە، سەرتاپا ئاوازە کز و لاوازەکەی دە دەنگی مۆسیقاکەیدا ونبوو. وردە وردە سەری بڵند کرد، و چاوی بڕیە نوختەیەکی نادیار. کەم کەمە دەنگەکەی بەرز و بەهێزتر بوو، وەك بڵێی هێز و توانایە پێنەماوەکەی وردە وردە و لەسەرخۆ کۆدەکاتەوەو وتینێ وەبەر خۆ دێنێتەوە. ئەوەی دە دڵ و دەروونیدایە هەمووی تێکەڵ ئاوازەکە دەکات.

حەشری دەکرد، دڵ و گیانی خۆی خستبووە سەر باڵە ئەفسوناوییەکانی مۆسیقا و بەرەولای خۆشەویستە لە دەست چووە کەیەوە دەنارد و لە بەر پێی هەڵدەڕشت.

هات وهاوارێکی بێ وێنەی کەف و کوڵ و هەست و نەستی خەڵکەکە بەرپا بوو، پیرۆزییە ژانسی لێوان لێو و تا ڕادەی کامڵبوونێ هەڵکشا.

بۆ جاری سێهەمیش دەگەڵ ریزیۆیدا هاتەوە سەر شانۆ. هیچ گوێی نەدایە هەموو ئەو کەف وکوڵ و هەڵچوون وهەست و نەستانەی خەڵکەکە، نە زەردەخەنەیەك، نە سەرنجێك، نە ئاورێك، تەنیا هەر وەك هونەرمەندێك، ئەوەی بۆی دیاری کرابوو ئەنجامی دەداو هیچیدی.

نەوای لایلایەکەی بە دەنگێکی بە هێز و گونجاو، و لەهەمان کاتیشدا دڵنەوایانە پێشکەش کرد.

بێگومانم دەو دەمانەیدا هەست بە لەوێ بوونی داڵتۆنی دەکرد و هەر لەبەر ویشبوو کە تەواوی هێز و توانای خۆی بەکار دەهێنا، نەك لەبەر ئامادە بووان. لە کاتی گوتنی لایلایەکەیدا وەك کەسێکی کۆرپەی بە بەرو باوەشێوە بێ بیهەوێ بینوینێ، هەروا پاش و پێشی بوو. کۆرپەیەکی خەیاڵی. یەك فرزەندی خەیاڵی لە خۆشەویستە ونبووەکەی. بەگیانێکی شەکەت و ماندووەوە هاتمەوە ژوورەکەم، روخساری رۆجەرم بەردەوام لە بەر چاو بوو، بەرجەستە و زیندوو. بێ ئیختیار گوتم:" خوابکەم ماویس ئەوی لە بیر بچێتەوە."

بەیانی ماندوو و مردوو لە کەف و کوڵی رابردووی خۆم وەئاگا هاتم و یەکەمین بیرو خەیاڵێکم ئەوە بوو کە رۆجەر ئەو گێلیەتیەی بۆکرد و بۆ بەهەر شێوەیەك بوو ماویسی نەهێنا؟ دوایەش بڕیارم دا هەرچی ئەو بیر و خەیاڵە غەماوێزانە هەیە هەمووان وەلانێم. بەڵام بۆ دەکرا کە داڵتۆنی مردوو و ژانسی زیندوو بەو دەنگە ئەفسووناویەیەوە لەبیر بەریەوە؟

چایەکم بۆ خۆم تێکرد و رۆژنامەی "تایمز"م لێك کردەوە، و سەیرێکی ئێر و ئەوێیم کرد. لە پڕ چاوم بە وشەی داڵتۆن کەوت و هەر کە خوێندمەوە بێ ئیختیار هاوارێکم لە سینەیڕا هاتە دەرێ "وای رۆجەر، رۆجەری بێ دەرەتانم، بۆ ڕانەوەستای؟ تۆ خۆت دەتگوت جاری وایە بەختیاری ئەوە تا لە سەری کۆڵانێ چاوەڕێمانە، باشە بۆ رانەوەستای؟"
رۆژنامەکەم ئی رۆژی پێشترێ بوو. ئی ئەو رۆژەی کە داڵتۆنمان تێدا ناشتبوو.

"... مادام ئەیوا، بێوەژنێ رۆجەر داڵتۆنی، لە پڕ بە راوەستانی دڵ مرد."



شەوی هەینی بەرواری ۲۰۰۷/۹/۲۱
هەولێر ـ گەڕەکی موفتی
وەرگێڕانی ئەم رۆمانە تەواو بوو.